ئەلیزا مارکوس

# مێژووی پەکەکە

# PKK History



لەئینگلیزیەوە: ماجد خلیل

چاپی یەکەم
2014

# مێژووی پەکەکە

## خوێن و باوەڕ، پەکەکە و خەباتی کورد لەپێناو سەربەخۆیدا

نوسینی: ئەلیزا مارکوس

وەرگێڕانی: ماجید خەلیل

بەشی یەکەم

2014

# پێشەکی وەرگێڕ

ئەم پەرتوکە یەکێکە لە توێژینەوە ناوازەو دەگمەنەکان کە غەوارەکان دەربارەی مێژووی هاوچەرخی کورد نووسیویانە، ئەلیزا مارکیوسی خانمە کوردناسی بەنێوبانگی ئەمەریکی دارای ١٥ ساڵ ئەزموونی مەیدانیو رۆژنامەنوسییە لە بوارەکەیداو لەو پێناوەددا چەندینجار رووبەڕووی گێچەڵی دامودەزگاکانی تورکبووەتەوەو زیندانی کراوە.

ئەم خانمە جگە لەکوردستان لە ئیسرائیلو ئەڵمانو چەندین وڵاتی تری دنیا کاری رۆژنامەنوسی خۆی بۆ نێوەندە میدیاییەکانی دونیا دەستداوەتێ.

ئەلیزا لە پێشەکی ئەم پەرتوکەدا بە وردی باس لە بایەخی کارەکەیمان بۆ دەکات، چڕو پڕیی سەرچاوە دەگمەنەکانیو چاوپێکەوتنە هەمەلایەنەکانی ئەو هەستەمان لا دروستدەکات کە ئەوینێکی راستەقینە لە نیازو نییەتی نووسەردا هەبووە بۆ مێژووی کورد.

ئەم نیازەی مارکیوس گەلێ لایەنی بریندارو پەنهانی مێژووی رێکخستنە سیاسییەکانی باکووری کوردستانی بۆ ئێمەی کورد زیندو و سلامەت راگرتووە، هەر بۆیە بە حوکمی پسپۆڕییەکەم لەبوارەکەدا و مژوڵیم لە توێژینەوەی دکتۆراکەم لە هەمان بواردا، ئەو باوەڕەم لا گەلاڵە بوو کە دەتوانم مافی تەواو بدەمە ناوەرۆکو

مانای پەرتووکەکە کە وەك خۆی وەریگێڕمە سەر زمانی کوردیی سۆرانیو لە چوارچێوەی دووبەرگدا بەچاپی بگەیەنم.

لەراستیدا پەکەکە تەنها پارتێکی کوردیو یاخی لەدەوڵەتی تورکو ئەجێندای داگیرکاریی دەرەکیی نییە بۆ سەرکوردستان. تایبەتمەندی پەکەکە گەلێ ئالۆزی داوەتە زیهنو بیرکردنەوەی مرۆڤی کورد لە ئاشنا بوون بە سەرەداوەکانی سیاسەتی ئەم هێزە.

بۆ خۆم گەلێك جار ئەوینێکی سەیرو هەیەجانێکی کوردانە لەواقیعی کارەکانیان دەخوێنمە، هەندێك جاریش ئەستەمە توێژەر یان کۆڵەرێکی سیاسی بتوانێت واتای شۆڕشگێرشیەتی بلکێنێت بەم تەڤگەرەوە.

لەراستیدا ئالۆزیو سیحری رابوونی پەکەکە لەباکووری کوردستاندا ئەگەر بەشێکی بەسترابێت بە دەگمەنی رەگەزی رامیاریی ئەتاتورکو ئەجێندای تێکڕای نەیارەکانی پەکەکەوە، بەشێکی بەرینی بەستراوە بە تایبەتمەندی خودی ئۆجەلانو میتۆدی کاری پەکەکەوە. ئەم جیاکارییە لە ئەزموونی پەکەکەدا کە لە دەستپێکی حەفتاکانەوە لەنێوەندە زانکۆییەکانەوەو لەنێو شارە مەزنەکانی تورکیادا خەملّی، بەجۆرێك تاوی سەند کە بۆ هەوەڵجار لەچوارچێوەی پارتێکی سیاسی نهێنیدا لە ساڵی ١٩٧٨دا خۆی ئاشکرا کرد. بوونی پەکەکە لەبەرامبەر سڕینەوەی هەموو ئەوانی دیدا، رامیارییەك بوو لەگەڵ رامیاری تورکیا یەکی دەگرتەوە.

بوونی دەیان پارتو کۆمەڵەی راستو چەپی شۆڕشگێڕ کە لەلایەکەوە میراتگری چەپو بزافە شۆڕشگێرەکانی کاریگەر بە روسیاو چینو ئەلبانیاو خۆرئاوا بوون لەلایەکی تریشەوە کاریگەر بوون بە توراسی رابردووی شۆڕشە چەکدارییە کلاسیکییەکانی کورد. هەموو ئەوانە لەژێر تینو تاوی زەبری رژێمی دووای کۆدەتای ١٩٨٠و ئەدەبیاتی جەنگخوازانەی پەکەکەدا لەبەینبران. لێرەوە پەکەکەو دەوڵەت وەك دوو جەمسەری دژ لە گۆڕەپانەکەدا کەوتنە مەتەرێزو وێزەی یەکتریی.

هەر بۆیە ئەزموونی ٢٤ ساڵ کاری سیاسیو رێکخستنو ٢٨ ساڵ خەباتی چەکداری پەکەکە لە تورکیادا پێویستی بەوە هەیە بە پەرچڤەیەکی لۆژیکی لێیوردبینەوە.

ئەگەریش روانینەکان مەیدانی بنو بە روانگەی عەقڵێکی خۆرئاواییانەوە نووسرابن، ئەوە ئاتاجی خوێندنەوەو ئاگابوونەکە زیاتر دێتە گۆڕێ. رەنگە خوێنەر بتوانێت لە خوێندنەوەی شیکارەکانی ئەم خانمەداو لە وردبوونەوە لە چرپڕی دیدارو چاوپێکەوتنە سەرەکییەکانی مەودای نوسینەکە بەشێك لە رازی پەکەی بۆ ئاشکرابێتو تێبگات رابردووی تەڤگەرێك کە ئێستا کلیلی دۆزی نەتەوەیەکی بندەست لەدەستیدایە بەچ ئاقارێکدا دەبات. لە خوێندنەوەی رابردووی پەکەکە دیسانەوە لە تایبەتمەندی شوناسی سیاسی رووداوەکانی ئەورۆ تێدەگەینو ئەو پەنهانیەی سەرکردەیەك لە زینداناو رابەرایەتیکردنی گروپێك لە شاخدا زانستی سیاسی دەتوانێت گرێکوێرەکەی بکاتەوە. چونکە بوونی پەکەکە لە قەندیلو شۆڕبوونەوەی جۆرێك لە سیاسەت یان رەنگدانەوەی ئەم هێزە چەکدارە لەپانتایی سیاسی تورکیای ئێستادا لە چوارچێوەی پارتو رێکخراوی فەرمیدا جیا لەوەیش وابەستەیی جەماوەرێکی فرەی کورد لەنێوخۆو دەرەوەی تورکیا هاوکات هەموو ئەمانە کردنی ئۆجەلان بە مەرجەعی سیاسەتو جیهانبینی ئاشتیو جەنگیان، تەنها بەشۆڕبوونەوە بە مێژووی ئەم هێزەدا تێدەگەین تاچەند ئەم سیناریۆ و سیما میدیایەی ئەمڕۆ نێزیکە لە راستییەوە. ئایا کاروبارەکان هەروا سانانو ملدانێکی جەماوەری بەو جۆرە سانایيە نەزمی ئاپۆچییەتی لەدەماریدایە. ئایا بەندییەتی ئۆجەلان لەم قۆناغەدا زادەی چ سیاسەتێکەو چ گیرانو چ بەردانی لە زیان یان خزمەتی چ هێزو هەرەکەتێکدایە.

هیوادارین لەتانو پۆی ئەم پەرتووکەدا خۆنەری وردو وریای کورد بتوانێت کەمێك لە راستییەکانی رابردووی ئەم تەڤگەرە خوێناویو مانیایەی کوردی بۆ دەرکەوێتو لەوێوە لە رەهەندە ناوخۆییو هەرێمیو نێونەتەوەییەکانی لەمەڕ دۆزو

دۆخی کورد ئاشنا بێت‌و دەروازەیەکیش بێت بۆ ناسینی دیدگای کوردناسی، کە لە ئەزموونی کاری ئەم قەڵەمانەوە بەشێك لە زێڕی رابردوومان لە ژەنگ‌و ژەهری خۆرئاواو داگیرکاریی هەرێمی بۆ رۆشندەبێتەوە.

ماجید خەلیل. هەورامان

٢٠١٢/٠٥/٢٥

## تێبینی نوسەر بۆ خوێنەران

ئەم پەرتووکە بەرهەمی چاوپێکەوتنگەلێکی تێرو تەسەلە کە لەتەك ئەندامانی بەرایی گروپی کوردیی بەرهەڵستکار (پەکەکە) دا سازدراون، هەموو ئەو دیدارانە گرۆتینیان پێدام تا بتوانم دیرۆکی ئەو تەڤگەرەو رێو رێچکەی جەنگە گەریلاییەکەیی‌و هەستی رادیکاڵی تەڤگەری ناسیۆنالیستی کوردیی لەو قۆناغەدا زیندوو رابگرم.

لەهەمان کاتدا، لە نێزیکەوە قسەکردن دەگەڵ رێبەرانی پێشووی پەکەکەدا، راستیی دیوی ناوەوەی گروپەکەو کاروو کردەوەکانیانی لا رۆشنکردمەوە، هەروەها لە پاڵنەرەکانی فراوانبوونی بازنەی مرۆیی ئەو رەوشەیش تێگەیشتین کە بۆچی ئەو کورو کیژانە دێنە نێو تەڤگەرێکەوە لەکاتێکدا کە لە تەواوی وڵاتانی ئەورووپاو ئەمریکاو خودی تورکیەدا بە پێرێکی تێرۆریستو یاخی لەقەڵەمدراون. هاوکات، سەرەرای پەیبردن بە نهێنی‌و سەرنجراکێشییەکانی ئەم گرووپە، ئاماژەم بەوەش داوە بۆچی مەترسی‌و مەرگەساتو سەختییەکان‌و دواجار قۆڵبەستکرانی ئۆجەلانی رێبەری گروپەکە نەیانتوانییوە رێ لە گەنجی کورد بگرن، تا لەریزەکانی ئەو هێزەدا خەبات نەکەن.

لەتەك ئەمەشدا رەنگە کەسانێك پلاری ئەوە بگرن، بۆچی پشکی گەورەی زانیارییەکان لە سەرچاوەکانی پەکەکەوەیەو بۆچوونی رێبەرەکانی پێشوویەتی. ئەوان وادەبینن ئەو سەرچاوانە زانیاریگەلێکی گوماناویی‌و بێبنەمان، ئەوان پێیان وایە، کە کەسانێك لە گروپێکی نایاسایی‌و توندرەودا بووبن، کە پیشەیان کوشتن‌و تۆقین بووە ئیتر ناتوانن راستییەکان بدرکێنن.

بۆ وەڵامی ئەو رەخنانە، پێویستە ئەم تێبینییانە رەچاوبکەین:

یەکەم : بۆ تێگەیشتن لە پەکەکە یان هەر تەڤگەرێکی تر بەدڵنیاییەوە دەبێت لەگەڵ ئەوانەدا بدوێین کە بە شێك بوون لە گروپەکەو لە واقیعەکەدا ئامادەییان

هەبووە، هەروەها لەبەرئەوەی ئەندامانی ئێستەی پەکەکە زۆر بەکەمی بەئازادانە دەدوێن، هەربۆیە پەنامان بردە بەر ئەندامانێکی بالأی گروپەکە کە پێشتر لە بگرەو بەردەکاندا ئامادەییان هەبوو.

دووەم: کەڵك لە سەرچاوەی جیاوازو بەراوردکار وەرگیراوە، دەستمان را گەیشتووە بە بنکەکانی مەشق‌و نێو کۆبوونەوەکانی تەڤگەرو و فێرگە تایبەتییەکانیان. چاپ‌و وەشانە دەرەکی‌و تورکییەکانیش بەگوێرەی پێویست لە رووداو و تۆمارەکاندا بۆ زێدەتر بەهێزبوونی توێژینەوەکە کەڵکگیر بووە. هەر بۆیە زانیارییەکانی نێو ئەم پەرتووکە لە تەنها سەرچاوەیەکی زانیارییەوە نییە، بەڵکوو زانیارییەکان تێکهەڵکێش بوونە لەگەڵ زانیاری‌و سەرنجی چالاکوانانی کوردو رێبەرە دیارەکانی کوردو تەنانەت نەیارانی پەکەکەو چاودێرانی کوردی سەربەخۆو بێلایەن لە کوردستان، هەروەك چۆن لە سەرچاوە دەرەکییەکانی پێوەست بە پەکەکە کەڵکی فرە وەرگیراوە.

بەگشتی راوبۆچوون‌و دیداری فەرمیی لەتەك نێزیکەی سەد کەس پەیوەست بە توێژینەوەکە کراوە. زێدەتر لەوەیش پشتقاییم بووم بە خۆم‌و هەروەها هەموو ئەو رێپۆرتانەم خستووەتە روو کە لەمەڕ پەکەکەو دەرگیربوونی کوردیی لەنێوان سالأنی ١٩٨٦ بۆ ١٩٩٧ دەرکراون. بەمجۆرە هەروەك چۆن خوێنەر لە داهاتوودا بۆی نومایاندەبێت، بەوجۆرە زانیارییەکانم بە پشتبەستن بە سەرچاوەگەلێکی جۆراوجۆر داڕشتووەتەوە.

لەراستیدا تا ئێستا توێژینەوە یان بلأوکراوەگەلێکی زانستی قوڵ لە مەڕ پەکەکە نەکراوە، جیا لەوەیش چاوپێکەوتن‌و دیدارەکانیش لەتەك ئەندامانی پێشووی واندا نەکراوە.

وەڵێ بڕێکی گچکە کار بۆ خستنەڕووی واقیعی کوردیی لە تورکیا تاوەکو ئێستا هاتووەتە وەشاندن. بۆ نموونە لەوانە پەرتووکی (پرسیی کوردی تورکیا) ی هەردوو

پسپۆڕی ئەمەریکی هێنری جی بارکیو گراهام فولەر، (ئاپۆو پەکەکە) ی ڕۆژنامەنووسی تورك عەلی موحەممەد بیراند، پەرتوکی (کێوێك لە ئازار) ی سەلاحەدین سلیکی ئەندامی پێشووی پەکەکە، پەکەکە لە نوسینی ڕۆژنامەنووسی تورك عیسمەت ئیسمەت، (مێژووی نوێی کورد) ی پسپۆڕی بەریتانی داڤید ماکداوڵ، پەکەکە (پارتی کرێکارانی تورکیە)ی ئەکادیمیستی تورك نیهاد عەلی ئۆزکان.

دیارە پشتبەستنو وەرگرتنی زانیاری لەو نوسراوانە ئەوە ناگەیەنێت کە زانیارییەکانیان پشتراستی زانیاری منن، هەروەك چۆن نوسینەکەی منیش ڕازیبوون نییە بە هەموو ئەوانەی کە ئەوان نوسیویانە. وەڵێ پێویستە بگوترێت کە قەرزاری بۆچوونەکانیانمو قەرزاری هەموو ئەو پێنووسانەم کە لەو گۆڕەپانەدا ئەسپی خۆیان تاوداوە.

بە دڵنیاییەوە دوپاتیدەکەمەوە، بەبێ دەستگرۆیکردنی زانیارییەکانی ئەندامانی بەرایی پەکەکە نەدەتوانرا ئەم پەرتووکە بنوسرێت. زۆرجار دیدارەکان زیاد لە ١٢ کاتژمێر بەردەوام دەبوون، بەدرێژایی کاتە جیاوازەکانی ڕۆژێك وەدووی کۆبوونەوەکانەوە یان لەڕێگەی ئیمەیلو پێوەندییە تەلەفۆنییەکانەوە کاری توێژینەوەکە دەگوزەرا. دیارە چێکردنی پێوەندیی لەتەك ئەندامانی پێشووی پەکەکەدا هەروا کارێکی هەوانتە نەبوو، جیا لەوەش ئەوان هەمیشە ژمارە تەلەفۆنەکانیان دەگۆڕی یاخۆ داخرابوون. لێرەدا پێویستە سوپاسی سەلاحەدین سیلیکی ئەندامی پێشووی پەکەکە بکەم کە زۆرێك لە ژمارەکان لەڕێی ئەوەوە چنگم کەوتن. هاوکات ئامادەیی سەلاحەدین بۆ مشتومڕی تێرو تەسەل لەمەڕ ڕابردووی کارو چالاکییەکانو ئەزموونی تێکۆشانو سەرنجە بابەتییەکانیو تێڕامانی بە پرسی ئەو هێزە لەڕووی زانستییەوە فرە بەرز دەنرخێنرێن.

هەروەها موراد داگدێلین چالاککاری سیاسیی تەوای ئەرشیفو نوسینە تایبەتییەکانی خۆی خستە بەردەستم. جوسەین تۆپگیدەر هەڵسەنگاندنی زیاد لە

بیست ساڵ خەباتی پەکەکەی بە کەڵك وەرگرتن لە زانیاریی نێو بەشێك لە کۆبوونەوەکان لادرکاندم، سورگوڵ گولموز ئەو ئەندامەی وێب سایتی ناسنامەی بەرهەڵسکار بە پەکەکە بەرێوە دەبات، نێوبەناو پێشنیاری پێوەندیگەلی نوێ دەکات. سەلیم کوروکایا یەکێ لە بەرهەڵستکارە لە مێژینەکانی پەکەکەیش، توانی دیوی نێوەوەی ئەو هێزەو نیازو ژیانی ژێر بەرەی بخاتە بان بەرە.

ئیهان سیفتیسی، نیهال، زەکی ئۆزتورك‌و دەیان کادێرو هەڵسوڕاوی تری پەکەکە بەنیاز پاکی‌و سەر راستانە بۆ پرسیارەکانم هاتنە گۆ، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو بە خانوو خانەوادەو خوانە بەپێزەکانیان هەمیشە دەرگەیان لەسەرپشت بوو لەپێناو راپەراندنی کارەکانمدا. بەجۆرێك گەشتم دەکرد وەك ئەوەی لە کیشوەری ئەوروپادا گەشتەکەم لێنەوییبێت. خەدیجە یەشاریش لە گروپی ئاڵای رزگاری گوزەرێکی کورت‌و پوختی مێژووی کوردیی پێدام، هەروەها دامەرزێنەری پارتی سۆشیالیستی کوردستانی تورکیە کەمال بورکای لە پاریس زۆر میهرەبان‌و لەسەر وەخت بوو بۆ هەرکارێکم. کەندال نەزانی بەرێوەبەری ئینستیتیۆی کوردیی لە پاریس بۆ چەند ساڵێك میواندۆستێکی نیان‌و رایەڵیەکی بەپێز بوو . شەرەفەدین ئاڵچیش وەك سیاسییەکی کوردی سەربەخۆ هەردەم حازرو بازر بوو بۆ وەڵامی هەر پرس‌و جۆیەکمان .

دامەزراوەی ماك ئارسەر یش لەماوەی ١٨ مانگی توێژینەوەدا ، کاری نوسین‌و دەرامەتی نوسینی پێدام تاوەکو لەدەستپێکردنی پرۆژەکەمدا دڵکرمێ نەبم. هاوکات کۆمەك‌و دەستگرۆیی هاورێیان‌و هەندێ لە پێوەندییە پیشەییەکان‌و کەسانی تایبەتمەند ناکرێت بایەخیان لەپێشچاونەگرین. لەوانە ئامادەیی جۆن رون وەك باوەرپدارێکی نەلەخشاو، مشتومرکانمان یاریدەی منیدا تا وەخۆکەوم بۆ دارشتنەوەی پرۆژەکەم، هاوکات ناکرێت ئەزموونی گوڵستان گولبێی لە پێوەندییەکانی تورکیە لەگەڵ ولاتانی ئەوروپەو ئێراقدا پێنەزانین.

ئارام نیگۆگۆسیانیش هەمیشە شان بەشانی بابەتە نوێیەکانی لەمەڕ پەکەکە زانیاری پێدەدامو بە زۆرێك لە وەرگێڕدراوەکانیشمدا چاوی دەخشاندەوە. شانبەشانی ئەو رۆبەرت ئۆلسنی شارەزاو ئەکادیمیست لە سەر مێژووی کورد، بە کۆمێنتو سەرنجەکانی نوسینەکانی زەنگین دەکردم. عومەر ئێرزیرین دەگەڵ ئەودا هەوەڵ گەشتم بۆ باشووری تورکیە ساڵی ١٩٨٩ دەستدایە، بەتێبینییەکانی دڵنیایی زێدەتری پێدەخشیم. زەینەدین کیزیل یاپاك رۆژنامەنووسی تورکی سەربەخۆ ، یارمەتی دام بۆ دارشتنەوەی بیرو بۆچونەکانمو هەوڵی دا زانیارییە دەگمەنەکانم بۆ وەچنگخاتو لەدوتوێی توێژینەکەمدا دایانبرێژمەوە. راپۆرتەکانی هەردوو هاورێی بەئەمەکم فاروق بیلدیریكو نامیق دوروکان ساڵی ١٩٩٥ لە ئێراق بۆ توێژینەوەکەم ئێکجار بەکەڵك بوون. هەروەها توانیم سودی فراوان لە کتێبخانەکانی هەردوو پەیمانگەی کوردیی لە پاریسو بەرلین وەربگرم، کە بە چەندین پەرتوكو رۆژنامەی پێیوەست بە رەوشی کوردو پەکەکە تێدا بەدەستدەکەون.

دەکرێت بڵێم توێژینەوەکەم سەختو ناهەموار دەبوو ئەگەر لە ئەرشیفی کتێبخانەی ویلایەتی بەرلین، کەڵکم لە رۆژنامە تورکیەکان وەرنەگرتایە. بەدرێژایی ساڵانیش موحەمەد عەلی بیراند و یافوز ئێرین پەیوەندییان هەبوو بۆ ئاڵوگۆڕکردنی بیروراکانمان. یەڵماز فیلی هەرچەندە پاش وەدەرنانی لە زیندان، زۆر کەم ژیا، وەلێ توانیم سودێکی فرە لەوتوێژە کەمخایەنەکەمان وەربگرم، هەروەها خواڵخۆشبوو ئەمیل غالب کاریگەریی گرنگی لەسەر بۆچوونەکانم بەجێهێشت.

بە گشتی جێی خۆیەتی سوپاسی هەموو ئەم کەسو کەسایەتیانەی لای خوارەوە بکەم: ئەما کامەتۆی، میشیل کۆهن، بلیندا کوپر ، سوزی غولدنبرگ، ئەغنیس هیلر، ئەرتغل کورکیو، شتاین هانیس، تومومس لیان، شانا مارکوس، شاهیکا یوکسل، نیلی ترول، ئەدریە، لە راستیدا کەسانێکی تر هەن کە پێمخۆشە

ناویانبهێنم، وەلێ لەبارودۆخێکی وەهاو بابەتێکی وەهادا ئەستەمە بەناوهێنانیان رووبەڕووی گرفتنەبنەوە.

هەروەها جێگەی خۆیەتی دەستڕەنگینی ئیلین کارلیشی سەرنوسەر لە رۆژنامەی زانکۆی نیویۆرك بنرخێنین لە نوسینیی یەکەم مسۆدەی توێژینەوەکەم. هەریەك لەشارۆن موشافی جان لێستر وەك نوسەرو شارەزایەك توانیان هاناو هاندەرم بن بە کۆمێنتە کاریگەرەکانیان.

عەبدوڵڵا ئۆجەلان لە گوندێکی کشتوکاڵیی سەر بەپارێزگەی ئورفەی نێوچەی کوردستان لە دایك بوو[1]. بۆخۆی زۆرجار دەیوت بەتەواوی دڵنیانییە ڕۆژو ساڵی لەدایك بوونی چ کاتێکە. لە ڕاستیدا ئەو ڕۆژگارە خەڵکی ئاواییەکان یەك دوو ساڵێ دێرتر زارۆکانیان تۆماردەکردن. ئەوەش ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ گوێنەدانی خەڵکی نێوچەکە بەدامەزراوە فەرمییەکانی میریی یاخۆ ڕێی تێدەچێت خانەوادەی ئۆجەلان مەبەستیان بووبێت دێرتر نەوەکەیان ڕاپێچی سەربازگیریی زۆرەملێ بکرێت بۆ نێو یەکەکانی ئەرتەشی تورکیە.

پێکهاتەی دانیشتوانی نێوچەکەی ئۆجەلان لە کوردو ئەرمەن‌و تورك پێك هاتبوو، ئەو لەوێ پەروەردە بوو، دانیشتوانی ئەوێ بە ئاسانیی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیان یەکانگیرو تێکەڵبیبوو. زارۆکانیان بە یەکەوە نێردرابوونە بەر خوێندن، بەیەکەوە کارو گوزەرانی ڕۆژانەیان ڕادەپەڕاندو تەنانەت دییان‌و موسڵمانەکان ژن‌و ژنحوازییان دەگەڵ یەکتریدا دەکرد.

بۆ نموونە داپیرەی ئۆجەلان لە سەری دایکییەوە بەرەگەز تورك بوو. تەنانەت جارێکیش ئامارەی بەتورکبوونی دایکیشی دابوو[2]. وەلێ لەگەڵ هەموو ئەو ئامبازیبوونە کۆمەڵایەتییەدا، ئۆجەلان هەتاوەکو نەخرایە بەر خوێندنی سەرەتایی فێری تورکیی نە ببوو. ژیانکردن لەم نێوچەیەدا تاقەت پروکێنبوو، زۆرینەی خەڵك

---

[1] This section relies on two main sources: A wide-ranging interview Ocalan gave Turkish writer Yalcin Kucuk, published as *Kurt Bahcesinde Soy-*
313
*lesiler* in 1993 and cited in Vamik Volkan, *Bloodlines* (New York: Farrar Straus
and Giroux, 1997), 168–180; *Dogu'da,* Cilt I, 83–169, a history of the PKK's early years written by former PKK member Yuce; and Kucuk's *Dirilisin Oykusu,* apparently based on the interview in *Kurt Bahcesinde*

[2] Ocalan said this shortly after he was captured by Turkish special forces in 1999 in a video released by the government to the news media.

جیا له خاوەن زەوییەکان له نەدارییەکی سەختدا دەژییان. له گوندەکەی ئۆجەلاندا نێرو مێ له کێڵگەو دەوەنە سەخەتەکاندا پێکەوە مژوڵی کار بوون. له وەرزی دروێنەشدا هەموو ئەوەی بەدرێژایی هاوین سەرقاڵی ببوون داهاتێکی کەم بوو، ئەویش بە چنینەوەی پەموو له کێڵگەکانی خاوەن زەوییە زەنگینەکاندا پێیاندەبرا.

دیارە ئەوەش ژیانێکی دژواربوو، کە له بەرامبەر پوڵێکی کەمدا رەنجیان دەبرد، بەڵام هەرچۆنێك بێت تروسکاییەکانی باشبوونی رەوشەکە لەگۆڕێدا بوو. چونکە لەکاتەکانی دوواتردا هەوادارانی ئۆجەلان (ئاپۆچییەکان) له هەناوی ئەو توێژو چینە شەکەتو ماندووەوە بوونی خۆیان سەلماندو رووماڵی رەوشەکەیان لەنێو خەڵکدا کردە باس‌و خواست. ئەمەش رێك بەپێچەوانەی سەرداراو سەرکردە پێشینەکانی تری کوردەوە بوو کە هەمیشە پێوەندییەکانیان لەتەك چینی سەرمایەو سەرکارو ساحێب زەمینەکان بوو.

بەگوێرەی راپۆرتێکی رۆژنامەی لیمۆندی فەرەنسی، وادیاربوو ئەم چەتری هەژاری‌و دەردەسەرییە، بێچەندوو چوون زێدەتر له ۳۰ ساڵ بەر لەدایك بوونی ئۆجەلان نێوچەکەی کڵۆم دابوو. راپۆرتەکە وێنەی ژیان له گوندێکی کشتوکاڵیی کوردیی سەر بە پارێزگەی مێردینی سنووریی سوریە بەم رەنگە نومایاندەکات:" هەر خێزانێك بڕێکی کەم پەلەوەری مریشك‌و رەنگە پێنج تا شەش سەر پەزی هەبوو، ئاغەی ئاوایی یا دەرەبەگی خاوەن زەوی جاروبار سەری له دەسەڵاتداری سیاسیی نێوچەکە دەدا بۆ نوێکردنەوەی گوێڕایەڵی‌و ملکەچیکردن‌و وەرگرتنی فەرمایشتی نوێ. ئەم رەوشە له کێڵگەکانی پەموو بەشێوەیەکی گشتی له زەوییەکانی میزۆپۆتامییە پێکهاتبوو.

رۆژانە یازدە کاتژمێر کاری بێوچان جگە له گچکەو بەساڵاچووەکان، ئیتر هەمووان قۆڵ‌و چاکیان لێهەڵدەماڵی، بەگشتی کرێی رۆژانە بۆ زارۆیەك تەنها یەك دۆلار ئەمەریکی‌و بۆ ژنێك دۆلارو نیوێك بوو، هەروەها پیاوێك له رۆژێکدا تەنها دوو

دۆلار جیرەکەی بوو. تێکرای ڕێژەی مردن لەنێو زارۆی دێهاتییەکاندا خۆی دەدا لە٣٠٪."[3]

ئۆجەلان لەژینگەیەکی تارو توندوتیژدا گەورەبوو، ئەو لە نێو حەوت زارۆکەی خێزانەکەیدا تەمەنی زێدەتر بوو. ئۆجەلان کەرەتێك وتی: "کە هۆشم پەیدا کرد جا زانیم، لەنێو خانەوادەکەمدا هەمیشە ململانێیەك هەبووە"یان "نا شادومانییەکی لەرادەبەدەر ئامادەیی هەبووە".[4] یەکێك لە جیاکەرەوە ڕەوانییەکانی ئەو هەوڵدانی بوو بۆ ئەوەی تێبگات لە دووایین خەمو خەیاڵە نەتەوەییە خەباتگێڕییەکەی، کە لەیەك کاتدا یەکانگیرە لەتەك ئەو خواستو خۆشەویستیو خەسڵەتانەی لەباوکییەوە سەرچاوەی گرتبوو، لەگەڵ ئەو ڕقە شاراوەو پەنهانەی بەئاقاری ئەوان هەیەتی.[5] ئەو زۆرجار لە مشتورەکانیدا لە هەڵسەنگاندنی رەوشەکەدا بوو، لەدیدارو دیمانەکانیدا زۆرجار دەگەڕایەوە بۆ ئەزموونو ئەدگاری سەردەمی زارۆیی تا ئەوە روونبکاتەوە کەچۆن بایەخی تۆڵە سەندنەوەو توندوتیژیی بەکارهێنان زەمینەی بابەتێکی گەرماو گەرمیی واقیعەکەن.

لە راستیدا بابی ئۆجەلان تەنها کەساسو کەنەفتترین کەس نەبوو لە ئاواییەکەیاندا، بەڵکو زەبوونو زەلیلکراوی زەحمەتی ژیانو دەوروبەرەکەیشی بوو. لەم بارەیەوە ئۆجەلان لە چاوپێکەوتنێکدا کە لە نەوەدەکاندا دەگەڵی سازکرابوو وتبووی: " تەنانەت هیچ کات دۆستو دراوسێکانیشی ئەویان بە هەند وەرنەدەگرت، بەهۆی ئەوانیشەوە هەمیشە لە ئازارو ئاخدا دەژیا" یاخۆ" بابم وەك ئەوە وەهایە هەر نەژیابێت، یا ئەو بۆ خۆی نەدەڕۆی، بەڵکو دەبرا بەڕێوە".[6]

---

[3] Paraphrased in McDowall, *Modern History*, 419.
[4] Birand, *Apo ve PKK*, 31.
[5] Volkan, *Bloodlines*, 168–180.
[6] Cited in ibid., 171.

دایکی ئاپۆ وەك هەر دایکێکی تر میهرەبانو نیان نەبوو، ئەو ژنێکی توندو تووڕەبوو، بەتایبەتیو لەهەمبەر هاوسەرەکەیدا زەجرو زەبوونی دەدایەدوواوەو لەگەڵ ئەوەدا نەبوو ملکەچی خێزانەکەی بێت. بەم نەزمە دایكو بابی ئۆجەلان هەوەڵ کۆرپەکەیان چەماندەوە بەرەو رێو رێبازێکی توندوو دەستدرێژکار.

بۆ نموونە کەرەتێکیان، چەند زارۆیەکی گەجەرو گوجەر لە کۆڵانێدا ئۆجەلانیان کوتی بوو، ئەویش وەك زارۆیەك بە دەم هەنسكو گریانەوە هەڵهاتو و پەنای بۆ دایکی بردو و عەرزی حاڵی خۆی پێگوت، وەلێ دایکی پێچەوانەی دایکانی تر لە زارۆکەی لێدەگەڕێو وەدەریدەنێت، ئاگاداریشی دەکاتەوە تا بە تەواوی تۆڵەی خۆی نەکاتەوە، نابێت توخنی ماڵەوە بکەوێت.

هەربۆیە هەمیشە ئۆجەلان ئەوەی دووپاتدەکردەوە کە رەفتاری دایکی هۆکارێك بووە کە لەتمەی داوە لە سروشتە شەرمنییەکەی ئەو وەك ئۆجەلان. دواجار بەخێرایی ناو و نێوبانگی وەك زارۆیەکی هاروهاجو گوندە زڕا.

بۆ نموونە ئاپۆ لە شوێنێکدا دەڵێ:" هەرچەند کە بۆ هەوەڵجار ناچار دەکرام کە تۆڵە لەوانە بکەمەوە، کە سەرو سەکوتیان دەشکاندم، وەلێ وام لێهات کە ببمە کەسێکی گوندەو ئیدی هەرلەخۆوەو بە هەقو ناهەق چەندینجار سەرو گوێلاکی زارۆگەلێکم دەشکاند"[7].

هەروەها یەکێك لە نائومێدیو کەسەرە بنچینەییەکانی ژیانی ئۆجەلان وەك زارۆیەك بریتی بوو لە مێردکردنی یەکێك لە خۆیشکەکانی بە یەکێك لە پیاوەکانی ئاواییەکی هامسایان. ئەوەی پێی بوترێت خۆشەویستی لەم جۆرە هاوسەرگیرییانەدا ئامادەیی نەبوو، هەرچی زاوایە فرە بەکەمی قسەیەکی لە گۆڤەندەکەیدا هەبوو، هاقای خۆیشکی ئۆجەلانیش هیچ حسابێکی بۆ نەکرا، ئەو لەو پێوەندییەدا فرۆشرا بە چەند کیسەیەك گەنمو دانەوێڵەو برێك پولو پارە لەبری

[7] Ibid., 172.

مارەیی. دوواتر لەسەر ئەو بنەمایە ئۆجەلان راڤەی ئەو راستییەی کرد کە ئەو جۆرە ژەنو ژەنخوازییە تەنها جۆرێکە لە جۆرەکانی مردن بۆ ژن.

لەمبارەیەوە بیریاری پێشووی پەکەکە مەممەد خان یوسو وەك بەڵگەیەك هاوسەرگیرییەکەی هاڤا بە نموونە دەهێنێتەوە، ئەو پێی وایە ئەو رووداوە کاریگەریی لەسەر تیۆری ئازادیخوازیی ژن لە ئەدەبیاتی ئۆجەلاندا هەبوو دژی نەریتە کلاسیکییەکەی پێوەندییەکانی نێرو و مێو رۆڵی زگماکیی زۆردارانەی دەرهەق بە ژن لە جڤاکی کوردییدا . بۆیە ئۆجەلان کاتێك دەگەرێتەوە بۆ ئەو قۆناغەو ئاماژە بە هاوسەرگیریی خوشکەکەی دەکاتو دەڵێ:" هەمیشە کە بیرم دەکەوێتەوە هەستی داخو پەژارە رووملێدەنێت"[٨]. هەر لەوکاتەوە ئۆجەلان بیری لەو رەوشە دەکردەوەو هەمیشە دەیوت:" ئەگەر بوومە خەباتکار، بوار نادەم کارەساتی لەو جۆرە رووبداتەوە". هەروەها وەك زۆرێك لە ئاواییەکان، ئاواییەکەی ئۆجەلانیش قوتابخانەی سەرەتایی لێنەبوو. کوردەکان پێیان وابوو ئەمە هەوڵێك بوو بۆ زێدەتر هێشتنەوەی کورد لە پەرێزو پەراوێزی ژیاندا.

لەراستیدا پەروەردەو فێرکردن لە بەرژەوەندیی ئەنکەرەدا بوو، تا هەرچی زووترە زمانی تورکییو ناسیۆنالیزمی تورکیی نێوچەکە بگرێتەوە، کەواتە ئەم راستییەش تورکیای دوچاری هیچ گوڵمەزێك نەدەکردەوە. لەگەڵ ئەوەشدا چەندین دێو لادێ هەبوون، کە ئەدەوڵەتو ئەبۆخۆشیان دەیانتوانی قوتابخانە بۆ نەوەکانیان دروستبکەن. هەربۆیە ئۆجەلانیش وەك زۆرێك لە منداڵی دێهاتییەکان لە پێویستبوو رۆژانە یەك کاتژمێر رێگە بە پێیان ببرێ بۆ ئەوەی لەئاواییەکەی نێزیکیاندا درێژە بەخوێندنەکەی بدات. ئۆجەلان خوێندکارێکی زۆر باش بوو، ئەو

[8] Ibid., 173–174.

تەواوی وانەکانی زمانی تورکیو ناسیۆنالیزمی تورکیی بە تاسەوە وەردەگرتو چەلەنگو بەهۆشبوو.

لەسەرەتاوە خەونی ئەوە بوو ببێتە ئەفسەرێکی پرۆفیشناڵ لە ئەرتەشی تورکیادا، دیارە بیرکردنەوەیەکی لەو جۆرە بۆ نەوجەوانێکی کورد، کە لەو قۆناغەدا خرابێتە بەر خوێندن شتێکی نامۆو ناباو بوو، بەتایبەتی لە کیشوەرێکدا کە موستەفا کەمال ئەتاتورکی دامەرزێنەر قارەمانو سەرداری بوو. بەڵام ئۆجەلان نەیتوانی لە تاقیکردنەوەی خوێندنی باڵای سەربازییدا سەربکەوێت، ناچار نێوی خۆی لە قوتابخانەی باڵای پیشەیی تۆمارکرد لە ئەنکەرە تا وەك قوتابییە راهێنراوەکان کاربکات لە فەرمانگەی تۆمارکردنی کیشوەر دا.

لەراستیدا گەیشتنی هەوەڵجاری ئۆجەلان بۆ ئەنکەرە لە ١٩٦٦دا رێك هاوکات بوو لەتەك گەشو نمای ئارامی رووبەروبوونەوەی شوناسی کوردیی لە نێو شارە گەورەکانی تورکیا دا. بۆنموونە هەرزەکارو نەوجەوانەکان هەر بۆ پۆزو بە مەبەستەوە جگەرەی بەتلیس (شارێکی کورد نشین)ە یان دەکێشا، ئەم ناوە دەگەڕایەوە بۆ ئەو شوێنەی کە توتنی تێدا بەرهەمدەهێنرا لە باشووری رۆژهەڵاتدا[9]. هاوکات لەو هەرێمە کوردییانەدا خوێنکارە بێزارەکانو پاڵەو کرێکارەکان مژووڵی میتینگو کۆبوونەوەی هەمەلایەنو جەماوەری بوون لە پێناو داواکردنی مافە دێموکراتەکانیانو دانەدوواوەی چیدی بندەستکردنو قڕکردنی شوناسی نەتەوەییان.

رەچاونەکردنو تێپەڕین بەسەر ئەو رەوشە نوێیەدا بۆ ئۆجەلان سەخت بوو. ئۆجەلان لە راڤەیەکی دوواتریدا دەڵێت:" ئەو کۆبوونەوانە لە هەرێمەکوردییەکاندا کاریگەرییان کردە سەر من، تەنانەت ئەگەرچی تەنها رێچکەیەکی بچوکیشبووبن بۆ قوتاربوون"[10]. لەراستیدا ئەم شۆڕو شەیپوری نەتەوایەتییە لەنێو لاوانی کچو کوڕی

[9] Birand, *Apo ve PKK,* 80.
[10] . Ibid., 80.

نێو ئامادەیی‌و زانکۆکانیشدا شتێکی ئەستەم نەبوو، هەموو ئەوانە خەون‌و خولیای گەڕان بەدووای شوناسی نەتەواییدا هەڵیپێچابوون، لەوانە تێیاندا بوو کەوتبووە ژێرکاریگەریی یەکێك لە مامۆستاکانیان یاخۆ رێبەرێکی کارای گەنجەوە، کە بەشێوەیەکی نهێنی‌و پەنهان مژوولی بیری نەتەوایەتیی کوردیبوون.

هەندێك لەو لاوانەش رامابوون لە سەیری ناکۆکییەکانی نێوان ژیانی تایبەتییان، کە ئەویش ناکۆکی نێوان ئەوانەی هۆشیارکرابوونەوە بەهۆی نەزمیی کلاسیکی ئاواییەکانی کوردو وتەو ئاکاری رۆژانەیان یاخۆ کاریگەربوون بە ئەدەبیات‌و زانیاریی کوردیی پەخشی رادیۆکانی ئەودیو سنوور(مەبەست پێی رادیۆی کوردیی یەریڤان)ە لەگەڵ ئەو بیروباوەڕە گشتییەی دەوڵەت کە پێی وابوو ریشەو ڕێچکەی کوردەکان هەر لەنەتەوەی تورکەوە سەرچاوەی گرتووە.

ئۆجەلان نموونەی ئەو پێڕە بوو کە لە ناکۆکییەکانیان دەڕوانی، ئەوان لە هەردوو تەڤگەری چەپ‌و رادیکاڵی کوردیی کە لەکۆتایی شەستەکانەوە گەشەی سەندبوو بەتەواوی داماڵرابوون. ئۆجەلان پاش ئەوەی بەسەرکەوتوویی خوێندنەکەی لە قوتابخانەی پیشەیی لە ١٩٦٩ دا کۆتاپێهێنا، ئیتر راستەوخۆ لە شاری دیاربەکر لە نوسینگەیەکی حکومیی دامەزراو بوو بە بەرپرسی تۆماری زەوی‌و سەنەدی موڵکەکان، بەلآم پاش تێپەڕبوونی ساڵێك، راژەکەی گواستەوە بۆ نوسینگەیەك لە ئەستەمبوڵ. پانۆراماکانی کۆتایی شەستەکان بۆ تورکیا ململانێیەکی سیاسیی سەخت‌و دژوار بوو، لەو نێوەندەدا ئۆجەلانیش وەك چەندەها کوڕو کچی ئەو وڵاتە لە ئاریشەیەکی سیاسی‌و رامانێکی مۆڵەقدا بوو، کە نەیاندەزانی بەرەوکوێ ملدەنێن. لەراستیدا تا ئەوکاتە ناسیۆنالیزمێکی دروستی کوردی لە گۆڕێدا نەبوو.

ئۆجەلان لە سەرەتای ئەوەدا بوو کە ئاشنابێت بەوەی، بەڵێ لە تورکیادا کێشەیەك هەیە بەنێوی کێشەی کوردو شتانێکیش هەن کە پێویستن بۆ ئەوەی ئەنجامبدرێن. ئەو پاش ئەوەی ناملکەی ئەلف‌و بێی سۆشیالیزمی بەرچاوکەوت‌و خوێندیەوە، ئیتر

کاریگەریی لە سەرداناو بۆ یەکەمجار بڕیاریدا ببێتە کۆمۆنیست[11]. وەلێ ئۆجەلان دڵگرمێ بوو لەوە کە بتوانێت پێوەستییەك لەنێوان بیرۆکە سۆشیالیستییەکەیی و بزووتنەوەی نەتەوایەتیی کوردیدا چێبکات.

هەرچۆنێك بێت لە ئەستەمبووڵ تێکەڵ بە چالاکی خوێندکارە توندڕەوەکان بوو، ئەوان ڕێبەرایەتی جوڵانەوەکانی ئەو قۆناغەیان دەکرد، ئەو خوێندکارانە بڕوایان وابوو کە تورکیا پێویستە لە بندەستی ئەمەریکاو بەندایەتی وڵاتانی کاپیتالیست و سەرمایەدار بێتە دەرێ و خۆی لە هەیمەنەی وان ڕزگاربکات.

ئەوکات بۆ لاوێکی کورد ئەستەم بوو بتوانێت لە دەرەوەی شۆڕو شەوقی وانکۆکبێت و تێکەڵ بەو هەیەجانە نەبێت، بە تایبەتی بۆ ئۆجەلان کە تەنانەت خوێنکاریش نەبوو، بەڵکو وەك کارمەندێکی پلە نزمی دەوڵەت، لە قوژبنێکی ئەو شارەدا دەست و پەنجەی لەتەك بەڵگەو سەنەدی موڵك و زەویدا نەرمدەکرد[12].

## مێژوو

ئۆجەلان پێش ئەوەی لەسەر پرسی نەتەوەیی کورد هەڵوێستەبکات و لە ڕێو ڕێچکە سیاسییەکاندا ئەم پرسە لەتەرازوو بدات، نێزیکەی بیست ساڵێك تەمەنی بوو. دیارە ئەمەیش بۆ نەوەی ئەو قۆناغەی تورکیا کارێکی نامۆو نەگبەتی هێنبوو، چونکە لە تورکیادا بەماوەیەکی ئێجگار کەم پاش دامەزراندنی دەوڵەتی کۆماریی ١٩٢٣ کوردە نەتەوەگەراکان ڕوویان لە چیاو چەك نا دژی دەسەڵاتداریێتیی وڵاتەکەیان.

---

[11] The book's title in Turkish is always given as *Sosyalizmin Alfabesi.* It refers to U.S. socialist Leo Huberman and Sybil H. May's 1953 pamphlet, "The
ABC of Socialism," published by Monthly Review Press.

[12] The main sources for this section are McDowall, *Modern History,* 397–410; Zurcher, *Turkey,* 231–274; and Ahmad, *Modern Turkey,* 121–157.

وەلێ هەر لەوکاتەوە تەواوی راپەرینەکان سەرکوتکران‌و تەواوی یاساو رێساکانیش کە دەردەکران بۆ سرینەوەو سڕکردنی شوناس‌و شکۆی نەتەوەیی کوردیی دەردەکران. لەم پێناوەدا نێوی کوردیی بازێرو ئاواییەکانی کوردستان گۆڕدرا بۆ نێوی تورکیی‌و نێوی کوردستانیش کە تا ئەوکات تەنها ئاماژەبوو بۆ نێوچەیەکی جوگرافیی، فەرماندرا لەتەواوی پەرتوك‌و نوسراوەکان‌و زمانی خودی کورداندا سڕایەوەو قەدەغەکرا.

بەم جۆرە کوشت‌وبڕی تورکیی بەشێوەیەکی هەمە لایەنە شوناس‌و شیرازەی کوردانی پچڕاندو خاپورکرد. ترس‌و تۆقاندن‌و تەمبێکردن لە ئاستێکی ئێجگار بالآدا بەڕێوە چوو. یەکێك لە دیپلۆماتکارە ئینگلیزەکان کاتێك لە ١٩٥٦دا بەنێوچە کوردییەکاندا تێدەپەرێت وتبووی:" بواری هەناسەیەکم بۆ ناسیۆنالیزمی کوردیی نەبینی، لەکاتێکدا چاودێرێکی ئاسایی لە ئێراقدا بە ئاسانی تێبینی بواری نەتەوایەتیی دەکرد"[١٣]. بەلآم تورکیا هەرگیز لە گۆرانکارییە نەتەوەییەکانی کورد لە ولآتانی هەرێمی نەیدەتوانی خۆی بەدوور بگرێت، هەروەها نەدەبوو بێئاگابێت لەو هاندانە نێوخۆییەی کە لە ئاکامی دەستەبەرکردنی مافە دێموکراتییەکان لە دەوروبەردا هاتووەتە ئاراوە. هەر ئەو هۆکارانەیش یاریدەی کوردیان دا تا دەرفەتیان بۆ هەڵبکەوێت بۆ بەخۆداچونەوەو دەستەبەرکردنی خواستەکانیان‌و دۆزینەوەی رێگەیەك بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان.

هەر هۆکاری ئەو رەشە بوو ئەرتەشی تورکیا هەستا بە ئەنجامدانی کۆدەتایەکی سەربازیی لە ١٩٦٠دا، لەلایەکی ترەوە بۆ ئەوەبوو کۆتایی بە زێدەتربوونی دەسەلآتی ئۆتۆکراتییەتی عەدنان مەندەریسی سەرۆك کۆمار لە تورکیادا بهێنێت. دیمانەی کۆدەتاچییەکان پێشبینینەکراو بوو، ئەوان بوارێکی بەرینیان لەبەردەم توێژی رۆشنفکرو خوێندەواردا کردەوەو پشتیوانیان بوون. هاوکات ئاسۆیەکی

[13] McDowall, *Modern History,* 402.

نوێیان لەبەردەم خواستە ئازادیخوازییەکانی خەڵکدا کردەوە کە پێشتر بۆ خەڵکی تورکیا نامۆو نەدیدە بوو. هەر لەو سەرو بەندەدا گروپێکی پرۆفیشناڵو ئەکادیمی بانگهێشتکران تا دەستورێکی نوێ بۆ وڵات سەرلەنوێ دابرێژنەوە. بەگوێرەی ئەو دەستورە ئازادیگەلێکی پێویست بۆ دروستکردنی رێکخراو و سەندیکای پیشەییو چاپەمەنی فەراهەمکرابوو. دیارە کە هەموو ئەمانە لە دامەزراندنی کۆمارەوە تا ئەوکات ئازادییان لێزەوتکرابوو[١٤].

پەرەسەندنی دیموکراسی لەتورکیا هاوکات بوو لەگەڵ پەرەسەندنی زێدەتریی خوێندەواریی‌و ئاگاییو بەنێونەتەوەیی بوونی دۆزی کورد. ئەوێ دەم هەوەڵ تۆرەمەی دووای یاخیبوونەکانی کورد پێگەیشتبوون. ئەوان بەترسو توندیی و تاڵییەکانی ئەرتەشی تورك گۆشنەکرابوونو یادەوەری کوشتوبرو جینۆسایدییان لەتەك خۆیاندا نەهێنابوو، ئەو یادەوەریانەی کە دایكو بابیانی بۆ ماوەی چەند دەیەیەك توشی گرشو گێچەڵ کردبوو. زۆرێك لە لاوانی کورد لەزانکۆکاندا بوون، لەوێ هەم ئاشنادەبوون بە لاوانی کوردی دیکە، هەم ئامبازی بیرۆکەو بیری نێو دەبوون.

پاڵەو جوتیاری کوردیش بۆ قوتاربوونی لەو تەنگژە ئابوورییەی گیرۆدەیببوو، ملی لە شارێ دەنا، ئیتر لەوێ ئەگەری فرە هەبوو بۆ دێهاتییەکان تا ئاشنابن بەو پرتەو بۆڵانەی کە ئاماژەبوون بە دنیای نابەرابەری کایەی ئابووریی نێوان تورکو کوردو هەروەها گوێشیانهەڵدەخست بۆ مقۆمقۆی ورووژاندنی پرسی کوردیی کە لە ناوەوەی وڵاتو دەرێی وڵات بەتایبەت لە ئێراقدا لەگۆڕێدا بوو.

لەلایەکیترەوە پارتێکی مۆڵەتپێدراوی کۆمۆنیستی ، بەنێوی پارتی کاری تورکی (تیپ) کە ساڵی ١٩٦١ دامەزرابوو ، بەهۆی پەیامی یەکسانیو دادوەری

[14] See Ahmad, *Modern Turkey,* 121–137 for description of 1960 coup and aftermath.

کۆمەڵایەتیی‌و ئابوورییەکەیەوە توانیبووی سەرنجی زۆربەی کورد بۆخۆی رابکێشێت‌و لەنێو کورداندا هەوادارێکی فرە بخاتەوە. وەلێ لە راستیدا کێشەی کورد هەر بە هەستیاریی مابوویەوەو پارتی کاری تورکیش بۆ نێزیکەی دەیەیەك چارەیەکی بۆ کێشەکە لە هەگبەدا پێنەبوو. هەندێك لە چالاکوانانی کورد هەوڵیاندا راستەوخۆ ژینگەی ئازادیی ئەزموونبکەن، وەلێ ئەوانە هەرزوو دەمبەستکران، چونکە دەوڵەت بە هەڵەداوان کەوتەخۆو تەواوی گۆڤارە کلتوورییەکان‌و رۆژنامە کوردییەکانی داخستن‌و قەدەغەی کردن‌و نوسەرو سەرنووسەرەکانیشیان تۆمەتی کۆمۆنیستی‌و جوداخوازی درایە پاڵیان[15].

ئەو رەوشەش ئەوەی دوپاتکردەوە هەوڵی لیبرالیزەکردنی تورکیا هێشتا لەو ئاست‌و ئاقارەدا نییە. بەڵام زۆری نەخایاند وەك ئەوەی هەمیشە تورکیا لێی دەترسا، تێکۆشانی کوردی تێراق لە سنوورەکانی تورکیاوە پەرییە ئەم بەرو بۆن‌و بەرامەی دایە کەللەی ئازادیخوازانی ئەمبەر. هەر پاش ئەوەی پاشایەتیی لە ئێراقدا تەخت‌و تاراجی لە ١٩٥٨ دا نەما، ئیتر حکومەتی نوێ بڕیاری گەڕانەوەی سەرکردەی نەتەوەیی کورد مەلا موستەفا بارزانی دا ، کە ئەو کات دوور خرابوویەوە بۆ یەکێتی سۆڤییەت.

بارزانی سەرکردەیەکی بەنێوبانگی نەبەردو ناسیۆنالیستێکی دانسقەی کورد بوو. ئەو لە سەرەتای چلەکاندا رێبەرایەتی شۆڕشێکی کردو یارمەتی کۆماریی کوردیی مەهابادی دا و بەرگریی لە کۆمارەکە کرد . وەلێ لە بەد شەنسی کورد دا کۆماری دێموکراتی مهاباد ساڵێکی نەخایاند، چونکە یەکێتی سۆڤییەت دەستی لە پشتیوانیکردنیدا بەردا. بارزانی بەبۆنەی رووداوەکانی کۆمارەوە وەك دیارترین رێبەری قارەمانی کورد نێو و شۆرەتی دەرکرد. هەربۆیە بە گەڕانەوەی بۆ ئێراق، وزەو ورەی نەتەوایەتی بەخشییە هەموو کوردێك لە هەرکوێییەك بێت.

---

[15] McDowall, *Modern History,* 405.

لە ماوەی سێ ساڵدا پێوەندییەکانی بارزانیو دەوڵەتی نوێی ئێراق لەپێناو خواستی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان تێکو پێکچوو، ئیتر بارزانیش سەرلەنوێ دەستی دایەوە چەکو چۆڵو یاخیبوون. سەرهەڵدانی ئەم کەڕەتەی بارزانی لە وێنای کوردیی تورکیا دا کاریگەریی ئەوتۆی بەجێهێشت. هەر لە ژێر ئەوکاریگەرییەشدا بوو کە هەندێ لە کوردەکان بڕیاری دامەزراندنی پارتێکی نهێنیان بەنێوی پارتی دێموکراتی کوردستانی تورکیە دا . ئەم پارتە لە دووای سەرکوتی دوایین یاخیبوونی چەکداریی کورد لە ١٩٣٨دا هەوەڵ پارتی ناسیۆنالیستیی کوردیی نێوخۆی تورکیا بوو[16] .

پارتی خوازیاریی یەکێتییەکی کوردیی بوو لە چوارچێوەی سنووری تورکیا دا. لەرووی تیۆریشەوە پشتیوانی لە چالاکی چەکداریی دەکرد بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی. هەروەها لە رووی ئایدیۆلۆژییەوە لەتەك پارتەکەی بارزانیدا نێزیك بوو. وەلێ گرفتەکانی یەکێتییەکی کوردییش هەوانەتە نەبوو. بۆنموونە نامەی پ.د.ك.ت بۆ ئەوەی دەستگرۆیی بارزانی بکەن، لەلایەن بارزانییەوە بێ وەڵامبوو، هەربۆیە ئەندامانی پارتەکە، ئەم خامۆشییەی بارزانی بەوە راڤە دەکەن، کە بارزانی نایهەوێ شمشێر رووبەرووی تورکیا هەڵکێشێت. لەگەڵ ئەوەشدا بە بڕوای شەرەفەدین ئاڵچی کە پارێزەرێکی کوردو غەمخۆری پ.د.ك.ت بوو پێی وابوو:" پ.د.ك.ت وای دەبینی هاریکاریکردنی بارزانی بەرپرسایەتییەکی نەتەوەییە". لەراستیدا پ.د.ك.ت تەنانەت لەنێو تورکیاشدا پارتێکی فرە جەماوەری نەبوو. ئەودەم لاوی کورد زێدەتر کاریگەربوون بە بیروباوەڕی چەپگەریی کە لەلایەن

[16] Information on the TKDP is taken from an interview with Kurdish politician Serafettin Elci, who was close to the group, in Balli, *Kurt Dosyasi*, 599–607.

پارتی کاری تورکییەوە رەواجی پێدرابوو. هاوکات بڵاوکراوەکانیان لە زانکۆدا نەخشی نەزۆك و بێ بەرهەم نەبوو.

هەرچەندە پ.د.ك.ت هەمان رەنگدانەوەی میتۆدیی کۆنەخوازیی و کلاسیکیی پێوەدیاربوو، رێبەرەکەیشی فایەق بوجاك یەکێك بوو لە بنەماڵە زەنگینە خاوەن زەمینەکانی باشووری رۆژهەلاتی تورکیا. فایەق بوجاك لە ١٩٦٦داو لە رووداوی کۆنەقین یا دوشمنایەتی خوێندا کوژرا[17].

زۆرێك لە کوردەکان لەو باوەڕەدا بوون کە دەوڵەت و هێزەکانی لەپشت ئەو رووداوەوە بن. هەرچۆنێك بێت پارتەکە گڕو تینی ئەوسای نەماو پوکایەوە، ئیتر پشتیوانی خەڵك و کاریگەرییەکانی سرەوتن و سەنگینی لەدەستدا.

کوردەکان ئەوانەی مەبەستیانبوو زێدەتر لە نێزیکەوە شەن و کەوی کێشەکان بکەن ، تێکڕا لە پەرێزو پێچی رەوشەکەدا بوون و هەموو دەرو دەروازیەکییان لەسەر کڵۆم درابوو. چەپگەراکانی تورکیش کە دانوویان لەگەڵ سیاسەتەکانی میریدا نەدەکولا، ئەوان لەهەمبەر پرۆژەو پرسی نەتەوایەتی کوردییدا کزو بێدەنگبوون.

بەو رەنگە ئومێدی کوردگەل بۆ خۆساغکردنەوە لە تەك رەوتی چەپدا تینوویەتیی کوردی نەدەشکاند. لەگەڵ ئەوەشدا کورد جگە لە ئاڕاستەی چەپ هیچ دەرەتانێکی تریان نەبوو. هەروەك کەمال بۆرکای هزرڤانی گەورەو چالاکی چەپی کوردو دامەزرێنەری پارتی سۆشیالیست دەڵێ:" تا ئەوکات بیرمان لە دروستکردنی رێکخراو و رێکخستنێکی جیاو سەربەخۆ نەکردبوویەوە". ئەو هەمیشە دەیووت:" ئامانجمان لە گۆڕانکارییەکانی تورکیادا، سەرخستنی پرۆسەی دێموکراسی و مافەکانی مرۆڤی کورد بوو، دیارە ئەوەش پەیوەستبوو بە خەباتی هاوبەش و پێکەوەیی کوردو تورکەوە".

---

[17] Ibid., 603.

له هەمانکاتیشدا دوپاتیدەکردەوە:" ئێمە تێگەیشتبووین کە چەپی کورد هیچ بەرنامەیەکی دروستی بۆ پرسی کورد لە هەگبەدا نەبوو".

## کوردەکان ماندەگرن

لەکۆتایی شێستەکاندا بەرێبەرایەتی خوێندکارە چەپەکان دەستکرا بە ئەزموونی کارو کردەوەی توندوتیژ. لەو میانەشدا بۆ هەوەڵجار خوێندکارو رۆشنبیرە کوردەکانیش چەندین یانەو رێکخراوی تایبەت بە خۆیان دەمەزراند.

یانە کولتورییەکانی شۆرشگێریی رۆژهەلأت نموونەی ئەو یانەو رێکخراوانەبوون. ئەوان بۆئەوەی خۆیان لە گڕو گێچەڵی دەوڵەت قوتاربکەن، لەجیاتی وشەی کورد وشەی رۆژهەلأتییان لە نێوی یانەو رێکخراوەکانیان دەنا. ئەم رێکخراوە بەوردی بایەخی بە گرفتە فەرهەنگیی‌و کۆمەلأیەتییەکانی پێوەست بەکورد دەدا. هاوکات لە ئەدەبیاتی ویردو وتاری ئەم گروپەدا بە جۆرێك لە جۆرەکان مارکسییەت‌و کوردایەتی ئاوێتەی یەکترکرابوون. دیارە ئەمەیش ئاماژەو هەنگامێکی نوێبوو لە نەزمی پەرەسەندنی شوناسیی ساسیی کورد لەتورکیا دا. هەرچەندە ئەم کۆمەڵەو یانانە خۆیان لە مۆرك‌و رواڵەتی کوردیی بەدووردەگرت، وەلێ دەوڵەت بەگومانەوە تەماشای رۆڵ‌و رەونەقی ئەوانی دەکرد لەرامیارییدا، هەربۆیە لەکۆتایداو لە ئۆکتۆبەری ١٩٧٠ تێکرای رێبەرەکانی ئەو گروپانە بەتۆمەتی هەوڵدان بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی جیاو جیاخوازیی باڵبەستکران[١٨].

دیارە رەنگە هەندێك لە کوردەکان خەون‌و خەیاڵی دەوڵەتی سەربەخۆیی کوردییان لە هزردا بوبێت، وەلێ هەموو ئەوانی تر هەر هەوڵ‌و هێزێك بۆ دەوڵەتی

[18] See description of the 4th Congress in Lipovsky, *The Socialist Movement,* 75–82.

سەربەخۆی کوردیی لە پێچو پەنای یانەو کۆمەڵەکانی مافی کلتوریی کوردییدا بە کارێکی لەنگو دەبینی.

دەوڵەتیش هەمیشە ئەوەی دوپاتدەکردەوە:" رامیاریی ئازادیخوازیمان، کۆتو بەندی سەر چالاکییە نەتەوەییەکانی کوردی نەگرتووەتەوە". بەنەزمێکی تر نیازو نیری خۆیان روو بەکورد بەرزدەکردەوەو دەیانووت:" تەنانەت ئەگەر دەوڵەت سیاسەتیشی نەمێنێت، ئەوا رێگە بە سیاسەتکردنو کاریگەریی شوناسی نەتەوەیی کورد نادەین"[19]. کوردەکان ئەوکات لەنێو چەپەکانی پارتی کاری تورکییدا لە گەشەیەکی گەرمو گوڕدا بوون، لە کۆتایی کۆنگرەی چوارەمی پارتەکەدا تێکڕا بەجۆرێك دەنگیاندا کە کاریگەریی بیریی نەتەوەییان بەتەواوی رەچاودەکرا. لە بڕیارەکانی کۆنگرەدا پاش مشتومڕو پرسێکی ئاڵۆز، بۆ هەوەڵجار داننرا بەبوونی نەتەوەی کورد دا لە رۆژهەڵاتی تورکیا، هاوکات بەردەوامبوون لە سەرزەنشتکردنی دەوڵەت بە سەپاندنی رامیاریی بندەستکردنو تێرۆرو تواندنەوەی نەتەوەیی دەرهەق بەکورد .

ئەوە تەنها کوردەکانیش نەبوون کە ریفۆرمی خێرا ناتەبا نەبوون، بەڵکو لە کۆتای شەستەکاندا بزووتنەوەی سۆشیالیستی تەواوی ئەورووپا، بەجۆرێك لە جۆرەکان لەنێو تورکیادا شێوەی گرتبوو. لەم رەوشەدا خوێندکاری زانکۆکانی تورکیا پێبە پێ تینو تاو و تیۆرەکانی خۆپیشاندانەکانی ئەورووپای دەخواستەوە نێو تورکیاو رەخنەو دادو بێدای خۆیانیان لە خۆپیشاندانەکاندا بە گوێی دەسەڵاتدارانی تورکیادا دەدا. هەموو ئەو نارەزاییانە جەختکردنەوە بوو لەسەر مەترسییەکانی کاپیتالیزمو ئیمپریالیزمو نێزیکی پێوەندییەکانی ئەمەریکاو تورکیا، هاوکات خواستی گۆڕانکارییەکی ریشەییو دەستێوەردانی ئەمەریکا لە ڤێتنام و خواستی خەباتی گەریلایی دژ بە هەستو هێزی ئەمریکا لەنێوچەکەدا گرنگترین

---

[19] Ibid., 78.

باس‌و خواسه‌کانی خوێندکاران بوون. به‌م جۆره دیدو دنیابینی چه‌په‌کان به‌کاوه‌خۆو هه‌نگامبه‌هه‌نگام سه‌ختگیرو به‌رینتر بلاْوده‌بوویه‌وه. ته‌نانه‌ت بۆ پراکتیکی تیۆره‌کانیشیان چه‌ندین رێبه‌ری به‌رپرس له خوێندکاران به‌ره‌و خێوه‌تگاکانی راهێنانی سه‌ربازی فه‌له‌ستینییه‌کان له‌لوبنان که‌وتنه رێ تا بتوانن که‌لك له ئه‌زموونی خه‌باتی چه‌کداری وه‌ربگرن. سه‌ندیکا کرێکارییه‌کان زێده‌تر به‌ره‌و رادیکاڵیه‌ت‌و ره‌قیی رۆیشتن له خواسته‌کانیاندا.

له‌راستیدا هه‌ر ئه‌م خواست‌و خرۆشانه‌ی زانکۆکانبوو که رۆڵێکی گرنگی گێڕا له کۆتایهێنان به ده‌سه‌لاْتدارێتی مه‌نده‌ریس له تورکیا، هه‌ر ئه‌م به‌ره‌و پێشچوونه بوو له خواسته‌کانی چه‌پگه‌راکاندا که گۆڕانکاریی کۆمه‌لاْیه‌تیشی له‌گه‌ڵخۆیدا هێنا. به‌م ئه‌زمه بچوکبوونه‌وه‌ی پانتاییه‌کانی دیموکراتیی‌و چالاکی یاسایی رۆڵی بینی له بره‌ودان به بیروبۆچوونی رادیکاڵ‌و توند له تورکیادا.

چونکه یاسای هه‌ڵبژاردنی ١٩٦٨ هه‌وڵی دا بۆ سنووردارکردنی گه‌ش‌و نماکانی پارتی کاری تورکیاو هه‌روه‌ها ئه‌وه‌یشی گه‌یاند که له رێگه‌ی خه‌باتی سیاسیی‌و یاساییه‌وه ناکرێت هیچ ده‌ستکه‌وتێك به‌دیبهێنرێت. هه‌ربۆیه له ده‌ستپێکی ١٩٧٠دا دوو گروپی چه‌کداریی له‌تورکیادا و له هه‌ناوی چه‌پی تورکیی دا له دایکبوون [20]. هه‌ریه‌ك له‌م گروپانه تیۆری شۆڕشی چه‌کداریی کۆمۆنیستی له‌خۆگیرابوو. وه‌لێ گروپه‌کان چالاکییه‌کانیان بریتی بوو له برینی بانکه‌کان بۆ ئه‌وه‌ی سه‌رمایه‌گوزاری بکه‌ن له پێناو چالاکییه‌کانیاندا. هاوکات کاری رفاندنیان بره‌و پێده‌دا تا بتوانن ئامانجه‌کانیان زێده‌تر بگه‌یه‌نن‌و بلاْوبکه‌نه‌وه.

له راستیدا ئه‌م ره‌وشه زێده‌تر ئه‌وه‌ی پیشانده‌دا که حکومه‌ت کۆنترۆڵی ولاْتی له‌ده‌ستداوه. له لایه‌کیتره‌وه خه‌باتکاره‌کان پلانگه‌لێکیان دارشتبوو بۆ گواستنه‌وه‌ی خه‌باته‌که‌یان بۆ نێو چیاو چۆڵه‌کان، تا له‌وێ بتوانن ببنه سه‌رمه‌شقی

---

[20] Ahmad, *Modern Turkey*, 145.

شۆڕش بۆ هەموو تورکیا. لەنێوخۆی تورکیادا پێوەستی ڕێکخراوە کوردییە ئاشکراکانو بزووتنەوە توندڕەوە کۆمۆنیستییەکانی تورك بەهۆی ئەو شالاّوە توندانەی لەلایەن ڕاستڕەوەکانەوە دەکرایە سەریان، هەموو ئەوانە ولاّتیان بەرەو ئاقارێکی سامناكو پشێوییەکی سیاسیی تاریك بردبوو. کە ئەوەی زێدەتر رەوشەکەی توشی شۆککردبوو، بریتی بوو لە مانگرتنی بەربلاّو و بەرینی کرێکاران لەسەرانسەری خاکی تورکیا . بەمجۆرە بەرزبوونەوەی ئاستی توندووتیژی لە شارەکاندا سەقامگیریی پرسی دێموکراسی لە تورکیادا ڕووبەرووی هەڕەشەو گوڕەشە کردەوە. هاوکات ڕۆڵی تورکیای وەك ئەندامی لوتکەی ناتۆو هاوپەیمانی نێزیکی ئەمەریکا خستە ژێر پرسیارو هەڕەشەی جددییەوە.

هەربۆیە سوپای تورکیا کە خۆی بە تەنها پارێزەری بەرو دووای دێموکراتیو سیکۆلارییەتی تورکیا دەزانی، ئێجگار بەو ڕەوشە نیگەرانکرا. دوواجار لە ١٢ –٣– ١٩٧١ دا هێزە چەکدارەکان بۆ جاری دووەم لە ماوەی هەمان دەیەدا دووەم کۆدەتای سەربازییان ڕاگەیاندەوە[٢١].

کۆدەتای ئەمجار بە ئامانجی وشککردنی سەرچاوەکانی توندوتیژییو ڕادیکاڵییەت بوو لەتورکیادا، هەروەها هەوڵێك بو تا جارێکی تر دەستوری بنچینەیی ١٩٦١و یاساو ڕێساکانی بنوسرێنەوە بۆ ئەوەی جارێکی تر هیچ هێزێك نەتوانێت لەتمە بە ئاسایشی ولاّت بەرێتو جاڕی توندوتیژیبدات. لە دەسپێکی کۆدەتادا تەواوی ڕێبەرانی پارتی کاری تورکی تۆمەتبارکران بە بانگەشەکردن بۆ کۆمۆنیزمو پشگیریکردن لە جوداخوازیی کورد. هاوکات سوپا نیگەران بوو لەمەڕ ئەو ناسۆرییانەی لەئەگەری تێوەگلانی لە بەڕێوەبردنی ڕاستەوخۆی دەوڵەتدا دێنە پێشەوە، هەربۆیە حکومەتی سپارد بە چینێك تەکنۆکرات تا ولاّت بەرنە ببەنبەڕێوە.

---

[21] See Ahmad, *Modern Turkey,* 148–157 for details on the coup and aftermath.

ئەرکی سەرەکی ئەم حکومەتە بریتی بوو لە سەرلەنوێ نووسینەوەی یاسای بنچینەیی تا هەموو ئەو ئازادییانە سنوردار بکات کە بواریان بە سەرهەڵدانو قوتبوونەوەی گروپی رادیکاڵو توند رەخساندبوو. ئیتر لەسەرانسەری وڵاتدا یاسا سەپێنرابوو. بەمەش تەواوی ژیانی سیاسییو گروپەکانی لاوان لە پەلوپۆکەوتنو داخران. هەروەها کۆبوونەوەکانی سەندیکا کرێکارییەکان چیدی قەدەغەکران. دەسەڵاتدارانیش هێزێکی لە رادەبەدەریان پێدرا تا تەمامی بڵاوکراوەکان لە وڵاتدا رابگرن.

پاشماوەی یانەکانی گروپی کلتوریی رۆژهەڵاتی شۆڕشگێڕ داخرانو پارتی کاری تورکیش قەدەغەکرا. هەروەها هەموو چالاکوانە چەپەکان ئەوانەی کە بەرەو ئەوروپا هەڵنەهاتبوون، یان دەستبەسەربوون یاخۆ توندی بەندیخانە کرابوون[٢٢].

ئۆجەلان لە سەرو بەندی کودەتادا تەمەنی تەنها ٢١ ساڵ بوو. ئەو وەك کارمەندێکی تۆماری زەوییەکان لە ئەستەمبووڵ مابوویەوەو لەو قۆناغەدا مژوڵی خۆ ئامادەکردن بوو بۆ ئەنجامدانی تاقیکردنەوەی وەرگرتن لە زانکۆدا، لەلایەکی تریشەوە مەبەستی بوو بتوانێت برێك پوڵو پارە خڕبکاتەوە تا بتوانێت ژیانی خۆی پێمەیسەربکات.

لەگەڵ ئەوەشدا تارادەیەك بەشداریی کۆڕو کۆبوونەوەکانی یانە کلتورییەکانی کوردی دەکرد. وەلێ تا ئەوکات نە گروپە کوردییەکانو نە بزووتنەوەی چەپی تورك کاریگەریی ئەوتۆیان لەسەر ئۆجەلان بەجێنەهێشتبوو.

ئۆجەلان پێی وابوو گروپە کوردییەکان لە مەڕ پرسە گرنگە سیاسییەکانی داهاتووی کورد بێ ئاگاو ئاوەزن. چەپەکانی تورکیش تەنانەت ئامادە نین رووبەڕووی کێشەی کورد ببنەوەو بیهێننە بەرباسو خواست. بەمجۆرە پشێویە

22 Birand, *Apo ve PKK,* 81–83. Ocalan's role in and his views on the Turkish left are described in Yuce, *Dogu'da,* Cilt I, 169–177.

سیاسییەکان ئۆجەلانیان ناچارکرد پێداچوونەوە بکات بە ژیانی ئەوکاتو بیر لە نیازو نەخشەکانی داهاتوویشی بکاتەوە. لە سەرەتادا ئەو ئومێدەواربوو لە بەشی یاسای زانکۆی ئەستەمبوڵدا درێژە بەخوێندن بدات، وەلێ ژینگەی دەوروبەر ئەویان ناچارکرد رووبکاتە بوارگەلێکی تری زانستیی وەك کێشەکانی دنیای سیاسەتو شوناسی نەتەوەیی.

هەربۆیە ئۆجەلان بە ماوەیەکی کەم لە پاش کۆدەتا بڕیاریدا گۆڕانکاریبکات. سەرەتا وازی لە ئیشەکەی ئەستەمبوڵی هێناو پاشان رویکردە شاری ئەنکەرەو لەوێ بەمەبەستی خوێندن لە بەشی زانستە سیاسییەکانی زانکۆی ئەنکەرە، کە بەشێکی بەرزو باڵا بوو نێوی خۆی تۆمارکرد[23]. ئۆجەلان لەبارەی ئەوکاتەوە دەڵێت:" لەلایەکەوە چەندین تەڤگەریی شۆڕشگێڕ هەبوون، لەلایەکیترەوە کوردایەتیو سۆشیالیزم لە گۆڕێدا بوو". لەشوێنێکیتردا دەڵێ:" چەندین پرسیار لە هیزرمدا کەڵەکە کرابوون، لەو باوەڕەدا بووم بتوانم ئەو وڵامانەم لە دوتوێی زانستی رامیارییدا چنگبکەوێت".

## زیندانییەك

پەروەردەو پێگەیشتنی راستەقینەی سیاسیی عەبدوڵڵا ئۆجەلان لە ساڵی ١٩٧٢دا دەستپێدەکات. ساڵێك کە تێیدا هێزەچەکدارەکان پشتیوانی بەرێوەچوونی حکومەتیان دەکرد. لەبەرامبەردا هێزە چەکدارەکانی چەپی تورك لەهەوڵی ئازادکردنی سێ لە ئەندامەکانیان بوون کە سزادرابوون بە لەسێدارەدان. کار گەیشتە ئەوەی لە رووبەڕووبونەوەیەکی ئەو گروپەدا لەتەك پۆلیس بەتۆمەتی ناپاکیی گەورەو رفاندنی سێ لە ئەندازیاری غەوارەی نێو هێزەکانی ناتۆ جەنگ دەستپێکرد. ئەوان ١١بارمتەیان لە گوندێکی نێزیك ئەنکەرە بەنێوی قیزلدەر

---

[23] Birand, *Apo ve PKK*, 81.

حەشاردابوو. لەئاکامدا تێکرای رفێنەرانو یەکێك لە هێزەکانی پۆلیسو سیان لە بارمتەکان کوژران. ئیتر لەکاردانەوەی ئەم رووداوەدا بۆ هەوەڵجار خوێندکارانی چەپ ناڕەزایی توندیان لەدژی کوشتنی خەباتکارە چەپەکانیان نیشانداو پرۆتستۆکرد.

لە پاش ئەم رووداوە ئۆجەلان وەك خوێندکارێکی زانکۆ پێوەندیکرد بەو گروپە خۆپیشاندەرەوە. لەراستیدا دەوڵەت لەبەرامبەر ئەم خۆپیشاندانەدا نەرمیی نەنواندو یەکێك لەوانەی کە لەلایەن دەستەلأتدارانەوە دەستبەسەرکرا عەبدوڵا ئۆجەلان بوو.

ئەوە یەکەمجاربوو ئۆجەلان زیندان ببینێتو لێپێچینەوەی لەتەکدا بکرێت. لەماوەی لێکۆڵینەوەکەیدا زۆر بەجوانی وەڵامی پرسیارەکانی دەدایەوە. ئیبراهیم ئایدین دەڵێ:" من ئەوم نەدەناسی، هێندە دەزانم پاش دەستبەسەرکرانی هێنرایە خانەی پرس‌وجۆوە. ئەو لە تەمەنی ٢٢ساڵیدا وەك خوێندکارێکی زانکۆ پێوەندی بەڕیزەکانی خۆپیشاندەرانەوە کردبوو ".

هەروەها یەکێك لە پاسەوانەکان وتبووی:" هەرکە کاپیتان دەهات ، ئۆجەلان پێویستبوو جۆرێك لە کاردانەوەی پیشانبدایە، دواجار کاپیتان هاتو ئەوی بردە دەرێ". دوو پیاو برانە گرتووخانەی ماماکی سەربازیی لە ئەنکەرە. ئەوێ سەنتەرێك بوو پڕ لە جۆش‌و خرۆشی تەڤگەریی خوێندکارانی چەپو زۆرینەی رێبەرو رێنیشاندەرنی چەپڕەوەکان لەو گرتوخانەیە بوون. هەموو ئەوانە بە هۆکاری ئاژاوەنانەوەو کاری رفنەستێن‌و رفاندن بەندکرابوون. لەوانە سێ لاو بڕیاری لە سێدارەدانیان بۆ دەرکرابوو.

ئۆجەلانو ئایدین برانە خانەیەکی گرتووخانەکە کە ٧٠ بەندیی تێدابوو. زۆرینەی ئەوانەیش خوێندکاری زانکۆ یا پێشتر لەزانکۆبوونو تەواویشیان بەهۆی تێکەڵبوونیان لەگەڵ رەوتو رێبازی چەپگەریی بەندکرابوون.

زۆربەی ئەوانەی دەستگیرکرابوون هێند رادیکاڵ نەبوون، وەڵێ نێزیکەی هەموویان وادادەنرا کە پێوەندیان لەتەك فیدراسۆنی لاوی شۆڕشگێڕەوە(دەڤ گەنج) دا هەیە. لەکاتێکدا ئەم کۆمەڵە خوێندکارییە چەپەو هەندێك لە چەپەکان لەدەرەوەی گروپە چەکدارییە چەپڕەکانەوە گەش‌ونمایان کردبوو.

بەڕێکەوت ئایدین رێك بەتەنیشت ئۆجەلانەوە شوێنی خەوتنیان پێدابوو. ئایدین پیاوی پێوەندیی‌و پێداگیر لەخەبات بوو. ئەو دەیخوێند تاببێتە مامۆستای پەروەردەی بەدەنی‌و یەکێکیش بوو لە هەوادارو هامباوەڕەکانی (دەڤ گەنج). ئایدین کوردبوو، ئەو راستیەی خاس دەزانی، خزم‌و خێزانی دیکەی لە سەروەختی راپەڕینی خەڵکی شاری دێرسیمدا لەلایەن ژەندرمەکانی تورکەوە لەنێوبرابوون. وەڵێ وەك زۆربەی زۆری کوردان لەو قۆناغەدا، هێشتا بیری سیاسیی کوردیی لەلای ئایدین نەخەملّیبوو.

ئەو پێی وابوو شۆڕشی بەڵێندراوی چەپی تورك دەکرێت کێشەکانی کورد چارەسەربکات. ئایدین دەڵێ:" ئێمە هەستی کوردایەتیمان زۆر بەتووندی نەگرتبوو، ئەوەی کە هەبوو تەنها شتێکی سروشتی بوو".

ئێستەکانێ ئایدین لە تاراوگەیەو لە ولاّتی سوید ژیان بەسەردەبات. بەم نەزمە لەگرتوخانەدا ئۆجەلان‌و ئایدین بوونە هاوەڵی گیانی بەگیانی یەکتر. ئەوەی زێدەتر نێزیکی کردنەوە لەلایەکەوە کوردبوونیان بوو لەلایەکیترەوە بەندکردنیان بوو لە یەك ژووردا. ئیتر پێکەوە کاتەکانی زیندانیان بەوتوویژو ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕاوە دەگوزەراند.

ئۆجەلان لەبارەی ستراتیژو خاڵی کەموکوڕیەکانی بزاڤی چەپی تورکیی دەدواو روونکردنەوەی دەدا.

هاوکات ئۆجەلان لە زێنداندا بە ئاسانی دەستی رادەگەیشت بە گەلێك لەو پەرتووکە باوانەی ئەوکاتو دەیخوێندنەوە، لەوانە پەرتوکەکانی پەیوەست بە

گرفتەکانی سۆشیالیزمو مارکسو لینینیزمو کلاسیکیاتی رووسی. هەربۆیە هەمیشە ئۆجەلان لە بارەی سیاسەتو تیۆرەکانی چەپەوە شتانێکی دەزانیو بە ئایدنی دەوتن. وەلێ کاتێك کاتی ئەوە دەهات ئەو روانگەو راستییەکانی خۆی رابگەیەنێت، ئۆجەلان بەشێوەیەکی زۆر نامۆ بێدەنگی دایدەگرت.

بەشێوەیەکی گشتیش زیندان ببوویە مەکۆی رازونیازو وتووێژە بەردەوامەکانی هەوادارو هاورێیانی دەڤ گەنج. ئۆجەلانیش بەدەر نەبوو لەو مشتومڕانەداو بەڵکو فرە بە گەرمو گوڕییەوە مژوڵی گفتوگۆکان بوو.

ئۆجەلان لە دنیای سیاسەتدا لە سەرەتادا بوو، کەواتە شتانێك هەبوو دەبوو ئاشنابوایە پێی. پێویستە بگوترێت ئەوانی تر لە زیندانێدا لە بەر ئەوە پێوەندیان پێوەنەکرابوو کە خوێندکاری سەرەکی بزووتنەوەکان بوون، بەڵکو لەبەر ئەوە پێوەندییان پێوەکرابوو کە گروپی چەپی چەکداریی بوونو بەڵێنی شۆڕشیان دابوو لە تورکیا. لەراستیدا هەندێك لە چەپڕەوەکان کە دەستگیرکرابوون بەتاسەو تامەزرۆییەوە لە خۆسازدانو خۆ ئامادەکردنداابوون بۆ نەبەردییەکی شۆڕشگێڕانە لەتورکیا. بەتایبەتی لەو کاتەدا شالاوی دەستگیرکردنی بەکۆمەڵو سەرکوتی پاش کۆدەتای سەربازیی دووەم دەستی پێکردبوو. بەڵام ئۆجەلان لەو کاتانەدا تەنها کارمەندێکی سادەو نۆرماڵی میریی بوو. لەبەر ئەوە ئەگەر بۆ هاو زیندانییەکانی قسەیەکی پێنەبوایە بۆ وتن، ئەوا بە دڵنیاییەوە گوێی بۆ هەموو ئەوانە دەگرت کە لە گۆڕەپانەکەدا رابردوویەکیان بۆ خۆیان تۆمارکردبوو.

بەمجۆرە ئۆجەلان لە نێزیکەوە لە کرۆکی کاری پێڕو گروپە چەپەکان تێگەیشت، ئیتر تێگەیشت بوونی هێزێکی رێکخراوەیی و رێکخستنێك چەند بەبایەخە بۆ ئەوەی بتوانیت خواستە سیاسییەکانت نومایان بکەیت.

ئۆجەلان لە زینداندا چاوی بە هەموو ئەو سەرداری سەرکردانەی چەپ کەوت، کە پێداگرو پەرگیربوون لەسەر ئەوەی کە تەنها خەباتی چەکداری دەتوانێت گۆڕان لە رەوشی تورکیادا بهێنێتە ئاراوە.

لە گرتووخانەدا ئەو شتەی کە بۆ ئۆجەلان هەمیشە جێگەی پرسیار بوو ئەوە بوو، کە بەهیچ جۆرێك کێشەی کورد لە تورکیا نەدەخرایە بەر باس.

بەمجۆرەو لە ئۆکتۆبەری ١٩٧٢دا، پاش نێزیکەی حەوت مانگ مانەوەی لە گرتوخانەدا، بڕیاری ئازادکرانی ئۆجەلان درا. ئۆجەلانی پاش زیندان مرۆڤێکیتر بوو، بۆخۆی دەیوت:" زیندان بۆ من قوتابخانەیەك بوو ، کە تێیدا توانیم پەرە بە خەباتی سیاسیم بدەم"[٢٤].

هەروەها شاڵاوی دەستگیرکرانەکان تەنها بەپاساوی ئەوەی کە پێوندییان هەیە بە بەشداری لە خۆپیشاندانی ئاشتیخوازانەوە، ئەو باوەڕەی لای ئۆجەلان سەلماند، کە لەتورکیا دا تەنها کونجێکی گچکە بۆ خەباتی دێموکراسی نەماوەتەوە. هاوکات مشتومڕەکانی نێو زیندانو ئەو زانیارییانەی لە زینداندا لەلای رێبەرانی چەپ گوێبیستی ببوو بەتەواوی رامانو ڕووگەی ئۆجەلانیان بەرەو خەباتی چەكو چەکداری وەرچەرخاندبوو. لەوەشگرنگتر هۆشیارییو ئاگایی ئۆجەلان لەمەڕ پرسی کوردیی لە دەسپێکدا بوو بۆ ئەوەی بنچینەیەك بۆ کێشەی نەتەوایەتی کوردیی دابرێژێتو گروپێکی پەیوەست بەو پرسە دابمەزرێنێت.

هەروەك ئۆجەلان لە دووایدا وتبووی:" ئەوە خاڵی گواستنەوەی من بوو بۆ ئەوەی ببمە شۆڕشگێڕێکی پرۆفیشناڵ"[٢٥].

---

[24] Yuce, *Dogu'da,* Cilt I, 201.
[25] Birand, *Apo ve PKK,* 84.

## رامیاریی باو

یەکەم هەڵبژاردنی نەتەوەیی بۆ ئۆکتۆبەری ١٩٧٣ بەرنامەڕێژی بۆ کرابوو. لە مانگی یەکی ساڵی داهاتوشدا سەرۆك وەزیرانی نوێ بوڵند ئەجەوید کابینەی نوێی دەوڵەتەکەی ڕاگەیاندو لەماوەی چەند مانگێکی کەمدا لێبووردنێکی سەرتاسەریشی بۆ هەموو ئەوانە دەرکرد کە بە تاوانی سیاسیی بەندکرابوون[٢٦]. ئەگەر حکومەت هیوای بەوە هەبوایە بە نەزمێکی شێوەسەربازی بۆ دوو یان دووساڵو نیو وڵاتی بەڕێوە ببردایە، ئەوا دەتوانرا شوێنەواری توندووتیژی سیاسیی لە تەواوی کیشوەردا بسڕێتەوە، وەلێ دەوڵەت لەوەدا کەوتە هەڵەوە. چونکە دەستبەجێ چەپەکان لە زیندانێدا ئازادکرانو دوورخراوەکان لە تاراوگە گەڕانەوەو سەرلەنوێ ڕیزەکانی خۆیان لە ڕێکخراوگەلێکی کۆنو نوێدا یەکخستەوەو ئەمجارەیان بگرە ژمارەیان فرەترو بیرو ڕایان توندو رادیکاڵتر بوو لە جاران. بەمجۆرە چالاکوانە سیاسییەکانی کوردیش ئەوانەی توندی زیندانکرابوون یاخۆ ناچارکرابوون لە زێدی خۆیان هەڵکەنرێن، سەرلەنوێ گەڕانەوە نێو کایەی سیاسیی‌و بگرە بە ئایدیاو ئەجێندایەکی ڕۆشنترەوە قۆڵی خەباتیان لێهەڵماڵی.

چالاکوانانی کوردیش وەك هاوڵاتییە تورکەکانیان، ئەوانەی ساڵانێکیان لە ئەورووپا گوزەراندبوو، ئیتر ئاشنابببوون بە شێوەی کاری ڕێکخراوگە توندڕەوەکانی ئەوکاتی دونیا، لەوانە پێڕی پارتیزانی بادر ماینهوفی ئەڵمانیاو بزووتنەوەی ئەیلولی ڕەشی فەلەستینییەکان.

---

[26] This section relies on interviews with Kurds, representing a variety of groups active in the 1970s, including PSK, Kawa, Rizgari, TKDP, and the PKK.
It also draws on Ahmad, *Modern Turkey,* 159–164.
314 Notes to Chapter 1

هاوکات له ژینگەی ئازادی ئەوروپا دا بە ئاسانی دەستیان رادەگەیشت بە خوێندنەوەی هەر پەرتوکێکی کایەی شۆڕشگێڕیی‌و لە کۆڕو کۆبوونەوەکان بیرمەندو رۆشنبیرانی چەپ‌و ناسیۆنالیستەکاندا ئامادەبیان هەبوو. هەروەها مشتومڕوی زانستییان دەکردو بەتەواوی لە زنجیرە جیاوازەکانی تیۆریی ئازادیخوازیی‌و راستییەکانی ئەو وەختەی دنیا ئاشنابیون.

ئەوانەش کە لەنێوخۆی تورکیا دا پێشتر لەکونجی بەندیخانە نرابوون، ئەو قۆناغە بۆ ئەوان هەلیك بوو تا بیروڕاکانیان ئالۆگۆڕبکەن‌و بگرە زیندان خاڵی کۆکەرەوە بوو تا لەوێ نەتەوەییە رادیکاڵەکانی کورد یەکتر بناسن‌و کۆببنەوە. بەمەش توانرا بناغەیەك بۆ چێکردنی رێکخراوگەلێکی نوێ دابڕێژرێت‌و هەمووان بتوانن لە فەلسەفەی خەباتی یەکتریی تێبگەن.

هەر لە زیندانێدا زۆرینەی چالاکوانە کوردەکانی هاوشێوەی ئۆجەلان بڕیاریان دابوو بۆ ئەوەی لە دەرێ رێکخراو و گروپی سەربەخۆی کوردیی تایبەت بە خۆیان دابمەزرێنن. لە راستیدا چەپی تورکیی دووچاری رەشبینی‌و نێهیوایی ببوون.

لەلایەکیتریشەوە ئەگەی چەپەکانی تورك دانی خێریشیان بە کێشەی کورد دا بنایە، ئەوا هەر گیز ئەو کێشەیە لە دەسپێکی کارەکانیاندا نەدەبوو. لەبەر ئەوە کوردەکان زیاتر بەدوای دۆزینەوەی چارەسەریی‌و رێگەچارەی گونجاوەوە بوون بۆ کێشەی کورد، چەپی تورکیش ملی نەدەدا بۆ ئەو خواست‌و خەمەی کورد.

لەراستیدا بگرەو بەردەیەکی سروشتی لەنێو هەناوی ئایدیۆلۆژیای کۆمۆنیستی هەبوو. بۆ نموونە لەنێوان بانگەشەکەران بۆ نەتەوەچییەتی‌و ئەوانەی باوەڕیان وابوو کە چارەی گرفتەکان لە کۆمۆنیزمدایە ئەم رەوشە دەبینرا. ئەودەم لە تورکیا دا زەمینەی ناسیۆنالیستیی تورکیی لە سیستەمی پەروەردەو فێرکردنی دەوڵەتدا فرە بەهێزو باو بوو. بەجۆرێك چەپی رادیکاڵ ئاسان نەبوو بەرە لە ژێر پێیانیدا رابکێشێتە دەرێ.

جگە لەوەیش گرفتی دەوڵەتی کوردیش بۆ چەپەکان شتێك نەبوو کە ویستبێتیان چارەیەکی بۆ بدۆزنەوە. لەم بارەیەوە کەمال بورکای دەڵێ:" چەپی تورك بە توندیی لە ژێر کاریگەریی ئایدیۆلۆژیای تورکیدا بوو، لەبەر ئەوە نەیتوانی بە شێوەیەکی کراوەو روون بێتە پێشەوە بۆ چارەسەریی دۆزی کورد".

کەمال بۆرکای پارێزەرێکی شلرەو و ئەندامی پێشووی پارتی سۆشیالیستی بوو. هەندێکجاریش سەرگەرم بەئەدەبو هۆنراوەی دەنوسین. ئەو لەماوەی کۆدەتا دا هەڵهات بۆ ئەوروپاو پاشان لەگەڵ لێبووردنی گشتیدا گەڕایەوە وڵات.

بورکای پاش گەڕانەوەی بۆ تورکیا کاری کرد لەسەر دامەزراندنی پارتێکی سیاسیی تایبەت . لەم بارەیەوە بۆخۆی وتبووی:" ئێمە ویستمان دۆزەکەمان بەکراوەیی بخەینە بەردەم خەڵکی کورد، ئەوەشمان لە کۆتاییدا دانابوو، توانیشمان ئەوە ئەنجامبدەین بە دامەزراندنی پارتێکی پەیوەست بەخۆمان".

سەرەڕای ئەوەیش ئیتر ئەوە تێپەڕیبوو کە هەر روناکبیرانی تورك رونکردنەوە بدەن لەبارەی ئەوەی کورد پێویستە چی بکاتو چۆن خەبات بکات. هاوکات چالاکی کۆتایی شەستەکانو سەرەتای حەفتاکان نەك تەنها رابوونو هۆشیارییەکی سیاسیی ئەوتۆی بەرهەم نەهێنابوو لە نێو کورداندا، بەڵکو لەهەندێ بارو دۆخدا سیاسەتی قڕکردنو توانەوەیان بەتەواوی بەئاگای هێنابوونەوە، کە ئەوە چ هەوڵێکی بەردەوامبوو بۆ سڕینەوەی شوناسیان.

حکومەتی ئەنکەرە ئومێدەواربوو بە توانەوەو مردنی تایبەتمەندییە نەتەوەییەکانی کورد، لەم پێناوەشدا کاریکرد بۆ پێشکەشکردنی هەلی خوێندنو فێربوونی زمانو مێژووی تورك لەنێو کورداندا. بۆ ئەمەش لە ١٩٦١ دا لە هەرێمە کوردییەکاندا قوتابخانەی نێوخۆیی یان شەوانە رۆژیی دامەزرێنرابوون. بەئامانجی دورخستنەوەی زارۆیانی کورد لە ژینگەی خانەوادەو ژیانیانو راهێنانو

گۆشکردنیان بە فەرهەنگو فیکری تورکو تورکاندن لەسەرانسەری ولآتدا[27]. بەلآم بە پێچەوانەوە ئەم هەولآنە کاریگەرییەکی نەخوازراویان لەسەر برەودان بە شوناسی نەتەوەیی کوردیی. چونکە پێشتر لاوەکان نەدەخرانە بەر خوێندن، بەڵکو جوانەکان لە کێڵگەو رەزەکاندا خەریکی کارو فەرمان بوون یاخۆ لە ئاواییە دوورە دەستو کاولەکاندا بە دەستگێڕ شمەكو کالآیان دەفرۆشت.

بەلآم ئیتر دەیانتوانی بچنە قوتابخانە شەوانە رۆژییەکانەوەو لەویٚ پەروەردە دەکران لە قوتابخانە ئامادەییەکانیشدا فێردەکرانو تەنانەت زەمینەشیان بۆ دەرەخسا تا بچنە زانکۆکانەوە.

لاوای کورد لە بری ئەوەی لە گوندێکی گچکەی داخراودا قەتیسبمێنێت، ئیتر دەرویان لێکرایەوە تا لە دنیای دەرێ ببینەنو تێکەلٚ بە ژینگەی نوێی بیروبچوونو خوێندکارگەلێکی کوردی دیکە بنو بزانن لە بەشەکانی دیکەی ولآتدا چی هەیەو چی نییە. رەمەزان یولوك کە خوێندکارێکی کوردی باشووری رۆژهەلآتی تورکیا بوو، لەیەکێك لەو خوێندنگایانە خرابووبە بەر خوێندن، ئەو دەیووت:"ئامانجی ئەو خوێندنگایانە بەتورککردنی لاوانی کوردبوو، بەهۆی ئەوەی کە لەوێندەر کاردانەوە هەبوو". هەروەها وتبووی:"پێش ئەوە هیچکام لە ئێمە لە ئامابیەکانمان دوورنەکەوتبووینەوە، وەلێ لە پرێکدا ئەو هەلەمان بۆ رەخسا کە دنیای دەرێی خۆمانو چۆنیەتی کاروبارەکان ببینین".

## ئۆجەلان.. کارامەیەك

نێزیکەی سالێك پاش جودابوونەوەیان لە زیندانی ماماك، لە ١٩٧٣دا ئیبراهیم ئایدنو ئۆجەلان جارێکی تر پێکگەیشتنەوە. ئەوکات ئۆجەلان مرۆڤێکی جودا بوو. ئەو لە زیندانییەکی ئارامو ئاساییەوە ببوویە مرۆڤێکی رادیکالی توندڕەو. ئەوەی

[27] McDowall, *Modern History,* 404.

پێداگربوو لە سەری ئەوەبوو، کە کورد پێویستە دەستپێشخەریبکات بۆ خەباتێکی چەکداریی بۆ ئەوەی خۆی لە داگیرکاریی تورکان قوتاربکات. ئۆجەلان ٤ لە هاوەڵەکانی ئەوانەی کە دوواتر بوونە کۆڵەکەی پ.ک.ک لە یەکێك لە گەڕەکەکانی ئەنکەرەدا تەنها ژوورێکیان بەکرێ گرت. ئیتر لەوێ شەوانە دوازدە یان زێدەتر کۆدەبوونەوەو ڕێوشوێنی پێویستو ئامادەکارییان دەکرد بۆ دۆزینەوەی ڕێیەکی لەبار لە بارەی دۆزیی کورد .

ئیبراهیم ئایدن لەو ژوورەدا بوو، ئەو چاوەڕێبوو تا وەك مامۆستای پەروەردەی بەدەنی دابمەزرێت. ئایدن تا ئەوکات هەر وابەستەبوو بە چەپی تورکەوە، وەلێ ئێجگار لە ڕەوشەکەی ئەوێ نارازیبوو. هەمیشە هاوڕێیەکانی لەبابەخی بیروباوەڕەکەی ئایدنیان کەم دەکردەوەو چەوتو چەوێڵییەکانی چەپیان دەخستە روو دەربارەی کوردەکان. ئەو بۆ خۆیشی لە رامانو بیرکردنەوەدا بوو لەمەڕ شوناسی نەتەوەیی خۆی. وتوویژ لەگەڵ ئۆجەلان، هەمیشە لەسەر پرسی کورد رایدەوەستاند. خوێندکاری زانستە سیاسییەکانیش بە تاسەو تێبینییەوە بایەخیان دەدا بەوەی ئۆجەلان چی پێیە بۆ ئەوەی لەسەر دۆزی کورد بیگەیەنێت.

ئەمەش وادەردەکەوت کە جۆرێك لە هەستی نەتەوەییانەی لەوێندەر دروستکردبێت. چونکە ئۆجەلان هەمیشە فرە بەباشی دەیخوێندەوە، ئەو ببوە خوێندکارێکی کارامەو چالاك لە سازدانی وتووێژەکاندا هاوکات توانایەکی ئێجگار باشی هەبوو بۆ دروستکردنی بەڵگەو لەسەر هێڵکی ئایدیۆلۆژی وتووێژەکانی بەبەڵگەوەو بە دروستی دەخستنە روو. وەك زۆربەی ئەوانی تر، ئیبراهیم ئایدین لەژێرکاریگەریی ئۆجەلاندا بوو، چونکە هەمیشە ئۆجەلانی دەبینی لە رامانو بیرکردنەوەدا بوو. هەردەم لە مەژگیدا پلانو پلار لە دەورووبەرو ئایندە دەخوێنرایەوە. لەبەر ئەوە بۆ گەنجێکی سەرگەرمو بێ پەروای وەك ئایدن بیرو رامانەکانی ئۆجەلان، بێ ملە جیڕەو چەندوچوون پەسەندو بەجێبوون.

ئایدن دەیوت:" ئێمە هەموومان خوێندکاربووین، ئێستا باوکێك کە لە نێوەندی تەمەنیدایە سێهێندەی گەنجێکی بوێرو بەئەمەك لەخزمەتو خەمی کورد دایە". هەروەها دەڵێ:" ئێمە هیچ جۆرە چەكو چۆڵێكو تەنانەت نەماندەتوانی نانو خۆری پێویست پەیدابکەین بۆ خۆمان، وەلێ ئامادەبووینو بڕیارمان دابوو بجەنگین لەپێناو کوردایەتیدا". بۆ هەموەڵجار و لە بەهاری ۱۹۷۳ دا ئۆجەلان چەند خوێندکارێکی هاوڕێی بانگهێشکرد تا بەنهێنی دانیشتنێك بکەنو تێیدا ئەوە لەپێشچاوبگرن چۆن لە کێشەو گرفتەکانی کورد نێزیکببنەوە[۲۸].

گروپەکە لەسەر ئەوە کۆکبوون، کە لە دەستپێکی کارەکانیاندا واپێویستدەکات لێکۆڵینەوە بکەن تا لە دۆزی کورد تێبگەنو پاشان رێگە چارەی پێویست بۆ گرفتەکان دابنێن. لەراستیدا ئەوان کەمو کورتیی ماتریاڵی مێژوویی لەسەر مێژووی کوردستانو راپەرینەکانی رابردوو، ئەو هێزەی پێدان کە لێکۆڵینەوە بکەنو سەرلەنوێ لەبارەی مێژوویان کەرەستە کۆبکەنەوەو شیکاری رووداوەکان بکەن تا بزانن داوای چی دەکەنو بۆچی جیاوازو جێباوەڕ ترن لەوانی رابردوو.

لەم بارەیەوە ئۆجەلان دەیووت:" ئێمە توانیمان داوای گروپێکی لێکۆڵینەوە بکەین، لە ئاکامدا هیچ پلانێكو نەخشە رێژییەکمان بۆ کاری چالاکی ئایندە لەهەگبەدا نەبوو"[۲۹]. پاش ئەوەی لە ۱۹۷٤دا ولآت گەڕایەوە دۆخی پێشووی‌و حوکمی مەدەنی دەستبەکاربوویەوە، ئیتر ئۆجەلان پێوەندی کرد بە رێکخراوێکی نوێی خوێندکارانەوە بەناوی کۆمەڵەی خوێندنی باڵاو دێموکراتی ئەنکەرە کە تێیدا پەرەی بە سۆشیالیزمو چەپرەویی دەدا. ئۆجەلان ویستی لە پاڵ ئەم رێکخراوە یاساییەدا کارو کردەوە شاراوەو نایاساییەکانی برەوپێبدات. لەوکاتەدا ئۆجەلانو هاورێکانی ئەو باوەڕەیان لەلا دروستببوو کە پێویستیان بە رێکخستنێکی

---

[28] Details of the Cubuk Baraji, or Cubuk Dam meeting, are found in Birand, *Apo ve PKK,* 84 and Yuce, *Dogu'da,* Cilt I, 234–238.
[29] Birand, *Apo ve PKK,* 84.

سەربەخۆی کوردیی هەیە تا لە پێناو مافە نەتەوەییەکانیاندا خەباتو نەبەرد بکات. ئەمە لەکاتێکدا بوو کە چەپەکانی تورکو کورد دەیانتوانی هۆیەکی هاوبەش بدۆزنەوە بۆ ئەوەی پێکەوە دەستبدەنە شۆڕش[٣٠].

لەگەڵئەوەشدا ئۆجەلان کاریکرد تا پێکەوە لەنێو ڕێکخراوی کۆمەڵەی خوێندکارانی باڵای ئەنکەرە ئەو خاڵە هاوبەشە دروستبکات. بەڵام بیرۆکەکەی ئۆجەلان لەنێو خوێندکارانی چەپی کۆمەڵەکەدا هیچ کاردانەوەیەکی ئەوتۆی نەبوو . ئەوان پێیان وابوو پێویستە ئەو نەزمە باوەی دۆزی کورد بەردەوام بێتو جاریٚ شۆڕش لەپێشەوەی هەموو ئەگەرەکاندایە بۆ ئازادی هەردوو کوردو تورك پێکەوە. دەکرێت بوترێت کە چەپەکانی تورك کاریگەر نەبوون بەو تیۆرو نەخشانەی کە ئۆجەلان بۆ شۆڕش پێیانگۆشکرابوو. دواجار ڕێکخراوەکە کەوتە مەتەرێزی یاساو ڕێساکانی تورکیاوەو لە چوارچێوەی قەدەغەکردنی پروپاگەندەی کۆمۆنیستیدا لە ١٩٧٥دا کۆمەڵەکە قەدەغەکرا[٣١].

ئەمەو کاردانەوەی نێگەتیڤی چەپی تورك لەبەرامبەر ڕوانگەی ئۆجەلاندا، ئیتر هیچ بوارێکی بۆ خەباتی هاوبەشی چەپی کوردو تورك نەهێشتەوە، هاوکات ئەو گرفتە یاساییانەی کە ڕووبەڕووی کۆمەڵەکە کرایەوە دیسانەوە یاریدەی ئۆجەلانیان دا تا وازبێنێت لە بیرۆکەی چێکردنی بەرەیەکی یاسایی بۆ دەستپێکردنو بەرپاکردنی ڕێکخراوێکی نویٚ.

---

[30] Ocalan's experiences in ADYOD and how it affected his developing ideology are described in Birand, *Apo ve PKK*, 84–85 and Yuce, *Dogu'da*, Cilt I,
243–250.

[31] Ocalan describes the meeting and decisions taken in Birand, *Apo ve PKK*, 85; also Yuce, *Dogu'da*, Cilt I, 280.

هاوکات ئۆجەلان ئەو بڕوایەی لەلا گەڵاڵەبوو کە یانە کلتوورییەکان و کۆمەڵە یاساییەکان هەمیشە جێگەی سەرنج و چاودێری دەوڵەتن، لەبەرئەوە ئاسان نییە مانەوەی ڕێکخستنێکی نهێنی لەبەردەم تیغی دەزگا سیخوڕییەکان و پۆلیسدا، هەربۆیە ئەو خاڵە بۆ ئۆجەلان تەمام چارەنووسساز و بەبایەخبوو. هاوکات باوەڕیشی وابوو ڕێکخراوە یاساییەکان و بەرەی چەپەکان هۆیەکن بۆ کێبەرکێ و وتوێژی درێژخایەن و ماندووکەر لە نێوان ئەندامانا.

ئەمەش بێ گومان دەرفەتی شۆڕش و ئاسۆی دەستپێکردنی شۆڕشی لەتورکیا دا دووردەخستەوە. ئەم هۆکارانە بەزوویی یاریدەی ئۆجەلانیان دا تا لە ١٩٧٥ دا لە تەک ١٥ هاوەڵیدا لە دیکمانی دەوروبەری شاری ئەنکەرەدا کۆبوونەوەیەکی چارەنووساز گرێبدەن. لەم کۆبوونەوەیەدا تەواوی خوێندکارەکان بڕیاریاندا بە دامەزراندنی ڕێکخراوێکی مارکس _ لینینی و لەو پێناوەدا بەتەمامی دەستبەرداری خوێندنی زانکۆبوون و یەکلاییبوونەوە بۆ نەبەرد لەپێناو دروستکردنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیدا.

هەروەها بڕیاریاندا ڕاستەوخۆ تێکۆشان و تین و تاوی خەباتیان بەرنەوە کوردستان و لەوێ بیرو باوەڕکانیان بڵاوبکەنەوەو سەرنج و سیرەی خەڵکی بۆخۆیان کێشبکەن و ببنە پشتگیرو پەنای خەڵکی کوردستان.

لەراستیدا ئەم تیۆرو تێبینیانەی گروپەکەی ئۆجەلان و کاروکردەوەکانیان زێدەتر خود سەرانەو گێلانەبوو تا ئەوەی بەبەرنامەو بابەتیانە بێت. بۆنموونە هێرشکردنە سەر گروپە ڕاستڕەوە نەتەوەپەرستەکان ئەوانەی پێداگری و پشتیوانی ناسیۆنالیزمی تورکیی بوون، هەروەها واتەواتو دەمەقاڵەو هەندێك کات شەڕو شۆڕ لەتەك گروپە چەکدارییەکانی چەپی تورك ئەوانەی پێویستییەکیان بۆ بوونی ناسیۆنالیزمی کوردی نەدەدی، هەروەها ڕێپێوان و خۆپیشاندانی بەرفراوان و بۆ

سەرنج راکێشانی رایگشتیو دەوڵەت بە بایەخو بەیداخی دۆزەکەیان شتانێکی بێ ئاکامو ئامانج بوون.

هاوکات گروپی تازەدامەزراو بڕیاریدا کە هیچ ئۆرگانێکی فەرمی وەك رۆژنامە یان گۆڤار وەشاننەکات، چونکە لە هەر بارێکدا هەژارو نەدارەکان نەیاندەتوانی بەدەستی بهێننو نەخوێندەوارەکانیش لێی تێنەدەگەیشتن.

لەبری ئەوە گروپەکە پشتبەستۆو بوو بە یەکبەیەکی کۆبوونەوەکانیان لەگەڵ کوردانی باشووری رۆژهەڵات بۆ ئەوەی خێراتر خواستەکانیان بگەیەننو پشگیریی ئەوان بەدەستبهێنن. ئەم بڕیارە لەکاتێکدا هات، کە گروپە توندڕەوە کوردو تورکەکان پێویستبوو بەلایەنی کەمەوە بەرەیەکی یاسایی چێبکەن لەپێناو بڵاوکردنەوەی بیرو بۆچونەکانیان، وەلێ ئەمەیان ئەستەم بوو.

خاڵی گرنگ بۆ ئەوان ئەوە بوو، کە لەبری بەهەدەردانی کات کارگەلێکی گرنگ بکەن بۆ خڕکردنەوەی پوڵ تا ئۆفیسێك بەکرێ بگرنو چاپخانەیەکی پێدەستەبەربکەن، یاخۆ جۆرێك مامەڵە بکەن لەتەك دۆسییەکانی دادگادا کە هەمیشە لە دژی گۆڤارە رادیکاڵەکاندا بازبوون.

دیارە کە گرتنەبەری ئەم نەزمە یاریدەی ئۆجەلانو ئاپۆچییەکانی دەدا کە بتوانن شۆڕشی بەڵێندراو دەستپێبکەن. لەراستیدا هەروەك سەلاحەدین چلیك وتبووی:" لە تورکیادا دێموکراسی ڕوویەکی شاراوەی هەبوو، کە ئەمەش دێموکراسییەکی چەوت بوو".

سەلاحەدین کاتێك مژوڵی خوێندنی ئەندازیاری بوو لە یەکێك لە زانکۆکانی ئەنکەرەدا، هاوەڵەکانی بۆ هەوەڵجار ئەویان بە ئۆجەلان ئاشناکرد. ئەو لەیەکێك لە وتەکانیدا لەمەڕ ئەو رەوشە وتبووی:" بۆ قوتاربوون لە سایەی تورك، ناکرێت رێگەی دێموکراسیی یا رێگەی یاسایی بگرینە بەر، لەبەر ئەوە پێمانوابوو تەنها رێگەی بردنەوەمان لە گەمەکەدا گرتنەبەری خەباتی چەکداری بوو. ئێمە لە

دێموکراسییەتدا نەژیابووین، بۆیە هیچ شتێکمان لەبارەی دێموکراسییەوە نەدەزانی".

هەرچەندە ئۆجەلان سەبارەت بەم تیۆرانە کەمێك لە تواناکانی خۆی نیشاندابوو، وەلێ فرە دڵنیابوو لە بەرنامەو پلانو تیۆرەکانی، کە دەتوانێت بەهۆیانەوە خەڵکی نێو ئۆرگانو ئۆفیسە جوداکانی تر لە پێناو مەرامەکانیدا بەکاربهێنێت.

بۆ نموونە لە دەستپێکی ١٩٧٦دا سەرۆکی پێشووی کۆمەڵەی کلتوریو دێموکراسیی شۆڕشگێر (د.د.ك.د)، کە ساڵی ١٩٧٢ وەك گروپێکی کوردیی جوداخوازی هەوادارو پشتیوانی سۆڤییەت دامەزرێنرابوو، ئامادەیی خۆی دەربڕی تا لەیەکێك لە گردبوونەوەکانی ئۆجەلاندا بەشداریبکات. لەبەرامبەردا ئۆجەلانیش لەرێگەی کەسێکەوە ئەوەی بۆ ئەو خستە پێشچاو کە:" ئەگەر تورکەکان بژنەون کە تۆ باس لە چیدەکەیت، ئەوا لە ماوەی سێمانگدا تارومارتان دەکەن"[٣٢].

## بەتاك و تەنهایی

ئۆجەلان نەیتوانی هیچ پشتو پەنایەکو هامدەمییەك لەنێو گروپە کوردییەکانی تردا دەستەبەربکات. بەپێچەوانەوە رێبەرانی تەواوی گروپەکانی تر( یەکێك لەو رێبەرانە، بەرپرسی گروپی رزگاریی خەجۆ یەشار بوو، تەنها رێبەری ژن بوو لەنێو گروپە کوردییەکانی ئەوکاتدا) نەك تەنها خۆیان بە رێبەری سەر راستو دروستی بزووتنەوەی کوردیی دەزانی، بەڵکو بە گومانەوە دەیانڕوانییە ئاپۆو ئاپۆچییەکان. چونکە بەدەر لەبەسەربردنی حەوت مانگ لەزینداندا، کە بەتۆمەتی تێوەگلان لە خۆپیشاندانەکاندا قۆڵبەستکرابوو، ئیتر چالاکوانە کوردەکانی گروپەکانی دیکە هیچ ئەزموونو ئەڤینێکی ئۆجەلانیان لە نێو تەڤگەری کوردیدا شکنەدەبرد.

---

[32] Birand, *Apo ve PKK*, 86.

ئەوی ئەم دڵکرمێییەی زێدەتر کرد لە نێو خوێندکارانی زانکۆدا، بریتی بوو لە پلانەکەی ئۆجەلان بۆ شۆڕشێکی کتوپڕ. ئەوە لەکاتێکدا بوو کە چالاکوانەکانی دیی لە گەرمەی گفتوگۆو وتوێژدا بوون بۆ دۆزینەوەی کاتێکی لەبارو میتۆدێکی درووستو ئایدیۆلۆژیایەکی بنچینەیی‌و رەسەن بۆ شۆڕشی کوردستان.

لەگەڵ ئەوەشدا ئۆجەلان سەرەرای ئەو ئەزموونەی کە رووبەڕووی ببویەوە باوەڕی وابوو، ئەو ئامادەیە بۆ ئەوەی رێبەرایەتی راپەڕینێکی سەرکەوتووی کوردیی بکات لە مێژوودا. بۆ ئەمەش چالاکوانە کوردەکان فرە بە ئەستەم ملیان بۆ دابوو.

لە جیهانبینی ئەواندا ئەو کەمتر وەك شۆڕشگێڕێك دەردەکەوت. زێدەتر کەسێکی هەرزەو زیاد لەڕادە توندو تیژو ناکامڵ دەرکەوتبوو. گومان لەوەدا نەبوو کە هەموو ئەو ڕەخنەو رەقییەی گروپەکانی دی ڕیشەدارکرابوون لە نەخشەی ئۆجەلان بۆ سەربەخۆیی کوردستان.

ئەوە بەشێك بوو لە لەمپەرەکانی بەردەم ئۆجەلان بۆ رازیکردنی ئەوانی ترو شوێنکردنەوەی خۆی لە دڵی ئەوانی تردا. لە جیهانبینی تەواوی شۆڕشگێرە تامەزرۆکانی چەپدا، کۆمەڵگەی کوردی زیاد لە پێویست سوننەتی بوون. کەواتە بۆ ئەوەی شۆڕشگێڕێك یان چالاکوانێك لەو کۆمەڵگەیەدا متمانەی پێببەخشرێت، دەبوو بزانرێت سەر بە چ خێڵ‌و خێزانێکەو چ پێشینەو پیشەیەکی هەیەو چالاکییەکانی لە چ مەنزڵێکدا بەگەڕخستووە.

هەربۆیە خانەوادەی ئۆجەلانیش سەر بە هیچ خێزان‌و خێڵکی نەتەوەپەروەرو دیار نەبوون، هاوکات بەدەستبەتاڵی‌و بێ بەدەستهێنانی هیچ پسپۆڕییەك وازی لە خوێندنی زانکۆ هێنابوو. وەڵێ چالاکوانە کوردەکانی نێو گروپە کوردییەکانی تر هەریەك مێژوویەکی زەنگینیان هەبوو چ لە ناو پارتی کاری تورکییدا تا ئەو کاتەی لە کۆدەتای سەربازیدا داخرا، یاخۆ لە ناو یانە کلتورییە شۆڕشگێرەکانی رۆژهەڵاتدا

تا یاساغکردنی لەلایەن میرییەوە(د.د.ك.و) یان پارێزەرو نوسەرو بلاوکەرەوەی چالاك بوون، ئەگەر نا لە خێزانو خانەوادەی بەرزو بەناوبانگەوە هاتبوون[٣٣].

هەروەها پارتو گروپەکانی تر پێوەستییەکی تەواویان هەبوو بە باکگراوندو ریشەیانەوە لە نێو چەپەکانی تورکو کوردو تەنانەت لەگەڵ رێکخراوە کوردییەکان کوردستای ئێراقەوە.

لەبەر ئەوە گرفتی ئۆ جەلان تەنها لەوەدا نەبوو کە تازە بەتازە هاتبووە نێو کایەو کێبەرکێکەوە، بەڵکو ئەو رابردوویەکی نەبوو کە شیاوی ناساندن بێت. تەنها شتێك کە شیاو باسکردنیش نییە، ئەوەبوو کە ئۆجەلان بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە لە نێو (د.د.ك.و) دا وتاربێژێکی دیاری نێو کۆبوونەوەکان بووە، وەلێ گروپەکانی تر ئەو بانگەشەیەی ئۆجەلانیان دایە دوواوە پێیان وابوو ئۆجەلان لەنێو ئەو یانە کلتوریانەدا هیچ بەدەست نەبوو.

ئەم بارودۆخەی ئۆجەلان ئەوەی گەیاند کە ئەو خاڵی بوو لە هەموو بیرو بیرۆکەو قەرزی پێشوو، هاوکات کاریگەریی‌و پێوەندی لەتەك هیچ رێبەرو گروپێکدا نەبوو، بەڵکو ئەو بە ئاسانیو بە پشتبەستن بە بەهرەو بونیادی کەسایەتی خۆی دەستی دایەکارەکەیو لەو نێوەندەشدا کارو چالاکی گروپەکانی تری بە کاری شۆخیو شێتانە دەزانی.

کەمال بۆرکای کە ١٠ ساڵێك لە ئۆجەلان بەتەمەنتر بوو، ئەو یەکێك بوو لە چالاکوانە دیارەکانی کورد، بۆرکای هەر لە سەرەتاوە کارو کردەوەکانی ئۆجەلانی بە چەوتو ناپەسەند دەزانیو سەرلەبەریانی دەدایە دوواوە. بۆرکای پاش لێبوردنی گشتی لە تاراوگە گەڕایەوە تورکیاو کەوتە شوێن پلانو نەخشەکانیو لەو پێناوەدا پارتێکی نوێی بە نێوی پارتی سۆشیالیستی کوردستانی دامەزراند.

---

[33] For a description of the origins of the groups and others

پارتەکە سەربەخۆیی کوردستانی بە هەند وەردەگرت، وەلێ بۆ ئەو قۆناغە ئەو بیرۆکەیەی بە چەوت دەزانی، بڕوایشی بە میتۆدو ڕێبازی ناتوندو تیژیی هەبوو لە خەباتدا. گروپەکە زۆرجار بە نێوی ڕۆژنامەکەیانەوە(ڕێگای ئازادی) نێو زەد دەکران یاخۆ بە پەسەکە، کە کورتکراوەی کوردی نێوی تەواوی پارتەکەبوو. ئەم پارتە لە کۆتایی حەفتاکاندا لەنێو گروپە فەرمییو یاساییەکانی کورددا شوێنی خۆی کردبوویەوە، هەروەها زۆرینەی ئەندامە پێشووەکانی نێو پارتی کاری تورکی لەنێو ئەم پارتەدا درێژەیان بە خەبات دەدا.

کاتێك لە سەروبەندی ١٩٧٦دا بۆرکای بۆ هەوڵجار گوێبیستی نێوی گروپەکەی ئۆجەلان بوو، ڕێك لەوکاتەوە بەگومانەوە لە تەواوی بەڵێنو پلانو پلارەکانی ئۆجەلانی دەڕوانی. بۆرکای هیچکام لە ئەندامەکانی نەدەناسی. هاوکات بە ڕەخنەو پلارە توندو زارەکییەکانی ئۆجەلان نیگەرانو نائارامبوو، کە دەرهەق بە هەموو کەس دەینواندن.

بۆرکای هەموو هاتو هاوارەکانی ئۆجەلانی دەگەڕاندەوە بۆ ئەوەی کە کەسێکی هەلقۆزەرەوەیەو بەکرێگیراوە. ئەو کارەکانی ئۆجەلانی بە بەدترین کار دەزانی بۆ گیانی وردە بۆرجواو مارکسییەکان. بۆرکای هاندنو فشاری ئۆجەلانی بۆ خەباتی چەکداریی بە هەڵەو هەیەجان دەزانی، چونکە پێی وابوو خەڵکی کوردستان هێشتا ئامادە نەبوو بۆ ئەم بەندو بالۆرەیە.

بۆرکای پیاوێکی باڵابەرزو باریکەلە بوو، کاتێك لە نێو بارەگای سەرکردایەتی پارتەکەیدا لە کۆڵن چاوم پێی کەوت پێمی گوت:" دیدگای پارتەکەمان ڕوونو ڕەوان بوو لە مەڕ پرسی خەبات چەکداریی". لەوێ لە ژوورەکاندا چەندین پەرتوکی مێژوویی‌و نامیلکەو گۆڤارو ڕۆژنامەو وتار لە خانەی پەرتوکخانەکەدا هەڵچنرابوون، کە لەلایەن ڕێکخراوی مۆڵەتپێدراوی نوسینگەی ئەورووپای (کۆمکار)وە وەشانکرابوون .

هاوکات چەندین وتاری کۆپیکراوی بورکای کە لە حەفتاکاندا لە تورکیا بڵاوکرابونەوە پارێزرابوون. هەر لەوێدا بۆرکای وتی:" کورد گەلێ جار راپەڕیوەو جاری شۆڕشی داوە، وەلێ هیچکات سەرکەوتوو نەبووە، بۆیە ئێمە باوەڕمان وایە کۆمەڵگەی کوردیی لە سەرەتادا وا دەخوازێت رێکخبخرێت پاشان دەستبداتە خەباتو شۆڕش".

یەکێك لە چالاکوانە دیارو بەرچاوەکانی تری کورد ئەحمەد زەکی ئۆکسوغلو بوو، ئەحمەد زەکی لەگەڵ چاپخانەی کاوە دا مژوڵی کاربوو. بەزوویی نێوی ئەم خانەی بڵاوکردنەوەیە بووە نێوی رێکخراوێکی کوردی پەنهان. ئەو چەند جارێك وارێککەوتبوو چاوی بە ئۆجەلان بکەوێت. چەند ساڵێك پاش ئەوە من (نووسەر) لەتەك ئەحمەد زەکیدا کە لە ترسی بەندکردن وڵاتی جێهێشتبوو، لە یەکێك لە قاوەخانەکانی بەرلیندا دانیشتبووین، ئەو لە باسی ئۆجەلاندا دەیووت:" ئۆجەلان پیاوێکی سادەو زۆر کاریگەر نەبوو، پاش ئەوەی کەمێك گفتوگۆم لەتەك کرد، بۆم دەرکەوت کە لە بارەی مێژووی کورد هیچی پێ نییە". لەراستیدا پلانی ئۆجەلان بۆ دەستپێکی شۆڕشی کوردستان، بەوەدا ژمارەیەکی ئێجگار زۆر لەلاوانی گۆشکرد فرە کاریگەر بوو.

لەکۆتایدا ئیبراهیم ئایدن هاوڕێی بەندیخانەی ئۆجەلان بڕیاری دا پێوەندیی بکات بە ئۆجەلانەوە، ئەمە لەکاتێکدا بوو کە بۆ یەکەمجاربوو وەك مامۆستای راهێنانی لەشو لار دامەزرابوو. وەلێ ئۆجەلان پێداگریکرد کە دەبێت واز لە کارەکەی بهێنێتو لێگەڕێت بۆ کاری پارتایەتی.

ئایدن لەوەڵامی پێداگری ئۆجەلاندا گوتی، بۆ دەبێت لە یەککاتدا هەردوو کارەکان رانەپەڕێنم، تەنانەت دەکرێت کاری مامۆستاییەکەم هۆیەك بێت بۆ یاریدەدانی رێکخراوەکەم.

وەزارەتی پەروەردە ئیبراهیم ئایدنی وەك كارمەند راسپاردبوو تا لە ئاواییەكی توركیای نێزیك لێواری خۆرئاوا كاربكات. وەلێ بەزوویی كاریكرد تا لە شوێنێكی هەرێمی كوردستاندا كاریبۆدیاریبكردێت. لە كۆتایدا بڕیاردرا لە قوتابخانەیەكی باشوری رۆژهەلاتدا بكرێتە مامۆستا، ئەوێ هەرێمێك بوو كە هەمیشە مامۆستا توركەكان خۆیان لێدەدزییەوە. ئیتر لەوێ ئیبراهیم دەستی كرد بە وانەوتنەوەو قسەكردن بۆ خوێندكارو مامۆستا هام پیشەكانی.

بانگەشەكانی ئایدن دەربارەی رێكخراوێك بوو كە تا ئەو كات لەوێندەر نەناسرا بوو، رێكخراوێك كە تێدەكۆشا بۆ رزگاركردنی كوردستان لە كۆلۆنیی دەولەتی توركیا .

بەهێزترین لێدان کە سرەوێنرایە بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد، لەپاش رووخانی کۆماری مهابادی نێوچەی کوردیی ئێران، لە مارسی ١٩٧٥ دا بوو[٣٤]. رێبەری کوردی ئێراق مەلا موستەفا بارزانی، ئەو پیاوەی دلاوەری سەربازیو چاونەترسیی نەتەوەیی پالێپێوەنا تا لەرێگەی خەباتی چەکدارییەوە مافی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردی باکووری ئێراق وەرگرت، وەلێ ئەم جارەیان دوور لە خەباتی چەکداریی لەلایەن بەغدادەوە ناچارکرا بەتەواوەتی دانبنێت بە شکستو ئاشبەتالی شۆرشی کوردیدا لە باکووری ئێراق. ئەوەبوو لە شەشی مارسی هەمان سالدا هەردوو وولات ئێرانو ئێراق لە پەراوێزی کۆبوونەوەکانی ئۆپیك لە جەزائیری پایتەخت، رێککەوتن لەسەر جێگیرکردنی ئەو سنوورانەی نێوانیان کە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ جێگەی مشتوو مری نێوانیان بوون. هاوکات وەك بەشێکی رێکەوتننامەکە، تاران دەستبەرداری ئەو کوردانە بوو کە لەلایەن ئێرانو هاوپەیمانەکەی ئەمەریکاوە بەکاردەهێنرانو پرچەکدەکران بۆ فشارخستنە سەر ئێراق[٣٥].

ئیتر لە ماوەی چەند کاتژمێرێکدا ئێران تەواوی جەنگاوەرەکانی، ئەوانەی شانبەشانی کوردی ئێراق لە جەنگدابوون پاشەکشە پێکرد. هەروەها ئەمەریکایش سەرچاوەی یارمەتییەکانی بۆ کوردی ئێراق وشککردو بارزانی لەژێر رەحمەتی سوپاو سانی سازو راهێنراوی ئێراقدا بێکەسو دەرکرد. کەرەتێکی تر، کوردەکان بۆ پێویسییەکانی گرەوگەلێکی سیاسیی گەورەتر خۆیان لە ژێر پێی ئەوانی دیکەدا دییەوە. لەبەرامبەردا بارزانی ناچارکرا دان بنێت بە هەرەسی شۆرشداو دوو ئەگەریشی لەبەردەمدا دانرا: داوای پەنابەری بکات لە ئێران، لە ئەگەری رازیبوونیدا دەتوانێت هەزاران کوردی هەلهاتوو لە سزای میریی قوتاربکاتو لەگەلێ خۆیدا دالدە

---

[34] *Middle East Quarterly,* June 1994, Vol. I, No. 2; and Ghareeb, *The Kurdish Question,* 160–176.

[35] For details of U.S. assistance, and also aid by Israel, see Ghareeb, *The Kurdish Question,* 138–146.

بدات یاخۆ پەنابەریی یەکێتی سۆڤیەت پەسەند بکات، هەروەك چۆن لە سالأنی پەنجاکاندا دوورخرابوویەوە بۆ ئەوێندەر . دیارە نەزمی ئەو ئۆپشنانە بۆ بارزانی شتێکی نویێ نەبوون، وەلێ ئێستەکانێ ئەو مەردێکی پیرو بەتەمەن بوو، بارزانی نێزیکەی هەموو ٧٢ ساڵەکەی تەمەنی لە بەرخودان لەتەك ئەم ولآتو ئەو ولآتی دیکەدا گوزەراندبوو.

بارزانی تائەوکاتیش ئەوەی نەدەزانی کە دوچاری نەخۆشی شێر پەنجە بووەو تەنها چوارساڵی تر بوونی لە ژیاندا مابوو. هاوکات رووبەرووی بەرهەڵستکارییەکی جدیش بوویەوە لەنێو بزووتنەوەی کوردیی ئێراق دا کە لەلایەن جەلال تاڵەبانییەوە ئاڕاستە دەکرا. ئەو رکابەرێکی ئێجگار جەوان بوو، سەردەمێکی زۆر بەرەنگاریکردبوو لەبەرامبەر هەیمەنەو هێزی بارزانییدا.

ئیتر لەژێر هەموو ئەو فشارانەدا، بارزانی وازیهێناو لێگەڕا بۆ کوڕەکانی ئیدریسو مەسعود تا پاشماوەی پارتەکەی بخەنە ئەستۆی خۆیان. ئیتر بەدەر لە چەند مانگێکی کەم لە ئێران، بارزانی پاشماوەی تەمەنی لە تاراوگەداو لە ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا گوزەراندو هەر لەوێیش لە ١٩٧٩دا کۆچی دوایی کرد.

زەبوونیو گلانی بارزانی لە گۆڕەپانەکەدا وەك شۆکێك وەهابوو بۆ زۆرێك لە نێو تەڤگەری گەشەکردووی سیاسیی کورد لە تورکیا، هەر ئەو رووداوەیش زۆرێك لە گروپەکانی ناچارکرد بچنەوە بە پلانو پاشخانی ئایدیۆلۆژییانداو چاو بە دۆستو دیاریێ دەوروبەریاندا بگێڕنەوە. هێندێك تریش بڕیاریاندا پێویستە زۆر وردتر بن لەئەگەری ئەنجامدانی هەر هەڵوێستێكو بڕیارێکی نوێدا.

هەرچەندە هیچ کەس دەستگرۆی بارزانی نەکرد، لەگەڵ ئەوەیشدا بارزانی ببوە رەمزێکی گرنگو خاڵی پێکەوە بەستنی تەواوی کوردە جوداخوازەکان.

دیار نەمانیشی لە گۆڕەپانەکەدا رێگەی خۆشکرد بۆ ئەوانی تر تا بتوانن درێژە بە ریێو رێبازەکەی بدەن . لە روانینی ئۆجەلاندا شکستی بارزانی ئەوەی

دووپاتدەکردەوە کە هەموو ئەوانە ڕێبازی هەڵەن لە بزاڤی نەتەوەیی کوردییدا. دیسانەوە ڕاستو دروستیو متمانەی بە ڕێبازو ڕێکخراوەکەی خۆی کردەوە.

ئۆجەلان وەك پیاوێکی گەنجی دڵگەرم ئەوەی خستە ڕوو، هەڵەی کوشندەی بارزانیی وەك مەردێکی بەساڵاچوو لەوەدابوو کە ئەو هەمیشە وەك بەشێكو وەك پارێزەری مانەوەی کۆمەڵگەی دەرەبەگی کوردیی وەهابوو، هاوکات پاڵپشتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو ئێرانی نۆکەریی ئەمەریکاوە بۆ چنگخستنی هاوکارییو پشتیوانیکردنی تەڤگەرەکەی. لەوەیش خراوتر، بارزانی لەبری ئەوەی خوازیاری سەربەخۆیی بێت، بانگەشەی خودموختاری کردبوو بۆ کوردستان.

ئۆجەلان هەرەسی شۆڕشی بارزانی وەك بەڵگەیەك لە بانگەشەکانیدا بەکارهێنا، ئەو دەیوت بۆ ئەوەی بتوانی سەرکەوتووبیت، دەبێت سەربەخۆبیتو خۆت لە هەموو زلهێزێك داماڵیت، ئیتر ئەگەر ئەمەریکا یاخۆ یەکێتی سۆڤییەت بێت.

هاوکات هەرەسی شۆڕش ئامازەیەك بوو بۆ هەمووان کە پێویستبوو لە دژی ڕێبەرە هۆزییەکانو خاوەن زەمینەگەورەکان بووەستن، ئەوانەی کە بەشێکی بەرینی کۆمەڵگەی کوردییان مۆنۆپۆڵکردبوو بۆ خۆیان. لە ڕوانگەی ئۆجەلاندا، بارزانی نوێنەری ئایدیۆلۆژیایەکی سەرەتایی بوو، کە بۆ دەیان ساڵ لەتمەی لە بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگەی کوردی دابوو[٣٦].

بەمجۆرە ئۆجەلان هێرشەکانی بۆسەر بارزانی ڕانەگرت. وتار لە دووای وتارو لە هەر دوانگەیەك بیتوانیایە بانگەشەکانی بخاتەڕوو ئەوەی نەدەشاردەوە کە سەرهەڵدانەکانی ڕابردووی کورد لە تورکیا بۆیە شکستیان خواردووە لەبەرئەوەی نە بەئەندازەی پێویست سۆشیالیستی بوون، نەش خەباتکارێکی ڕزگاریخوازیی نەتەوەیی سەر ڕاستبوون.

---

[36] Information on Ocalan's speeches come from the speeches themselves, in Ocalan, *Ilk Konusmalar,* Cilt II; also interviews with former PKK militants active in that period.

هاوكات ئۆجەلان گلەو گازاندەی لە سەروەتمەندانی كۆمەڵگەی كوردیو خاوەن زەمینە گەورەكانیو چینە پشەییەكان گرت لەبەرامبەر ئەوەی دەستیان خستووەتە نێودەستی دەوڵەتی سەركوتكەری تورك، ئەوەیش تەنها لە پێناو بەرژەوەندییە تایبەتییەكانی خۆیانو پایماڵی مافی هەموو ئەوانی تر بوو.

لەراستیدا خاوەن زەوییە گەورەكان رێك وەك خودی دەوڵەت تاوانبارن لە زەوتكردنی مافی سەربەخۆیی گەلی كورد دا.

ئۆجەلان زۆرترین رەخنەكانی كۆدەكردەوە بۆ ئەوانەی وەك ركابەری خۆی دەیبینین. گروپە توركی وكوردییە نوێیەكانی تری وەك كاوە، رێگەی ئازادی، دەدەقەدەو كوك وەك هامدەستەكانو ریفۆرمخوازەكان لە روانگەی ئۆجەلاندا دەستنرابوو بە روویانەوە. ئۆجەلان هەموو ئەوانەی دەدایە دوواوەو پێی وابوو ئەوان لە بەرەیەكی درۆیینەو نادروستدا خواستەكانیان بۆ دەوڵەتی سەربەخۆی كوردیی نومایاندەكەن.

هەروەها بانگەشەكانیشیان بۆ خەباتی چەكداریی تەنها لە چوارچێوەی وەهمو فەنتازیا تێناپەرێتو بیروباوەری چەپگەریشیان وەك نەزمێكی تری بیركردنەوەی فیوداڵیو بۆرجوازیی لە دیدگای ئۆجەلاندا دەدرایە دوواوە. ئۆجەلان ئەوەی نەدەشاردەوە كە ئەو گروپانە وەك پەڵەیەكی رەش لە بزووتنەوەی نەتەوەخوازیی كوردیدا دیارن، سەركردەكانیشیان، لە راستیدا سەركردەی كرێگرتەو نەگریسن. هەموو ئەوانە لە سۆنگەی ئۆجەلاندا لەبەرامبەر هێزو هەوڵە سەرمایەدارییەكانی چینو سۆڤییەتو ئەمەریكاو توركیادا دەستەكانیان لەسەرشانو ملیان كەچ بوو.

لە راستیدا گێچەڵو گوڵمەزی ئۆجەلان بۆ سەر ركابەرەكانی هەمیشە نە لۆژیكی بوو نەش راستگۆیانە بوو. بەگشتی نەتەوەییەكانی كورد نائومێدییان لە بەرامبەر شكستەكانی رابردووداو تواندنەوەی بەتۆپزی لە هەمبەر نەژادو نەتەوەیان، ئەو خەڵكانەی هاندا تا لەبەرامبەر ئەو پرسە ئایدیۆلۆژییەدا راوەستن، كە بۆچی تاوەكو

ئێستا هیچ گروپێکی جوداخوازی کوردیی سەرکەوتوو نەبووە. دورەپەرێزی تەمامی ئۆجەلان لە کەسە دیارەکانی بزووتنەوەی نەتەوەخوازیی کوردیی، بۆ نموونە دوورە پەرێزی ئۆجەلان لە بەرزانی لە ئێراقو کەمال بورقای لە تورکیا وەڵامی ئەو پرسیارەبوو، کە بۆچی هەمیشە کوردەکان لە زیانو زەبری کوشندەدا دەژین.

هۆکارەکە ئەوەبوو کە ئەو رێبەرانە شۆڕشگێڕی کوردی سەر ڕاست نەبوون. دیارە ئەمەیش تەنها روونکردنەوەیەکی ساناو سەرنجڕاکێشەو بەس. لەوەختێکدا رکابەرەکان ئۆجەلانیان تۆمەتباردەکرد بە برەودان بەڕقو کینە، کەچی هەندێك کورد ئەویان لە سەر بەزمو بالۆرە تایبەتییەکەی خۆی کە بانگەشەی سەربەخۆیی دەکرد رادەوەستاند، بەجۆرێك ئۆجەلان ئەو بڕوایەی لای ئەوان چاند کە دەکرێت رێبەرایەتی بزووتنەوەیەکی سەربەخۆ خوازی کورد بگرێتە ئەستۆ بۆ ئەوەی ببنە خاوەنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردیی.

## پەیڕەوان

سەرەڕای کۆتو بەندە یاساییەکان لەمەڕ چالاکی سیاسیی چەپڕەوەکان بەدرێژایی حەفتاکان، هاوکات تەقەلاکانی میریی بۆ بندەستکردنو سەرکوتی زێدەتری شوناسی نەژادیی کورد، توندڕەوەکان بە هەموو مەزهەبو باڵەکانیانەوە گەیشتنە ئەو ئاکامەی کە ئەوان دەکرێت لەگەڵ کەمێك دەستوەرداندا رێکبخرێن. کاربەدەستان لە سەرەتاوە چاوپۆشیانکرد لە هەمبەر پێشکەوتنی چالاکییو بیرکردنەوەکاندا کە بەگوێرەی ئەوەی خەڵك لەبارەیەوە دەدووا، ئەوکات میریی کەمێك نیگەرانی لەبارەی ئەو مشتومڕانە نومایاندەکرد. دیارە کە ئەوەیش بەشێکی لە لوتبەرزیی دەوڵەتەوە بوو. کاربەدەستانی ئاسایشی دەوڵەت باوەڕیان وابوو کە کۆدەتای سەربازی ١٩٧١ هامڕا لەگەڵ زیاتر کۆتوبەندی یاساییو یاسا نوێیەکان هەموو پاشماوەکانی توندڕەویی خۆپیشاندانو بزووتنەوەکانی ١٩٦٨ی تورکیای

سرپیبوویەوە. وەلێ بەزوویی ژینگەو ژوانی سیاسیی فرە گەرمو گورتر لە کۆتایی نیمەی دووەمی حەفتاکانەوە دەستیپێکردەوە.

گرفتەکە لەوەدا بوو کە زۆربەی جار بەرپرسەکان لەرێگەی توندوتیژیو هەیەجانی سیاسیی ناتوندوتیژەوە زاڵکرابوون شۆڕشگێرانی کوردستان لەوانە هەوادارانی عەبدوڵلا ئۆجەلان لە دەوروبەری ساڵی ١٩٧٥ بەنەزمێکی توندوتۆڵ خۆیان لەچوارچێوەی رێکخراوێکی دیاریکراودا مۆڵدا، بەمجۆرە ئەندامانی گروپی ئەنکەرە یان بازنە نێوخۆییەکەی ئۆجەلان لە نێوچەو هەرێمەکاندا دامەزرابوونو دەستنیشانکرابوون. لەوێ هەریەك لەو ئەندامانە بەرپرسبوون لە هاندانو بەرەوپێشەوەچوونی هێڵی کاری گروپە نهێنییەکە. نەزمەکانی ئەندامگیریی نوێ لە ئەنکەرە بوایە یاخۆ لە باشوری رۆژهەلاتی ولات بەوردی سەرنجیان چڕدەکردەوە لەسەر تاك بەتاکی خەڵکی بۆ ئەوەی بتوانن ئەجێندای گروپەکە بەسەر خەڵکیدا بسەپێنن.

ئەندامەکان لەدانیشتنەکانیاندا لەتەك هەموو ئەوانی تردا شەو و رۆژ بیریان دەکردەوە، پێویستە راستەوخۆ مشتومڕ لەبارەی راستو دروستی گروپە نوێیەکەوە بکەن.

یەکێك لە ئەندامە پێشینەکانی گروپەکە ئەوە بیردەهێنێتەوە کە بۆ ماوەی یەك ساڵ بەنێزیکی تەواوی رۆژەکان لە سەردانی هاورێیەکیدا بووە تا بەڵێنی لێوەرگرتووە بۆ ئەوەی پشتیوانی لە گروپەکەی بکات. مەهمەد کان یوجی دەیوت:" کاتێك دەمانووت مژوڵی کارین، واتە کارماندەکرد بۆ گۆڕینی بیرکردنەوەی کەسێك". ئەو بیست ساڵ تەمەنی لە کونجی زینداندا تێپەڕاند، تەنها لەبەر ئەوەی پەشیمانی خۆی پیشان نەدا لەو رۆڵەی کە لە نێو پەکەکەدا بینیبووی. هەروەها وتبووی:" ئەم رەوشە دووچاری رەشبینیو بێزاریمان ناکات، گرنگیش نییە ماوەی زیندان چەند دەخایەنێت، گرنگ ئەوەیە روانگەو رێبازی خۆمانمان گەیاندە ئەوانو

رازیمانکردن، ئەوە بۆ ئێمە زۆر گرنگو گەورە بوو". زۆرجاران ئەم راستییە بۆ رازیکردنی کەسانێك بوو، لەهەوەڵجاردا پێیان بسەلمێنرێت کە ئەوان کوردن. دووەم جاریش ئەو کوردانە خاوەنی مافی دەوڵەتی تایبەت بەخۆیانن، دواتریش گەیاندنی ئەو راستییە بوو کە تەنها کوردە شۆڕشگێڕەکان دەتوانن ببنە خاوەنی ئەو مافەو خەونەکانی کورد بهێننە دی. دواجاریش ئەم نیازو نەزمانەی شۆڕشگێڕیو فراوانخوازیی بۆ برەوی ئایدیۆلۆژیایەکی لەمجۆرە تەنها بە چێکردنی ئەنجومەنی نەتەوەخوازانی کورد مسۆگەر دەبێت.

راستییەکە ئەوەیە کە ئاپۆچییەکان بەڵێنیان دا باسکیان هەڵماڵن بۆ خەباتی چەکداریی، لەبەرامبەریشدا گروپو دەستەکانی تر تازە بەتازە لە مشتومڕو بگرەو بەردەی ئەوەدا بوون کە کەیو چۆنو خەباتی چەکداریی بۆچی؟، دیارە ئەوەیش پەیامێکی روونو رەوان دەبەخشێتو سەلماندنێکی ئێجگار کاریگەرە بۆ گروپەکە.

سەلیم جوروك کایا دەیووت" رامانگەیاند، ئەوە گرنگ نییە تەنها بڵێیت ویستمان خەباتی چەکداریی بکەینو پاشان بچینەوە نێوچەکانمانو ماڵەکانمان بۆ مشتومڕکردن لە بارەی ئەوەوە". سەلیم سەرانسەری باشوری رۆژهەڵاتی تورکیای تەیکرد بۆ بارگاویکردنی خەڵكو کۆکردنەوەی هێزی مرۆیی بۆ گروپەکە، هاوکات لە ساڵی ١٩٧٥ دا وەك خوێندکارێکی ٢١ ساڵ لە خوێندنگەی مامۆستایانی تونجەلی مابوویەوە. لەشوێنێکی تردا دەیووت:" ویستمان لەوە تێبگەین چۆن دەتوانین چەكو چۆڵ چنگ بخەین، هاوکات لەوبارەیەوە مشتومڕمانکردو پاشان چووینە دەرێو ئەوانەمان بەدەستهێنا. کەواتە گرنگی بابەتەکەی ئێمە لەوەدابوو کە چیمان وتو ویستمان بەتەواوی ئەنجامماندا".

لەکاتێکدا کە ئۆجەلانو هاورێکانی وەك خوێندکار نێونووسکرابوون، بەگوێرەی سەرچاوەکان لەلایەن میرییەوە کۆمەکی داراییان کراوە تا لە چالاکییە نهێنییەکاندا کەڵك وەربگرن. ئەوان مژوڵی ئەوەبوون تا لە پێشەوەی خوێندکارە زانکۆییەکانی

دیکەدا شوێنبگرن. ئەو رەوشە بەجۆرێك بوو کە زۆرێك لە خەڵکی ئەنکەرە گریمانەی ئەوەیان دەکرد کە گروپەکەی ئۆجەلان بێئاگان‌و ریشەی کوردایەتی خۆیان فەرامۆشکردووە.

سەلاحەدین جیلیك ئەوە بەیاد دێنێتەوە کە:" لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٥ یاخۆ دەستپێکی ساڵی ١٩٧٦ دا هەندێك لە هاوڕێیان منیان بە ئۆجەلان ناساند". هەروەها دەیووت:" ئێمە هەموومان لە بارەی ئۆجەلانەوە شتێکمان بیستبوو، دەمانزانی ئۆجەلان خوێندکارێکی وردو وریا بوو، هاوکات کاتێك دەدوا کەشێکی سایکۆلۆژی دروستدەکرد. بۆ نموونە تۆ چایەك بۆ ئەو بانگبکەیت، ئەو هەرگیز چایەك بۆ تۆ بانگ ناکات".

بەپێی ئۆجەلان، جیلیك پاوێکی لاوازو کورتە بنە بوو، ئەو ئێستەکانێ لە کۆتایی چلەکانی تەمەنیدایە، جیلیك هێلکەیەکی پاککراو بوو بۆ ئۆجەلان، تەنانەت بەڵێنی دابوو دەستبداتە جەنگێکی راستەقینە لە پێناو سەربەخۆیی کوردستاندا. جیلیك هەردەم بۆ نەتەوەخوازانی کورد هاوسۆزو هاو دەرد بووە. باپیشی دڵبەرێکی سەرسەختی مەلا موستەفای بارزانی بوو. سەرنجی چڕی مشتومڕەکانی ئۆجەلان کورتکرابووەوە لەسەر ئەو خوێندکارە ئەندازیارە.

دواجار بەبێ هیچ دوودڵییەك بڕیاریدا دەستبەئیشکردنبکات‌و پێوەندیکرد بە گروپەکەی ئۆجەلانەوەو لەکۆبوونەوەو نارەزاییەکانی گروپەکەدا کە دژ بەسیاسەتەکانی میریی سازدەکران ئامادەیی هەبوو. لەم بارەیەوە جیلیك وتوویەتی:"ئەم نەزمی بەسیاسیکردنە هیچ بنەمایەکی ئایدیۆلۆژی دروستی لەپشتەوە نەبوو". ئەو ئێستەکانێ لە یەکەیەکی گچکەی ئاپارتمانێکدا لەبەردەم کۆمپوتەرێك‌و لادیوارێك کتێبدا لە کۆلۆنیا ستاریگرتووە. سەبارەت بەو رۆژانە دەڵێ:" رەنگە هاوەڵێکت هەبووایە راپێچی گردبوونەوەیەکی بکردیتایە، یاخۆ بەیادی ئاواییەکەت

بایتایە کە سەربازەکان دەهاتن‌و ترس‌و تەم سەراپای دەتەنیت|، هەموو ئەوانە شتانێکن کە ئامازەگەلێك لەسەرکەسەکان جێدەهێڵن".

هەروەها وەك زارۆیەك لەرۆژێکدا کە تەمەنێکی پێویستت هەبوو، تێگەیشتی کە شتانێك جیاواز دەرچوون، زمانێك کە تۆ پێی دەدوای جیاواز بوو، هەروەها هەموو ئەو جۆرانە لە شتەکانی دەوروبەر هەموو جیاواز بوون".

ئەو ئەندامانەی لە سەرەتاوە پێوەندییان دەکردو دەهاتنە ریزەکانی تەفگەرەوە بریتیبوون لە قوتابیانی زانکۆو خوێندکارانی پەیمانگاکانی مامۆستایان یاخۆ ئەوانەبوون کە لە خوێندن دابڕابوون. هەموو ئەوانەیش بەشێوەیەکی گشتی لە خانەوادە نزمەکان‌و هەژارو کەمدەرامەتەکان بوون یاخۆ ئەو دێهاتیانە بوون کە لە دارای دنیا خاوەنی بستێك زەوی نەبوون.

هەموو ئەوانەیش پێکهاتبوون لە زۆرینەی زۆری کۆمەڵگەی کوردیی‌و ئەو خانەوادانەی کە دەرزنێك زارۆیان خستبووەوە لەتەك دایکانێکی نەخۆنەوار کە فرە بەسەختی ژیانیان لە سەر پارچە زەوییەکی گچکە یاخۆ پەروەردەکردنی مەڕو ماڵات دەچوو بەڕێوە . هاوکات زارۆ ناردنە بەر خوێندنیش بەدەر نەبوو لە چەندین گرفت، ئەوان سەپێنرابوو بەسەریاندا کە زارۆکانیان بنێرنە بەر ئەو خوێندنگە نێوخۆییانەی هەرێمەکان کە راستەوخۆمیریی سەرپەرستی دەکردن‌و دەبوو خوێندکاریش دوور لە خانەو خانەوادەکەی لە قوتابخانە نێوخۆییەکاندا بمێنێتەوە. هەندێك هەواداری گروپ وەك چروك کایا دوورنمای ئیشگەلێکی باشی هەبوو لەکاتێکدا ئەوانی تری وەك چیلیك دارای کارو کاسپییەکی پڕ دەرامەت بوو. ئەوە لەکاتێکدایە کە دروستە بێژین پەکەکە سەرنجی خەڵکانێکی مەحروم لە ژیانی سیاسی‌و ئابووری‌و کۆمەڵایەتی ناو کۆمەڵگەی کوردیی بۆ خۆی راکێشا. ئەوە لە هەوەڵەوە گوێی لێخەوێنرا ئەوە بوو کە کەسانێك هەبوون خۆیان پێگەیاندبوو لە دەرەوەی گیرۆدەبوون بە ژیانی هەژارانەو نەخوێندەواریی دەوروبەرەکەیان. ئەوانە پیاوانێکی گەنج‌و ژنگەلێکی کەمی کەم تەمەنبوون، هەموو ئەوانە لە توانایاندا بوو خۆیان لەو ژیانە کۆمەڵایەتی‌و سیاسیی‌و

فەرهەنگییە کوللە مەرگییەی دەوروبەرەکەیان قوتار بکەن کە دایکو باییان تا ئەوکات بۆ ئەوانیان وێنەکێشابوو. لەراستیدا هەموو ئەوانە فرە جاحێڵبوون بە جۆرێك کە تەمامیان لە بیستەکانی تەمەنیاندا بوون، ئەوان بە زمانە رەوانە تورکییەکەیانداو بە بەرزی ئاستی خۆنەوارییاندا وا گوماندەبرا کە لەنێو کەڵچەرو کۆمەڵگەی تورکیدا توابنەوە. لە دورترین ئەگەردا ئەگەر بوونی ئەوان ئەجێندای ئەنکەرە بوو بێت، وەلێ سەرەڕای فرەترین تەقەلای ئەنکەرە بۆ دەستوەردان لە نەزمە نەتەوایەتییەکانی کورد، لە هەمانکاتدا ئەوە سەلماندنێکی ساویلکانەبوو کە شوناسی کوردی بەکۆمەڵەیەکی ناسیۆنالیستی کوردیو گروپێکی کوردیی بسرپێتەوە.

## ئەوەی لە رێگەکەدا دەگوزەرێ

لە ئێوارەی سەری ساڵی نوێی ١٩٧٧ دا، نێزیکەی ٢٠ کەس لە نێو تەڤگەرەکەی ئۆجەلاندا لە نێوەندی دیکمانی دەوروبەری ئەنکەرە پێکەوە لە کۆبوونەوەیەکی نهێنییدا کە دوو شەوو رۆژی خایاند گردبوونەوە، لەگرنگترین کارەکانی ئەو گردبوونەوەیە بەرنامەرێژی بوو بۆ پرۆگرامی پارتێکی فەرمیی[٣٧]. ئەوان بۆ ئەو مەبەستە رۆژێکی پشوویان هەڵبژارد، چونکە پۆلیس کەمتر لەو رۆژانەدا دەیپەرژایە سەر گومانلێکراوەکان، گەرهاتو پرسو جۆیەکی پۆلیسیش رووبەروویان ببایەتەوە، ئەوا دەکرا بڵێن مژوڵی بۆنەکانی سەری ساڵی نوێن. لەسەر ئەم بنەمایە لەماوەی دووساڵدا توانیان ٢٥٠ بۆ ٣٠٠ ئەندام پێکەوە کۆبکەنەوە، هاوکات پلانیان دانا تا ئۆجەلان چەند میتینگێکی نهێنی بۆ هەوادارە سەرەتاییەکان لە باشوری رۆژهەلاتی کورد نشیندا ئەنجامبدات.

---

[37] This section incorporates information from Celik, who attended the meeting, also the description in Yuce, *Dogu'da,* Cilt I, 371–377, and interviews
with early PKK members and rival figures.

بەم جۆرە کۆبوونەوەی دیکمان تەدارەکی ئەوەی کرد کاربکرێت بۆ دامەزراندنی ڕێکخراوێکی لەبارو پێشکەوتوو، ئەگەرچی ئەو ڕێکخراوە نایاسایش بێت. هاوکات کارکرا بۆ ئەوەی ڕێکخراوەکە خاوەنی دیدگاو ئایدیۆلۆژیای فەرمی خۆی بێت. بەماوەیەکی کەم پاش ئەوە، ئۆج ئالان گەشتێکی ٦ هەفتەیی دەستپێکرد بۆ دێهاتە دوورە دەستەکانی نێوچە شاخاویەکانی کوردستان‌و شارو شارۆچکە پایماڵ‌و خاپورکراوەکانی کوردستان. بە بڕوای زۆربەی ئاپۆچییەکان، ئەوە بۆ هەوەڵ جار بوو ئەوان لەتەك پیاوێکدا کۆببنەوە کە وەك سەرکردەی خۆیان بۆی بڕوانن‌و وەتەو ئاکارەکانی نائومێدو ڕەشبینیان نەکات. " گوێگرتن بۆ وتەکانی ئەو هەستی دڵنیایی لە ناخمدا چاند" ئەمە وتەی یوجی یە کە لە ساڵانی دوواییدا پێ بە پێ ژیانی ئۆجەلان‌و دامەزراندنی پەکەکەی بڵاوکردەوە.

هەروەها لە شوێنێکی تردا دەڵێ:" ئۆجەلان توانای هەبوو پلان‌و باوەڕەکانی بەنەزمێك بڵاوبکاتەوە، کە گروپە ئایدیۆلۆژییەکەی بخاتە ژێرکاریگەریی خۆیەوەو ڕامیانبکات". ئۆجەلان وەك قسەکەرێکی ڕەوان مەبەستی بوو لێبڕاو بێت‌و شیکردنەوەکانی کۆلۆنیالیزم‌و نەگریسییەکانی ئیمپریالیزم‌و تیۆرەکانی لەوەی کە ئایدیۆلۆجیای مارکس‌و ستالین‌و ئەنگلز وەك ڕێبەری بیرکردنەوەکانی دەکرا پێکەوە گرێبدرێن. بەڵام ئۆجەلان هەموو ئەوانەی لە داهاتووی خەباتی کورددیدا کورت‌و پوخت نومایانکردبوو. ئەوە بۆ ئۆجەلان گرنگ نەبوو کە ئایا مشتومڕەکان لەسەر کۆمەڵگەی کوردی گەیشتبوونە ئاستێکی پێویست لە گەشەی ئایدیۆلۆژیدا بۆ دەستپێکی خەباتی چەکداریی یاخۆ ئایا پرسوجۆی ڕەوشی ئابووری کۆمەڵگا لەبار بوو بۆ ململانێی کۆمۆنیستیی یان ئایا پێویستە کەڵك لە تیۆری جیهانی سێ وەر بگیرێت یان نا؟. لەبری هەموو ئەوانە گرفتێك هەبوو. داگیرکاریکردن لە هەرێمیی کوردستاندا هەریەك لە ئیمپریالیزم‌و کاپیتالیزمی پێکەوە گرێدابوو، چارەسەریش بۆ ئەو گرێ کوێرەیە سۆشیالیزم‌و خەباتی چەکداریی بوو.

لەو دەمەدا نۆ یان زێدەتریش لەو ژمارەیە ڕێکخراوی کوردی مژوڵی کارو چالاکی بوون لە تورکیادا. ڕێژەی ئەو گروپانە بەدرێژایی دەهەیەك بە هۆی دابەشبوونی ئایدیۆلۆژییو پارچە پارچەبوونیانەوە بەردەوام زیاد دەبوون. هەموو ئەو ڕێکخراوانەیش، بەلایەنی کەمەوە لە تیۆرەکانیاندا پشتیوانییان لە دەوڵەتی کوردی سەربەخۆ دەکرد. زۆرینەشیان پێیان وابوو کوردستان دابەشکراوە بەسەر چوار دەوڵەتی داگیرکەر (ئێران، ئێراق، تورکیا، سوریا). لەو ڕێکخراوانەشدا هەبوو بڕوای وەها بوو بەشێکی کوردستانی دابەشکراو لەلایەن یەکێتی سۆڤییەتەوە کۆلۆنیکراوە. هەریەك لەو ڕێکخراوانەش نەزمێکی سۆشیالیزمیان لە کوردستاندا برەو پێدەدا، کەوەك هیوایەك بۆ دەوڵەتی کوردیی پشتیان پێبەستبوو. دیارە هەموو ئەوە لە نێوەرۆکی پێڕەو و پرۆگرامیاندا ئاماژەیان پێدابوو، لەگەڵ ئەوەیشدا جیاوازی ئێجگار توونت لەنێو گروپەکاندا سەریهەڵدابوو.

هەندێك لەو گروپانە پشتیوانییان لە مۆدێلی ماویزم دەکرد لە خەباتی سیاسییدا، لە کاتێکدا ئەوانی تر ستالینی یاخۆ سەربە ڕەوتە جیاوازەکانی تری چەپی ڕادیکاڵو توندڕەوبوونو ئایدیۆلۆژیای بنچینەییان لە هەستو سۆزی سیاسییاندا کاری لەسەر دانرابوو، بۆنموونە: هەندێکیان هەواداری سۆڤییەت بوون، هەندێکی تر هەواداری ماو بوون، یەکێکیش نەیاری هەردوو سۆڤییەتو ماوچییەکان بوو، بەڵکو بڕوای بە نەزمی شۆڕشی چینییەکان هەبوو، وەلێ پشتیوانی لە ئەلبانیا دەکرد لە خەباتی سیاسیی چەپرەویداو پێیان وابوو هەر دەستبەرداربوونێك لەو باوەڕەدا سەرلێشێوانی سیاسیی بەدووادا دێت.

جگە لە پارتەکەی کەمال بورکای، پارتی سۆشیالیستی کوردستان (پەسەکە) بۆ سەربەخۆیی کوردستان پشتگیری خەباتی چەکداریی نەدەکرد. بەتێکرا لەو باوەڕەدا بوون کە خەباتی چەکداریی پێویستییەکە بۆ هەموو ئەوانەی خواستی ئازادییان هەیە لە باکوری کوردستاندا. هەرچەندە لە تیۆری پارتەکەی بۆرکایدا

دژایەتی نەزمی چەکداریی نەکرابوو، وەلێ ئەو باوەڕە چاندرابوو کە شەڕی چەکداریو ڕووبەڕووبوونەوە لە تورکیادا هێشتا زەمینەی بۆ نەڕەخساوە[38].

لەم ژینگە ئاڵۆزو ئاستەمەدا، بۆ نەتەوەییە کوردەکان ئاسان نەبوو، کە کێ هەڵبژێرن بۆ ئەوەی وابەستەی بن‌و شوێنی بکەون. وەلێ ڕەوانبێژیو ئەدای ئۆجەلان ئاماژەی دابوو بە جۆرە نەزمێکی سیاسی لە خەباتی چەکداریدا کە لە نێو تەڤگەرو گروپەکانی تردا پەی پێنەبرابوو.

ئۆج ئالان و ئاپۆچییەکان تیۆریزەیان کردبوو کە سەرکوتی توندی کورد لە پاش شکستی یاخی بوونەکانی بیستەکان‌و سییەکانی رابردوو، خەڵکی دووچاری ترس‌و دڵەڕاوکێیەکی ئێجگار زیاد کرد بوو، هەربۆیە ئاسان نەبوو بۆیان جارێکی تر پێوەندی بکەن بە هەر ڕاپەرینێکەوە. بەمجۆرە بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو ڕەوشە، هەرچییەك پێویستکرابوو و هەرچی لەتوانایاندا بوو پێیانکراو ئەنجامیاندا. ئیتر هەر زوو خەڵکی بۆیان ڕۆشنبووەوە کە گروپەکە چەندە پەرۆش‌و پرتاون لە یاخی بوونی چەکداریداو پشتیوانی هەر جەنگێك دەکەن لەو پێناوەدا. "گەر خەڵکی نەریتی تایبەت بەخۆیان توند دەستپێوەبگرن‌و زمانەکەیان بخەنەگەڕ، ئەوا فەرهەنگ‌و کەلتووریان زیندوو دەمێنێتەوە، دیارە ئەمەیش بەرهەڵستکاریو ئازادیخوازییە، وەلێ مەزنترین ئازادیخوازیو بەرهەڵستکاریی، بەرهەڵستکاریی چەکدارییە". ئەوە یەکێك بوو لە وتەکانی ئۆجەلان کە لە ساڵی ١٩٧٧ دا لە ئەلازیگ ڕایگەیاندو ئەم وتانە دوواجار بوونە بنەمای هەوەڵ نامیلکەی بڵاوکراوەی ئایدیۆلۆژیی گروپەکە[39].

یەك لەدووی یەك وتەکانی ئۆجەلان دەستپێکی هێزو پێزی سەرەتاکانی گروپەکە بوون. ئۆجەلان خۆی لە هەموو کێبەرکێکارەکانی تەنها بەوە جیانەدەکردەوە کە

---

[38] For a breakdown of the groups and their ideologies, see Imset, *the PKK*, 380–398.
[39] Ocalan, *Ilk Konusmalar*, Cilt II, 84.

سوربوو لەسەر ئەوەی راپەڕینی چەکداریی راستەوخۆ دەستپێبکات، بەڵکو ئۆجەلان لە رێگەی برەودان‌و هاندانی توندوتیژییەوە کاریدەکرد بۆ بواردنی هەر تەڵەزگەو پەرژینێکی بەردەم گۆڕانکارییەکان. دیارە بایەخدان‌و سەرنج کۆکردنەوە لە سەر جەنگ‌و جەڵەبە دارای لۆژیکێکی دڵنەوا بوو کە هەلومەرجی سیاسیی ئەوکات لە پشتییەوە بوو.

سیستەمی دێموکراتیی تورکیا نە کاری کردبوو بۆ ئەوەو نەیش دێموکراتییانە دارێژرابوو. بۆیە بۆ نەتەوەییە کوردەکان ئەستەم نەبوو گەر هەموو ئەو هەولانە بدەنە دوواوە کە خواستی کارکردنی یاساییان هەیە لە ولاتدا.

پشێوییە سیاسییەکان کە لە کۆتایی حەفتاکاندا تەواوی ولاتیان داپۆشیبوو، ئەمەیش هۆکارێك بوو تا گروپە کوردییەکان‌و رەوتە چەپەکان لەو بگرەو بەردەیەدا سەردەربێنن‌و ببن بە بەشێك لە رووداوەکان. هەرچەندە چالاکییەکانی وەك نوسین‌و بانگەشەکردن بۆ دەوڵەتی کوردیی لەتەمتومانی ئەو رۆژگارەدا هەر بە قەدەغەکراوی مابوویەوە. چالاکوانانی کورد کەمێك دەرفەتیان هەبوو. بۆ نموونە گەر بیانویستایە برەو بە بیروڕاکانیان بدەن، تەنانەتە ئەگەر لە گۆڤارێکیشدا بێت. ئەوا پێویستبوو یاسا شکێنی بکەن . پاش ماوەیەك، نەوجەوان‌و لاوانی کورد ئەو هەستەیان لەلادروست بوو کە لەخۆیان بپرسن، بۆچی ئەوان پێویستە توندی زیندان بکرێن لەپێناو دەرکردنی گۆڤارێك یاخۆ نوسینی بابەتێك. لەکاتێکدا ئەوە دیارە کە مەترسییەکانی تفەنگێك فرە کاریگەرترە ."پەکەکە فرە بەباشی لە فسیۆلۆجیای تاکی کورد حاڵی ببوو، ئەوان تێگەیشتبوون مەردوم چەند لاوازو کزۆڵن، هەربۆیە ئەوان پێویستە چەکداربکرێن" ئەوە وتەی حوسەین تۆپگیدەر بوو، حوسەین لەساڵی ١٩٧٨ لە پارتی دێموکراتی کوردستانی تورکیا جیابویەوەو پێوەندی کرد بە ئۆجەلانەوە. گروپەکانی تر بەردەوام بوون لە سەر ئەو نەهجەی کە لەپێشدا پێویستە بیربکەیتەوەو گفتوگۆبکەیت‌و پێشبکەویت‌و هەست‌و هۆشت لاگەلاڵە بێت

پاشان خۆت ڕێکبخەیت. وەلێ لەو قۆناغەی تورکیادا پێویستی دەکرد پێش هەموو شتێك چەکداربیت بۆ ئەوەی هەموو شتێك دەستەبەر بکەیت.

## کردار

لەگەڵ ئەوەی بانگو فیغانی ئۆجەلان بۆ جەنگ لەلای شۆڕشگێرانی کوردستان لە دەستپێکی کاردا تەنها بۆ شالاو بردنە سەر ڕەوتە چەپەکانیانو کێبەرکێکارەکانی کورد بایەخدار بوو ، نەك بۆ ئەوەی شالاو بەرنە سەر دامەزراوە میرییەکان[40]. لەسەرانسەری هەرێمە کوردییەکاندا، ئاپۆچییەکان زیاد لە ڕادە تێروانینێکی ناهەموارو مەمەڵەیەکی ڕەقیان لەبەرامبەر گروپەکانی تر گرتبووە بەرو پێکدادانی چەکدارییان پێڕەو دەکرد.

هەموو ئەو جەنگانە لە ئاکامی بەیانی لێکتێنەگەیشتنو نارۆشنو گفتوگۆی لە کۆنترۆڵ دەرچووەوە یاخۆ هەوڵی چەند لایەنێك بۆ دەنگدان بە بەرەیەك زێدەتر هەڵدەگیرسانو برەویان پێدەدرا. بەشێوەیەکی سەرەکی بۆ هەڵگیرساندنی هەر جەنگێك ئەوە بەس بوو کە گروپێکی کێبەرکێکار چەلاك بووایە، لەهەمان ئەو شارۆچکە یان ئاواییەی کە لەوێ شۆڕشگێرەکانی کورد مەبەستیان بوو شوێن پێی خۆیان راگیربکەن.

وتارەکانی ئۆجەلان، هەندێك لەوانە کە پارێزراوبوونو بڵاوکرابوونەوە، ئەوەیان نومایاندەکرد کە زۆر بەچاوێکی سوكو سرکەوە تەماشای نەیارەکانی دەکرد. ئەوە لەکاتێکدا بوو کە لەوانەیە ئەو فەرمانی نەکردایە بۆ هەموو هێرشەکانو سەرزەنشتی ئەو کارانەیشی نەدەکرد لەکاتێکدا کە ڕوویاندە دا. لەهەمانکاتدا

---

[40] This section relies heavily on interviews with former PSK leader Kemal Burkay, former Rizgari member Kamuran, former KUK militant Selahattin,
and former PKK militants active in the southeast then.

ڕێکخستنە پەرتو بڵاوەکانی شۆڕشگێڕانی کوردستان، ئاسانکارییانکردبوو بۆ ئاپۆچییەکان تا بە سانایی ئەندامەکانی ئەو ڕێکخستنانە دەستەمۆی خۆیان بکەن‌و بیروڕای بەرپاکردنی خۆیان وەك تەنها هێزی نێوچەکە بەنەزمێکی لۆژیکی پێشچاوبخەن.

ئاپۆچییەکان بەسودوەرگرتن لە دیدگای لینینییەکان نەیارەکانی خۆیان وەك ڕێگرییەك دەبینین بۆ ئەوەی فەرمانرەوایەتی پارتەکەی خۆیان دەستەبەر بکەن، هەربۆیە بەردەوامیی نەیارییەتی هەمووانیان بە پێویستییەك دەزانی لە پێناو شۆڕشێکی سەرکەوتوو دا. هەر لەو ماوەیەدا گروپەکانی دیکە لە هەوڵ‌و تەقەلای ئەوەدابوون کە گەل ئامادەبکەن و هۆشدارییان پێبدەن لە پێناو شۆڕشدا ، هەموو ئەوانەیشیان لە ڕێگەی گرتنی کۆڕو میتینگەکانەوە رادەپەڕاند.

ئاپۆچییەکانیش هەوڵیاندابوو کایەکە روونبکەنەوە، بۆیە ئەوان توانیان شۆڕشەکە دەستپێبکەن. ئەم زەمینەیە هەموو ئەم رەوتانەی لەخۆگرتبوو: گروپە راستڕەوەکان کە برەویاندەدا بە ناسیۆنالیزمی تورکیی چەکدار. گروپە کوردییە چەپڕەوەکان کە دژ بوون لەگەڵ نەتەوەگەراکانی کورد. لە هەمانکاتدا گروپە کوردییەکانیش ڕێگەیان نەدەدا بوار لەبەردەم ئاپۆچییەکاندا بکەنەوە. لەم رەوشەدا تێکگیران بە چەك‌وچۆڵ یاخۆ بە شێوەی دەستەو یەخە دەبووە ئەگەرێکی چەمەڕوانکراو. هەموو ئەم بگرەو بەردانە بۆ ئەوە بوو تا بتوانن خۆیان لەو رەوشە دژوارەدا رابهێنن‌و هەموان مژوڵی ئەوە بوون بتوانن لە پێچی چاخانەیەکدا یاخۆ لە قوتابخانەیەکدا مقۆمقۆ لەسەر بیروباوەڕو بانگەشەکانیان بکەن‌و خۆیان لە زەبرو زیانی یاسا توندەکانی رژێم قوتار بکەن.

موحەمەد جان یوجی لەم بارەیەوە وتویەتی:"لەم قۆناغەدا لەنێو تەواوی تەڤگەرە چەپەکاندا بەتورك‌و کوردەوە، هەمیشە پێداگرییان لەسەر ئەوە دەکرد کە تەنهاو تەنها دیدو تێڕوانینی خۆیان دروستەو روانینی هەموو ئەوانی تر قەڵس‌و

قێزەونە" موحەمەد یوجی پاش ئەوەی لە پەکەکە دابڕاو جودا ببوەوە لەلایەن هامسەنگەرە پێشووەکانییەوە لە ساڵی ١٩٩٩ دا هەوڵی غافڵکوشتنی درا. " لەبەشێکیتری بۆچوونەکانیدا رووی دەمی دەکاتە پێرەوانی پەکەکەو دەڵێ:"جیهانبینیی ئێوە وابوو، هەر بۆچوونێك لەدەرەوەی تێگەیشتنتان بێت بۆچوونێکی خوارو خێچە، لە راستیدا ئەم نەزمە خاسترین یاریدەدەری بۆرجوازییەت بوو لەو قۆناغەدا، لەکاتێکدا ئێوە رق‌و کینە بەرچاوی تاریك کردبوون‌و رەوایەتی ئەوانی دیتان نەدەبینیی‌و پێتان وانەبوو کەسانێکی تر هەن کە مافیان هەیە تاوەك ئێوە بژین ". دەرگیریی‌و جەنگ لەنێو گروپە چەکدارەکانی کورد هەوڵ‌و هەرەکەتێکبوو لەهەمانکاتداو لەسەرانسەری هەرێمەکەدا بەرێوە دەچوو، لەم رەوشەدا ئۆجەلان‌و ئاپۆچییەکان دەبوو لەدووی کونج‌و کەلەبەرێکەوە بن تا لەنێو سنوورەکانی باکووری ئێراقدا جاپایەك بۆ خۆیان جێگیربکەن.

ئەوێ دەمێ پێوەندییەکان لەنێو چالاکوانە کوردییەکاندا بەتەمامی تێکچووبوون، بەتاییەتی لەدوای پیرۆزیی‌و زاڵبوونی بەغداد بەسەر رێبەری پارتی دێموکراتی کوردستانی ئێراق مەلا موستەفای بارزانی لە ئازاری ١٩٧٥ دا[41]. لەم کەینو بەینەدا جەلال تاڵەبانی نەیارە سەرسەخت‌و لەمێژینەکەی بارزانی توانی بۆشایی هێزو پێزی پارتی بقۆزێتەوەو رێکخراوێکی ئاراستەدارتر بە بنەما سۆشیالیستییەکان بە نێوی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ( ی ن ك ) دا بمەزرێنێت.

دیارە جێنشینانی بارزانی لە ناو ئەواندا هەردوو نەوەکەی بارزانی، ئیدریس‌و مەسعود هاوکات سامی عەبدوڕەحمانی بەرپرسی باڵای پارتەکەی دڵخۆش نەبوون بە هەڕەشەیەکی لەم جۆرە بۆ سەر بنکەی هێزو جەماوەری پارتەکەیان. لە راستیدا پارتی جارێکی تر بە شێوەیەکی فەرمی لە ساڵی ١٩٧٦ دا خۆی رێکخستبوەوە.

[41] Description of KDP-PUK conflict taken from McDowall, *Modern History,* 343–345.

ئیتر لێرەوە پێکدادان لەنێوان ئەم دوو گروپەدا لە کوردستانی ئێراق بە سەختی هەڵگیرسا. لەم جەنگە نێوخۆییەدا تاقمەکەی تاڵەبانی سێ جار رووبەڕووی هێرش‌و هەڵمەتی مەرگبارو کوشندە بوونەوەو زەبری کوشندەیان بەرکەوت، ئەمە لەکاتێکدا پیاوانی تاڵەبانی هیچ فرسەتێکیان بۆ تۆڵەو تەمبێکردنی نەیارانیان بۆ هەڵنەکەوت. تاڵەبانی لە بەهاری ۱۹۷۸دا پلانی دانا تا هەڵبکوتێتە سەر بارەگاو بنکەکانی پارتی، وەلێ هەرزوو نیازو نەخشەی کارەکانی کەوتە دەست سامی عەبدوڕەحمان. ئیتر هێزەکانی یەکێتی کەوتنە مەتەریزی سەنگەرەکانی پارتییەوە، پارتی داوی دانابوو بۆ هێزەکانی یەکێتی، هێزەکانی یەکێتی لە ژێر پەردەی هێنان‌و بەدەستڕاگەیشتنی چەک‌و چۆڵی قاچاغ هێنراو ملیان بەرەو سنوورەکانی پارتی نابوو. لە ئاکامدا ژمارەیەکی ئێجگار زۆر لە جەنگاوەرانی یەکێتی پێوەبوون‌و لەنێوبران. هاوکات دوان لە بەرپرسە بالاَکانیشیان بەفەرمانی سامی عەبدوڕەحمان لە سێدارە دران. لە راستیدا ئەم پێکدادانانە یەك لە هۆکارەکانی نەفرەت‌و بێباوەڕی‌و کینەی نێوخۆیی بوو لە نێوان گروپە کوردییەکانی باشووری کوردستاندا کە بە بە بەردەوامی تا کۆتایی نەوەدەکان شۆڕببوویەوە.

هاوکات ئاپۆچییەکان زۆر بێ پەروا گەشەیانکرد، بۆ نموونە ئەوان هێزە ئاسایشییەکانی میرییان لە هەموو روویەکەوە بەهۆی زێدە بوونی چالاکییە چەکدارییەکانیان دەستە پاچەکردبوو، هاوکات لە پارتە نەیارەکانیان زیاتر رێکخراوتربوون‌و لە رووی تیۆریی‌و پراکتیکەوە زیاتر بەرەو پێش چوون‌و زەبری کوشندەیان لە زۆربەیان وەشاند. نەیارانی ئۆجەلان دەیانووت:" دوژمنایەتی بێ گرێ‌و گۆڵێ‌و یەکبینی ئۆجەلان ئەو تاڵیەی سەلماند کە ئۆجەلان زیاد لە راست‌و ناسیۆنالیستەکان مایەی هەڕەشەو گوڕەشەیە". ئاپۆچییەکان هێرش‌و هێزەکانیان بەگەرخست تا بۆ هەمووانی پیشانبدەن ئەوان سوورن لەسەر رزگارکردنی کوردستان‌و هیچ هێزو تێزێکیش ناتوانێت لە پێش هەنگاوەکانیاندا ببێتە کۆسپ‌و

لەمپەر. سەلیم چروککایا وتبووی:" ئێمە بڕوامان بە سۆشیالیزم هێنابوو، ئەوەیش شێوەیەکی ستالینی بوو لە سۆشیالیزمدا کە ئێمەی لەسەر گۆشدەکرا" . ئەو نەهجە بوو کە ڕەوایەتیان لێوە وەردەگرتو ئەندامانی پێشووی پەکەکە بەکاریاندەهێنا بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی بۆچی لە کۆتایی هەفتاکاندا لەبری ئەوەی جەنگ لەدژ تورك بەرپابکەن ئالأبوونە سەرکوتو سەربڕینی پارتو گروپە کوردییەکانی دی". هەروەها وتبووی:" ئێمە هەمان مۆدیلو مۆراڵی بیستەکانی پارتی کۆمۆنیستی ڕوسیامان هەبوو . وەك ئەوان چۆن خۆیان لە هەموو پێڕو گروپو پارتەکان پاککردەوە، ئێمە ئەو ڕێگەیەمان بە دروستو دەگمەن دەزانی، هەربۆیە هەوڵماندا هەمان ڕابردووی ئەوان دووبارە بکەینەوە".

## خۆشەویستی

عەبدوڵا ئۆجەلان لە ساڵی ١٩٧٨ دا ژیانی هاوسەری پێکهێنا، هاوسەرەکەی کیژە زانکۆییەکی خوێندکاری تەمەن ٢٥ ساڵ بوو، بە نێوی کەسیرە یەڵدرم ناسرابوو. کەسیرە هەوەڵین ژنێك بوو کە پشتیوانی لە گروپە کوردییە ساواکە بکات. ئەو خاتونێکی قژ ڕەشی سەنگو سەلار بوو، لەگەڵ ئۆجەلان فرە جیاواز بوو ، ئاپۆ پەروەردەیەکی دێهاتیانەی هەبوو، وەلێ ئەم لە خێزانێکی پلە ناوەندی کوردییەوە پێگەیبوو[42]. بابی پێی ڕاگەیەنرابوو تاببێتە ئەندامی هەرێمی ڕەوتی پاتی گەلی کۆماریی. پارتی گەلی کۆماریی ئەو پارتە بوو کە ئەتاتورك دایمەزراندبوو.

خێزانەکەی لە شارۆچکەکەیەکی سەر سنوریی نێوچە کوردییەکان بەنێوی کەراکوکان ژیانیان دەگوزەراند. کەسیرە وەك نۆبەرەی خێزانەکەیان لەلایەن

---

[42] Factual details of Yildirim's life are drawn mainly from Yuce, *Dogu'da*, Cilt I, 327–371; and Ocalan's comments in *Dirilisin Oykusu*. Interviews with Celik, Yuce, and Arslan also were helpful, as were sections of Celik's *Agri*, especially
149–153.

بابیەوە پشتیوانی دەکرا تا خوێندنەکەی تەواو بکات. دواتر لە پەیمانگەی مامۆستایانی ئلازیگ خۆی بینییەوە، پاشان سەرکەوتوو بوو تا لە سکوڵی رۆژنامەگەری زانکۆی ئەنکەرە توانی کورسییەك داگیربکات. ئیتر لێرەوە چیرۆکی ژیانی لەگەڵ ئۆجەلان دەستپێدەکاتو بەیەکتر ئاشنا دەبن.

ئەم هاوسەرگیرییە لەکاتێکدا بوو کە ئاپۆچییەکان پێیان وابوو هاوسەرگیریی پرۆژەیەکی بۆرجوازییەتە بۆ لاوازو مژوڵکردنی گەلو دورخستنەوەیانە لە نەبەردو جەنگ. سەلاحەدین جلیك لەم بارەیەوە وتوویەتی:"لە هەوەڵەوە یاسایەك لە گۆڕێدا هەبوو بۆ دژایەتی هاوسەرگیریی، یا گەر ئەو پرسە نەخرابێتە چوارچێوەی یاسایەکیشەوە، دەتوانین بڵێین ئایدیایەك یاخۆ شێوە بیرکردنەوەیەك هەبوو دژی ئەو پرۆسەیە". لەوێندەر خۆشەویستیو ئەویندارى شتێکبوو بۆ وردە بۆرجواکانو پێویستییەکی ئەوتۆ نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا بەشێك لە ئەندامە بەراییەکانی پەکەکە هاوسەرگیرییان کردبوو. هەندێك وەك ئۆجەلان هاوسەرگیرییان لەتەك پێڕەوانی پەکەکە کردبوو، وەلێ ژیانی نائاسابیو ناياساییان زۆر بەزەحمەت مانەوەی پێوەندییە کلاسیکییەکانی لەنێوانیاندا زیندوو راگرتبوو.

ئۆجەلان هەستو نەستێکی تێکەڵو پێکەڵ لەمەڕ هاوسەرگیرییەکەی نومایاندەکات. هەندێکیش پێیان وایە هاوسەرگیرییەکەی ئۆجەلان لەتەك خاتو کەسیرە بۆ ئەوە بوو تا رێگە لەپێش کەسیرەدا واز بکات چالاکییە سیاسییەکانی لە کوردستاندا ئەنجامبدات، چونکە بۆ ئافرەتێکی لاوی کچ مەحاڵ بوو گەشتکردنو هاموشۆی شارو شارۆچکەکانی کوردستان. ساڵانی دوواتر پاش ئەوەی یەڵدرم لە پەکەکە جودا بوەوە، ئۆجەلان لە بارەی ئەوەی بۆچی لەتەك خاتوو کەسیرەدا هاوسەرگیریی کردبوو پاساو گەلێکی تری خستە روو. بەشێوەیەکی سەرەکی ئۆجەلان دەڵێ ئەوم هێنا تا بتوانم بیپارێزمو دوریخەمەوە لە پەیوەندییەکانی خێزانەکەی لەتەك میریدا. هاوکات ئاماژەش بۆ ئەوە دەکات کە بەراستی خاتو

کەسیرە خانمێك بووە سیحرو سەرنجی لە سەر ئۆجەلان داناوەو لەنێو پێڕەوانی پەکەکەدا بەتەواوی نێوبانگی وەك خانمێکی بەهۆش‌و جوان‌و کارامە رۆیشتبوو. ئۆجەلان لە پاش جودا بوونەوەیان ئەوە نومایان دەکات، کە هەرگیز رەچاوی ئەوەی نەکردووە کە رۆژێك لە رۆژان پێوەندییەکانیان شکست دەهێنن. هەروەها دەڵێت:" من راکێشرابووم بەرەو هەست‌و ئەوینێکی بێسنوورو پاشان زەواج"[43]. هەندێك لە پێڕەوانی ئۆجەلان هیچ کەیفخۆش نەبوون بە پێوەندیی ئۆجەلان‌و خاتو کەسیرە. لەراستیدا جیا لەو باوەڕەی کە هاوسەرگیرییەکە بە گوێرەی خەباتی شۆڕشگێڕیی ئەویێ دەم خواستێکی نابەجێ‌و نادروست بوو ، هاوکات ئاپۆچییەکان لە مەڕ پاشخانی خاتوو کەسیرەیش دڵکرمێ‌و واسواسبوون. چوون دەوترا قەوم‌و قەبیلەی خاتوون لە کۆتایی بیستەکان‌و سییەکاندا و لەوەختی یاخی بوون‌و هەستانی خەڵکی کوردستاندا تێکڕا هام دەست‌و دڵ بوون لەتەك میریداو تەنانەت بابیشی لە کارو باری سیاسیی میریدا دەستی تێکەڵکردبوو.

لە سەرگوزشتەکەی خۆیدا بۆ دامەزراندنی پەکەکە، یۆجی ئاماژە دەکات کە شۆڕشگێرەکانی تر ئەو هەستەیان لادروستبیوو کە کەسیرە بێ لامو جیمی هەڵسوڕاوی دەوڵەتە، ئەو لەم بارەیەوە دەڵێت:" زارۆی پۆلیس دەبێتە پۆلیس‌و زارۆی پارێزەریش پارێزەرە"[44]. رەنگە ئەم رەوشە لە بەرژەوەندی کەسیرەدا نەبووایە، چوون خانەوادەکەی زۆر باشتربوون لە زۆرێك کە لەنێو گروپەکەدا بوون، ئەو لە رووکەشێکی سادەی ژیانی هاوسەرگیرییدا خۆی نومایان دەکرد، هاو کات لە گلەو گازاندەکانی یوجی دا هاتووە کە ماڵ‌و حاڵی کەسیرە زۆرتر لە وردە بۆرجوایەکی ئەکرد تا لەوەی لە ژیانی گەریلایەکی شۆڕشگێڕبکات[45]. ئۆجەلان‌و خاتوو کەسیرە خاوەنی ئیرادەو ئومێدێکی بەهێزو نەستیلەو هۆشیاربوون، هاوکات

---

[43] Quoted in Yuce, *Dogu'da,* Cilt I, 356.
[44] Ibid., 356.
[45] Ibid., 361.

ئێجگار شۆڕشگێڕو بە ویقار بوون. ئۆجەلان دەیوت:" لەبری ئەوەی فێربێت ئارام بێتو لەسەرخۆبێت، فێربوو هۆشیارو بەئاگابێت، لەبارەی کەسیرەشەوە دەیوت:" من ئەوم لەماڵ نەکردە دەرێ، بەڵکو زۆرجار من لە ماڵێ هەڵدەهاتم"[46].

هەندێك لە پێڕەوانی ئۆجەلان زۆر قەڵس و نیگەران بوون لە مامەڵەی کەسیرە لەگەڵ ڕێبەرەکەیاندا، ئەوان هەڵسوکەوتی خاتوو کەسیرە لەبەرامبەر ئۆجەلاندا جۆرێك لە بێڕێزیان لێدەخوێندەوە. هەر بۆیە ئەوان غایەلەی ئەوەیان بۆ دروستبوو کە خاتو کەسیرە غافڵکوژ بکەن، وەلێ هەر زوو لەم پلانە دوورکەوتنەوە چونکە پێیانوابوو ئۆجەلان ملنادات بۆ بڕیارێکی وەها شێوە. وەلێ هەمیشە ئۆجەلان ئەوەی وەك بەڵگەیەك لە تین و توانای دیموکراسیانەیدا دەهێنایەوە کە ئەو ناتوانێت بەرگری لە هیچ شتێك بکات تەنانەت لە ژنێك کە هاورێکانی خواستیان هەبوو لەنێوی بەرن. هاوسەرگیرییەکەی ئۆجەلان بەزوویی هەڵوەشایەوە. لەناوەراستی هەشتاکاندا هەردوو بەتەواوی لێکجودابوونەوەو بە گوێرەی زانیارییەکان ئۆجەلان لە ساڵی ١٩٨٨ دا گیرۆدەی داوی ئافرەتێکی تر ببوو. تا ئەوکاتیش خاتوو کەسیرە لە ئەسینا وەك هەڵسوراوێکی پەکەکە خۆی نیشاندەدا، ئەو لەوێ هەوڵیدا هەستێت بە ئەنجامدانی کۆدەتایەك بەسەر شووەکەیدا، وەلێ نەیتوانی و لە پلانەکەیدا شکستی هێنا.

دووا بەدوای ئەوە ئیتر خاتوو کەسیرە دەنگ و رەنگی نەماو گومە ساربوو، ئەو دەم دەنگۆی ئەوە بلاو بوەوە کە ئۆجەلان توانویەتی هاوسەرەکەی لەبەرامبەر پێدانی برە پارەیەك و بەڵێنی لێگەڕانی تا زیندوو بێت رازیکردووە بە بێدەنگی بمێنێتەوە. تاوەکو ئێستایش ڕێبەری پەکەکە خیانەتی هاوسەرەکەی لەیاد نەکردووە. هەربۆیە ژیانی کەسیرەو هاوسەرگیرییەکەیان لە زیهنی ئۆجەلان و پەکەکەدا وەك چەکێکی ستراتیژیی لە ئەزموونپارتایەتیدا سودی لێوەرگیرا، چەکێك

---

[46]Ibid., 363.

ئۆجەلان بەکاریهێنا تا پێداگریی لەوە بکات کە ئەو و پەکەکە ڕووبەڕووی مەترسییو پلانی ترسناك بوونەوەو پێویستە لە هەموو کات زێدەتر وردو وریابن لەبەرامبەر ناپاكو کرێگرتەکان. هاوکات ئۆجەلان ئەو ئەزموونەی بەکارهێنا بۆ پاڵپشتیکردن لە بۆچوونو ڕوانینەکانی لەمەڕ دنیای هاوسەرگیرییو پێوەندییە سێکسییەکان.

هەربۆیە دوواتر هەردوو پرۆسەی سێکسو هاوسەرگیریی لەنێو گەریلاکانی پەکەکەدا یاساغکرد. ئۆجەلان سوور بوو لە سەر ئەوەی کەئەزموونی هاوسەرگیرییەکەی لەگەڵ کەسیرەدا ئەوە دەسەلمێنێت کە هاوسەرگیریی ترادیشناڵی کوردیی مەترسییە بۆ سەر ڕەوشی شۆڕشگێڕیی، هەرچەندە ئاماژە بۆ ئەوەیش دەکات کە هاوسەرگیرییەکەی لەگەڵ خاتو کەسیرەدا زۆر هاوسەرگیریەکی تەقلیدیی نەبووە. هاوکات جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ژن پێویستە ئازادو سەربەخۆبێت لە چالاکییەکانیداو دوور بێت لە پەلپو فشاری پیاو و پیاوسالاریی.

بۆ ئۆجەلان پرۆسەی هاوسەرگیرییەکەی هەمیشە بێ کۆسپو کورتی نەبوو، وەلێ ئەنجامەکەی لەلای ئەو جێگەی بایەخێکی ئێجگار مەزن بوو. ئۆجەلان لە وەڵامی پرسیارێکی یالچین کوچوك وتی:" گەر ژنێك هەوڵبدات بۆ ئەوەی بمخاتە ژێر فشارییەوەو پاشان ناچاربکرێم فێربم، ئیتر واتای ژن بوون چییە"، هەروەها وتی:" لەم سۆنگەیەوە کەسیرە یەکێك بوو لە گەورەترین مامۆستاکانم، وەلێ مامۆستایەکی توندو تووڕە بوو"[٤٧].

## مەرگی ناگەهان

لە ئێوارەی ١٩ مانگی پێنجی ١٩٧٨ خەلیل کاڤکون لە ئاوایییەکی چەپەکی نێوچەی حەلواندا درایە بەر دەستڕێژی گوللەو کوژرا[٤٨]. کاڤکون یەکێك بوو لە

---

[47] *Dirilisin Oykusu,* 91.
[48] This section utilizes the following sources for information on the Hilvan

ئەندامانی شۆڕشگێڕانی کوردستان‌و بکوژەکەیشی یەکێك بوو لە ئەندامانی هۆزی گەورەی سولەیمانیان . خوێندنەوە گەلێکی جودا هەیە، دەپرسن ئەوە چی بوو بووە هۆی ئەو هێرشە، راست‌و دروست ئالۆزییەکان لەنێو گروپە چەپە کوردییەکان لەسەر ئەوە بوو کە شوێن پێیەك بۆ خۆیان لەنێو شارۆچکەکەو هۆزەکەدا دیاریبکەن.

کە لە راستیدا بۆ چەند حەفتەیەك بوو شارۆچکەکەو دەوروبەری لەلایەن ئەو گروپ‌و گەجەرو گوجەرانەوە کۆنترۆڵکرابوو. لەبەر ئەوە سولەیمانان ئەو گروپانەیان وەك هەڕەشەیەك دەبینی بۆ سەر سیستەم‌و سیادەی بوونیان. لەهەمان کاتدا شۆڕشگێڕە کوردییەکانیش خاوەن زەوی‌و دەرەبەگە سەرکوتکەرەکانیان وەك خودی دەوڵەت بە نەیارو ناحەز بەتەوای ئەجێنداکانیان دەزانی.

بەدانپێنانی خودی پیاوانی ئۆجەلان، ئاپۆچییەکان لە سەرەتادا شکستیان هێنا لە پلانی تۆڵەی ئەو هێرشەی کە هۆزچییەکان کردیانە سەر تەڤگەری شۆڕشگێڕی کوردیی. لە راستیدا بەدەر لەو خێزانانەی کە بە پەنجەی دەستیّ دەژمێردران، هیچ کەس نەبوو کە رازی بێت بە پلان‌و ئەجێندای شۆڕشگێڕیی ئۆجەلان. خەڵکە رەشۆك‌و بیّ زەوی‌و زارەکەیش دودڵ‌و دڵگرمیّ بوون لەمەڕ گرتنە بەری هەڵوێستێك دژ بە خاوەن زەوییە فیودالەکان کە کۆنترۆڵی شارەوانییان کردبوو، لەهەمان کاتدا وایان دادەنا کەشارەوانی هاوپەیمان‌و هامسۆزی وانە.

لەراستیدا کوشتنی کەسێك لەو ژینگەیەدا ئەگەری ئەوەی هەبوو دوژمنایەتی خوێن لە نێوان هۆزەکاندا بەرپا ببێت، لەبەر ئەوە کوشتنی ئەندامانی ئەو هۆزانە بۆ کەسانی شۆڕشگێر زێدەتر بۆن‌و بەرامەی دوشمنایەتی خزم‌و خوێش‌و خوێناوی لێدەکەوێتەوە. لاوێکی شۆڕشگێڕی گەنج ئەستەم بوو خۆی لەقەرەی کارەساتێکی لەو چەشنە بدات، چوون دەیزانی بنەماڵەکەی لەژێر باری وەها گوڤەندێك

---

fighting: Yuce, *Dogu'da*, Cilt II, 75–113;

دەرنایەت. بەڵام بەنیسبەت ئۆجەلانەوە کوشتنی کاڤگون جۆرێك لەکاردانەوەی تایبەتی بەدووی خۆیدا هێنا. ئەو کارە دووەم دیاردەی کوشتن بوو لە نێو ئەندامە ئاست باڵاکانی شۆڕشگێڕاندا.

لەبەر ئەوە نێوبانگو پێگەی گروپەکە بەتەمامی رووبەڕووی مەترسیی لەنێوچوون ببویەوە. ئەو کات ئۆجەلان بەڵێنی دابوویە شوێنکەوتووانی تا دژ بەمیریی دەستبدەنە چەكو یاخی بن. وەلێ تا ئەو وەختە کشتوبڕو جەنگ تەنها لەگەڵ گروپە کوردییە نەیارەکانیو چەپی تورك یاخۆ باڵە راستڕەوەکانی گۆڕەپانی سیاسیی تورکیا بوو. لەبەر ئەوە وەڵامدانەوەو وەستان لەبەردەم خاوەنزەوییە زەنگینەکانی هۆزی گەورەی سولەیمانیان، خواستی شۆڕشگێڕیو بەرهەڵستکاریی راستگۆیانەی ئاپۆچییەکانی نومایانکرد.

لەراستیدا هەموو ئەو هۆزە زەبەلاحانەبوون کە خەڵکی هەژارو رەشۆکی دێهاتەکانیان دەچەوساندنەوەو لە هەمووش گرنگتر دەستیان لەگەڵ میریدا تێکەڵکردبوو بۆ ئەوەی نەبنە لەمپەر لەبەردەم گەشەی رەوتی شۆڕشگێڕیی کوردستاندا. هەربۆیە هێرشی سولەیمانانەکان بۆ سەرگروپەکە رێكو راست گروپەکەی بەرەو خەباتو خەمی چەكو چۆڵو کاری پارتیزانی برد.

ئەوە بوو لە دەستپێکی کاردا دووان لە کادێرە باڵاکانی گروپ نێردرانە هەرێمەکەوە تا لەوێ ئامادەسازی بۆ هەڵمەتو هێز بکەنەوە. ئەوەبوو لەماوەی دوومانگدا شۆڕشگێڕانی کوردستان توانیان دڵی هۆزی سولەیمانان بلەرزێننو لەئاکامی هێرشێکدا موحەمەد بوجاکی رێبەرو سەرداری هۆزەکەیان بەسزای مەرگ گەیاند.

ئیتر لە چەند مانگی داهاتووی پاش رووداوەکەداو لەئاکامی هەڵایسانی تەقو تۆقو نەیاریەتی توندی یەکتریدا نەتەوەییە کوردەکان توانیان پشتیوانی بەرفراوانی خەڵکی شارۆچکەکە بەدەست بهێنن. هاوکات یەکێك لە دیارترین هۆکارەکانی گروپ

بۆ دژایەتیو جەنگ لەدژ هۆزەکان دەست تێکەڵکردنیان بوو لەگەڵ باڵی راستی توندڕەویی پارتی نەتەوەیی تورکی (ئەڵپ ئەرسەلان تورکیش رابەرایەتی دەکرد. وەرگێڕ) کە یەکێك بوو لە هاوسۆزو هەوادارەکانی هۆزە ستەمکارەکان. ڕەوشەکە تەنها جەنگی گروپو هۆزەکانەوە نەوەستا، بەڵکو خەڵکی پاڵەو رەشو روتیش هاوسۆزیان بۆگروپ نیشاندا، هاوکات چەپەکانی کوردیش دەستپێشخەریو نیازی خۆیان بۆ هاتنە نێو جەنگی هۆزەکان نەشاردەوە. گروپە جوداخوازە کوردییەکانی دیکە وەك ئۆجەلان بەرهەڵستکاری زەنگینو زەویدارەکان بوون، وەلێ زێدەتر بەنەزمێکی تیۆری رووبەڕووی رەوشەکە ببونەوەو چالاکییەکانیان فرە سنووردارو سستبوو، ئەگەر نا بە شێوەیەکی بلاّو تەنها ئۆجەلانو شوێنکەوتووەکانی ئامادەییان هەبوو بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی کرداری بێنە نێو جەنگەکەوە.

رەمەزان مالك دەڵێت:" پاش ساڵەهای ساڵ لە چەوساندنەوەو بندەستیی، ناگەهان گروپێك پەیدابوو لە رووی هەموو ئەو نەزمە توندو تیژییەدا وەستا، لە کۆتاییدا ئەمە وەك ئەوە وابوو، کە بەڵێ دەکرێت تۆڵە بکەینەوە". رەمەزان زاڕۆی ئاواییەك بوو کە فرە لە حەلوانەوە دوور نەبوو، ئەو ساڵی ١٩٧٧ خوێندکاری زانکۆ بوو. ناوبراو نێزیك بە ئۆجەلانو گروپەکەی چاوی بەڕووی سیاسەتدا کرایەوە، ئەو پێی وابوو تەنها ئەم گروپە دەتوانێت شۆڕشی کوردستانو بەڵێنی رزگاری نەتەوەیی بەئاکام بگەیەنێت. رەمەزان دەیوت:" لە ئاواییەکەماندا کەسێك نەبوو ناسراوێك یاخۆ نێزیکێکی لەلایەن سەربازەکانەوە کوتەك کاری نەکرابێت، لە راستیدا پەکەکە هات لە ڕووی ئەو بێ نەزمییەدا وەستایەوە". هەروەها وتی:"هاوکات پەکەکە لە رووی دەرەبەگو خاوەن زەوییە گەورەکان وەستایەوە، لە راستیدا دەرەبەگەکان خاوەنی هەموو شتێکی خەڵکبوون، هەموو شتێکیان لە ژێر ڕکێفدا بوو، تەنانەت ئاڵتوونی گەردەنی خانمانیان دەپچڕاندو حەپەلوشیاندەکرد.

له پاش سالآنێك بندەستكردنی بەردەوامی خەڵك، لەپڕێكداو بەلێشاو خەڵكی رووبیان له سۆزداریو پشتیوانی بۆ پەكەكە دەربڕی".

له بەر ئەوە بەنیسبەت گروپە كوردییەكەوە جەنگی حەلوان دەستپێكی هەلوێستو ئاراستەی هێرشو ئەجێندایەكی نوێی دیاریكرد. لێرەوە گروپەكە تەواوی سەردارو سەرۆك هۆزە گەورەكانی كردنە ئامانج، ئەو سەرۆك هۆزانەی دەستیانگرتبوو بە سەر ئابووری نێوچەكەو قوتی خەڵكداو دەستیان له دەستی دەوڵەتو بینی خەڵكی هەژاردا بوو.

چەند مانگێكی كەم پاش ئەوەو لە ٣٠ مانگی حەوتی ١٩٧٩ دا گروپەكە دەستەیەك كادێری بوێر بۆ تێرۆركردنی پەرلەمانتارو سەرۆكی هۆزی گەورەی بوجاك دامەزراند. موحەمەد جەلال بوجاك ئەندامی پارتی عەدالەت بوو، كە له حەفتاكاندا لەگەڵ پارتی كاری نەتەوەیی توندڕەو حكومەتێكی ئیئلافییان پێكهێنابوو. جەلال بوجاك شۆرەتی له توندو تیژییو رەق مامەڵەیدا رۆشتبوو، بەتایبەت له مامەڵەكردن لەگەڵ هەموو ئەوانەی لەقەڵەمڕەوەكەیدا دەژیان. یەكێك له خزمە نێزیكەكانی بوجاك دامەزرێنەری پارتی دیموكراتی كوردستانی توركیا بوو، كە پێوەندییەكی نێزیكی لەگەڵ تەڤگەری بارزانی هەبوو له باشووری كوردستان.

لەراستیدا ئامادەیی ئۆجەلانو شوێنكەوتوانی بۆ شەڕو كەوكردنی پاكو ناپاك ئامانجو نیشانەیەكی رۆشن بوو كە نەهجێكی دیارو جێگەی بایەخی شوێنكەوتووەكانی بوو. دیارە پلانی ترۆركردنی موحەمەد جەلال بوجاك سەركەوتوو نەبوو، ئەو بە برینداری مایەوە، وەلێ جەسارەتو پلان بۆ پشتیوانی تەڤگەری كوردیی كەمی نەكردو هەروا بەرنامەی شۆڕش بەرەو پێشەوە دەچوو. چیلیك دەیووت:"هێرشكردنە سەر بوجاك رێك وەك هەڵكوتانە سەر میریی وەهابوو، له كاتێكدا دەوڵەت پشتیوانی له سەرۆك هۆزو دەرەبەگە دەسەلأتدارەكان دەكرد".

چیلیك پاش تەواوكردنی زانكۆ وەك ئەندازیار بۆ ماوەی ساڵێك كاری كرد، پاشان

وازی لە کارەکەی هێناو بەتەواوی خۆی یەکلایکردەوە بۆ کاروباریی شۆڕشگێڕیی.
لەپاش هێرشکردنە سەر بوجاك گەلێ جەنگو کوشتو کوشتار رویداو لەونێوەندەدا خەڵکانێکی زۆر تیاچوون. وەلێ چیلیك ئاشکرای کرد:" ئاپۆ بڕوای وابوو کە گەر جەنگێکی گەورە هەڵبگیرسێنن، ئەوا دەتوانن پشگیریی جەماوەریی بۆ پەکەکە بەرینتربکەن". بەگوێرەی سەرنجەکانی ئاپۆ، گەر لە جەنگەکاندا ١٠٠ هاولاتیش کوژرابن، ئەوا زارۆکانیان دەبنە گەریلا بۆ تۆڵە سەندنەوەی خوێنی بابو بنەچەیان.

## پارتەکە

هەوڵی غافڵکوژکردنی بوجاك زەمینەسازی بۆکرا بۆ راگەیاندنی سەرتاسەریی دامەزراندنی پارتێکی سیاسیی بەنێوی پەکەکە کە بە کوردیی کورتکراوەی پارتی کرێکارانی کوردستان بوو[49]. لە راستیدا پارتەکە لە گردبوونەوەیەکی نهێنیدا هەشت مانگ پێشترو لە ٢٨ی مانگی یازدەی ١٩٧٨ دا لە گوندی فیسی دەرەوەی دیاربەکردا دامەزرابوو. بەلام گروپەکە بڕیاریاندابوو راگەیاندنی دامەزراندنی پارتەکەیان دووا بخەن تاوەکو رەوشو رۆژێك بێتە پێشەوەو لەهەراو هوریاو چالاکییەکی گەورەدا خۆیان نومایان بکەن بۆ ئەوەی یاریدەی بلاوبوونەوەی نێو و ناوبانگیان بدات.

هەرچەندە گروپەکە شکستیانهێنا لە کوشتنی بوجاکدا. وەلێ هەوڵی کوشتنی بوجاك پەیامێکی خێراو دەنگدانەوەیەکی بەرینی هەبوو لەسەرانسەری هەرێمەکەدا و پلانو ئامانجەکانی کوشتنەکەو بلاوکراوەو ئەدەبیاتی گروپەکە لەتەواوی نێوچەکەدا بایەخو بەهای تایبەتی هەبوو. ئەو ناميلکانەی لەدەستپێکی دامەزراندنی پەکەکەدا بلاوکرانەوە بریتی بوون لە پوختەو کورتەی مێژووی کورد کە لەژێر ناوی

---

[49] This section relies on Yuce, *Dogu'da,* Cilt II, 226–244; Birand, *Apo ve PKK,* 96–99; and interviews with former PKK members active during the period.

شۆڕشی نەتەوەیی بۆ لەنێوبردنی دەوڵەتی تورك وەشانکرابوون لە وانە: نا بۆ ئیمپریالیزم‌و كۆلۆنیالیزم، بەرەو سەربەخۆیی، یەكێتی، كوردستانێكی دیموكرات، بژی سەربەخۆیی‌و ئومەمیەتی پرۆلیتاریی ، بژی پەكەكە (پارتی كرێكارانی كوردستان)[٥٠]

جیاكەرەوەكانی نێوان پارتییەكەو گروپە كۆنەكە بە شێوەیەكی سەرەكی پێوەستبوو بە كاروچالاكییەكانەوە. لەپاش كۆنگرەی دامەزراندنی پارتەكە لە ئاوایی فیسی دەوروخولی دیاربەكرێ، ئیدی پارتییەكەو پێرەوانی پارتەكە زێدەترو بەگوێرەی پسپۆرییان دەستیان دایە چالاكی‌و گردبوونەوەی جودا جودا. لەپێشدا پێرەوانی ئۆجەلان چالاكییەكانیان تەنها دەستپێشخەریی و هەنگاوی خۆیان بوو، هەرچەندە بوونیان لەچوارچێوەی هەستی ناسیۆنالیستی‌و ئامانجە چەپخوازییەكاندابوو. وەلێ كۆنگرەی فیس، بووە هەولێك تا هەموو ئەو تین‌و تاوەی ئەندامان لە چوارچێوەیەكی رێكخراوەییدا دابڕێژێتەوەو سەرلەنوێ هەمووان لەدەوروخولی میتۆدێكی ئامانجدار گردبكاتەوە. هەر لە كۆبوونەوەكەدا سێ كەس وەك ئەنجومەنی نێوەندی پارتەكە هەڵبژێردران، لەوانە عەبدوڵا ئۆجەلان، جەمیل بایك، شاهین دۆنمز . دواتر كۆمیتەگەلێكی ئامادەكاریی نێوچەیی لە سەراسەری هەرێمە كوردییەكاندا دامەزران، هەر كۆمیتەیەك لەپێنج ئەندام پێكهاتبوون‌و وادانرابوون تا بڕیار لەچالاكییە لۆكاڵییەكان بدەن[٥١] هاوكات لەگەڵ هەوادارانی ئەم گۆڕانكارییانەدا، ئەوانەن لە راستیدا ببوونە ئەندامانی دیفاكتۆی رێكخراوە نوێیەكە. ئەو ئەندامانەی هەڵسوڕاوی پەكەكە بوون زۆرجار دەستبەرداری خوێندن‌و خزم‌و خوێش‌و بژێوی ژیانیان دەبوون‌و خۆیان یەكلاییدەكردەوە بۆ رێكخراوەكەیان. هەندێك لە پێرەوانی ئاپۆ رەوانەی زێدی خۆیان دەكرانەوە تا بە چالاكییەكانیان

[50] Parts of the PKK founding manifesto are reprinted in Yuce, *Dogu'da,* Cilt II, 293–298.
[51] Yuce, *Dogu'da,* Cilt II, 174, 190.

بتوانن دەستبگرن بەسەر سەندیکاو دامەزراوە فێرکارییەکان‌و ڕێکخراوە جەماوەرییەکانداو لە بۆتەی ڕێکخراوە نەیارەکانی دیکەدا دەریانبهێنن. زۆرجار تەق‌و تۆق‌و بگرەو بەردەی چەکداری دەبووە بەشێك لە سیماکانی کارو چالاکی ئەو ڕێکخراوانە. هەربۆیە سەرەڕای هەوڵی ئاپۆچییەکان بۆ دەستبەسەراگرتنی نێوچە کوردییەکان، کەچی هەروەك پێشوو چالاکییەکان بەئاقاری پاشاگەردانی‌و بێسەرەو بەرەیی دەچوون. ئەندامان بەبێ گەڕانەوە بۆ سەرەوەو بەبێ ڕەچاوکردنی زانیارییەکانی کۆمیتە نێوچەییەکان، بۆ خۆیان بڕیاریان دەداو سەر بەکڵاوی خۆیان بوون.

لەراستیدا هۆیەکی ئەم پشێوییە دەگەڕایەوە بۆ ڕژێمی تورکیا، چونکە هەمیشە برەوی دەدا بە تەنگژەکان، هەر بۆیە هەمیشە چالاکییەکان بەرنامەو راوێژێکی ڕێکخراوەییان پێوە نەدەبینرا. هەروەها بنکەی جەماوەریی پەکەکە لەو گەنجە دڵگەرم‌و تامەزرۆیانە پێکهاتبوو، کە وەك دەوترا هیچ سەبرو سەلوانێکیان نەبوو تا بەشێوەیەکی فەرمی بڕیاری دەستپێکردنی خەباتی چەکداری‌و پارتی زانی بدرێت:" هەروەك سکرتێری گشتی ئەنجومەنەکە دەڵێت، تۆ دەکرا بڵێیت هیچ پلانێکی دارێژراو نەبوو بۆ هەڵمەت، وەك ئەوەی کە بەردەوام لە گۆڕێدا بوو". ناوبراو حوسەین تۆپگیدەر، ئەو بەرپرسی کۆمیتەی ئەلازیگ بوو. گەنجانی وەك ئەو، بۆ نموونە:" بۆ خۆیان بڕیاریان دەدا کە دەستدرێژی بکەنە سەر خەڵکی نەیاریان لە پێناوی بەدەستهێنانی چەك‌و چۆڵ‌و پوڵ‌و پارەدا، هاوکات کاری هەیەجانییان ئەنجامدەداو هێرشیان دەکردە سەر بەکرێگیراو کاربەدەستانی میریی". لەهەمانکاتدا ڕاگەیەنراوی ڕێکخراوەکە، ڕەوشەکەی وەك قۆناغێکی نوێ گریمانکردبوو، کە ڕێگایەکە بۆ رزگاریی نەتەوەیی کوردستان. ئەم ڕەوشە بەردەوام بوو تا لەماوەی چەند مانگێکی کەمدا پەکەکە خۆی لەنێو بۆتەی نەیارەکانییدا دییەوەو لە هەموو ڕوویەکەوە تەنگی پێهەڵچنرا بوو. هەموو ئەو دەستکەوتانەی

ئەوان لەساڵێکی پێشوودا پێی گەیشتبوون‌و دەنگدانەوەی فرەی هەبوو، هێدی هێدی‌و بەکاوەخۆ دەپوکایەوەو لەدەستیاندەدرا. دیارە ئەوەیش بەهۆی دوژمندارێتی تایبەتییەوە بوو کە دەکرایە سەریان. هاوکات هەڵوێستی دوژمنکارانە بەرامبەر بە نەیارەکانیان، کارو چالاکی پێڕەوانی پەکەکەی سەخت‌و سامناك کردبوو، هەر بۆیە نەیاندەتوانی بە شێوەیەکی ئازادانە باوەڕەکانی خۆیان نومایانبکەن. گروپە کوردییەکانی تر هەوڵیاندەدا ئەوان بخەنە پەرێزەوەو بلۆکیان بکەن لە بەشداریکردن لە گردبوونەوە گشتییەکانی نێوانیان. هەروەها دەنگۆی ئەوەیان بلاودەکردەوە کە ئەندامانی پەکەکە بۆ نانەوەی پشێوی دەستیان داوەتە چەك. یەك لە ئەندامانی گروپەکانی پەکەکە گەیشتبووە ئەو راستییەی کە رژێم ئەندامانی پەکەکە لە ئاواییەکی دەرەوەی دۆگو بایەزید رادەهێنێت‌و سازیان دەکات بۆ نانەوەی تەنگژەو توندوتیژیی[52].

هۆزی گەورەی سولەیمانیان سەرلەنوێ دەستیان دایەوە هێرش بۆ سەر پەکەکەو لەونێوەندەدا شەش لە هاولاتیانی ئاواییەکانیان فڕاندو پاشان لەنێویانبردن[53]. سەرلەنوێ هێرشی سولەیمانان پێڕەوانی ئاپۆی هاندا بکەونە بیری تۆڵەو تەنگژەکانی زێدەتر کرد. هاوکات دەرگیرییەکان لەگەڵ هێزی رزگاریخوازانی نەتەوەیی کوردستان (کوك) فرە بەسەختی هەڵگیرساو بووەهۆی بەهەدەردانی تین‌و تاوی خەڵکی دڵگەرمی کورد بۆ ئازادیی کوردستان.

هاوکات لە بەهاری ۱۹۷۹دا ئەندامی کۆمیتەی نێوەندی پەکەکە شاهین دۆنمز لەلایەن میرییەوە قۆڵبەستکرا. شاهین لەنێو هاوەلانیدا فرە خۆشەویست‌و خۆشمەشرەب نەبوو، وەلێ کارامەیی‌و وردو وریایی ئەوی گەیاندبوویە ئاستێکی بالا

[52] Ibid., 219.
[53] Ibid., 375.

لەپارتەکەیدا. بەهۆی کاری ڕێکخراوەییەوە سەراسەری هەرێمە کوردییەکان دەگەڕا، دواجار لە ئەلازیگ لەلایەن پۆلیسەوە قۆڵبەستدەکرێتو ڕەوانەی زیندان دەکرێت.

ئۆجەلان لەکاتێکدا کە لە دیاربەکر بوو هەواڵی دەستگیرکردنەکەی پێگەیشت. بەم هەواڵە ڕاستەوخۆ دیاربەکری بەجێهێشت بۆ شوێنێکی نێزیك مێردین، وادیاربوو دوژمن شوێنو حەشارگەی پەکەکە بەدروستی دەزانێت لە دیاربەکر دا. بۆ ئەم مەبەستە پۆلیس تەواوی حەشەرگەکانی پەکەکەی لەنێوچەکەدا کێومالکرد. ئەوەیش ڕوون بووەوە کە دوژمن تارادەیەك لەپشت هەڵماڵینی ئەو نهێنیانەوە بوو. ئۆجەلان دەیوت:" ئەوەمان بۆ ئاشکرابوو، کە کۆتایی چالاکییەکانمان لەنێوچەکەدا لە گۆڕێدایە"[54]. بەمجۆرە دەستگیرکردنی شاهین یارمەتی ئۆجەلانی دا تا ملبدات بۆ ئەو ڕاستیەی کە پێویستە تورکیا بەرەو پەناگەیەکی ئارام بەجێبهێڵێت. هاوکات دەنگۆی ڕوودانی کۆدەتای سەربازی لەتورکیا دا بەگەرمو گوڕی لە گۆڕێدا بوو. هێزەکانی ئاسایش ڕێوشوێنی توندوتۆڵیان لە گەڵێ لەنێوچە کوردییەکاندا گرتبوویە بەر. هەرچەندە گلەو گازاندەی لە ڕادەبەریش لە سەربازەکانیان دەکرا، چونکە بەهۆی زاڵیو سەرداریەتی گروپە چەکدارەکانی کوردەوە لە نێوچەکەدا بۆیان نەدەلوا بەتەواوی ئەرکە سەربازییەکانیان ڕاپەڕێنن . بەگوێرەی زانیاری یەکێك لە ڕاپۆرتە هەواڵگرییەکانی هێزەکانی ئاسایش، کە تەنها مانگێك پێش قۆڵبەستکرانی شاهێن دوژمەز بلاو ببویەوە نوسرابوو:" تەنها ئەفسەرێکی قارەمانمان بچێتە هەر ئاواییەکەوە کەمتر لە بیست کەسی دەرچوو لەیاسا قۆڵبەست دەکات"[55]. بەمجۆرە پەستانو پایماڵکردن لەوانە دەستگیرکردنی هاوڵاتیان لە هەڵکشانێکی سەیردا بوو. هیچ شتێك دڵنیا نەبوو، هەروەك چۆن ئۆجەلان پاش هەڵهاتنی لە دیاربەکرد توانای ئەوەی نەبوو شوێنێکی بێوەی بۆخۆی بدۆزێتەوە. تەنانەت لەو شوێنانەیشدا کە

[54] Ibid., 244.
[55] Pope and Pope, *Turkey Unveiled,* 135.

پەکەکە تێیدا باڵادەستو بەهێزبوو، هەموو شوێنەکان بەشێوەیەکی کردارییی لەلایەن میرییەوە کۆنترۆڵکرابوون.

هەموو بەدوواچوونەکانی پۆلیس، کێبەرکێی گروپەنەیارەکانو ئاڵۆزی رەوشەکە مانگ لە دووای مانگ ببوونە فشاری جدیو لە شانو شکۆو شیرازەی کاری پەکەکەیان کەمدەکردەوە. ئۆجەلان دووچاری نیگەرانییەکی ئێجگار زۆر ببویەوە. من لە هەوڵی دۆزینەوەی پەناگەیەکم لە ئورفەدا. بڕیارە بۆ چەند رۆژێکی کەم لەوێندەر وەمێنین. تەنانەت هاوسەری هەندێك لە هەڤاڵانمان ئێمەیان وەك گرفتو چەڵەمەیەك دەزانیو مژوڵی ئەوە بوون لە پشت دەرگاکانەوە دەرمانبهێنن.

هەربۆیە ماڵ لەکۆڵ بووینو وەك کتی پاسوتاو وابووینو هەرجارەو پۆلیس لە قوژبنێکدا دەریدەپەڕاندینو هەمو کاتێکیش دۆزینەوەی مەنزڵێك ئێجگار سەختو سرك بوو"[56]. لە مانگی تەموزی هەمان ساڵدا، ئۆجەلان بە شێوەیەکی نهێنی توانی لەخاکی تورکیا قوتاربێتو پەنا بەرێتە بەر سوریا. بەتێپەڕبوونی ساڵێك هیچ لە ئەندامانی پەکەکە ئاگاداری ئەوە نەبوون کە ئۆجەلان لە تورکیادا دەرباز بووە. ئەمەیش خۆی لەخۆیدا هێما بوو بۆ توندو تۆڵیو قایمکاری لەنێو رێکخستنەکانی پەکەکەدا.

لەپاش ئەوە ئیتر سەدان ئەندامو چالاکوانی سیاسیی تورکو کورد رێگەی هەڵهاتنیان هەڵبژارد، ئەگەر نا یان دەستگیر دەکران یاخۆ لەنێودەبران. خەباتگێڕان بۆیان روونببویەوە کە پلانێك لە گۆڕێدا هەیە بۆ ئەنجامدانی کۆدەتا لەنێوخاکی تورکیادا. لە هاوینی ١٩٨٠ دا، تەنها چەند مانگێکی کەم پێش رووداني کۆدەتای سەربازیی ١٩٨٠، ئۆجەلان پەیامێکی ئاڕاستەی شۆڕشگێڕانو پێڕەوانی کرد، بۆ ئەوەی هەرچی زووترە خاکی تورکیا بەجێبهێڵنو پێوەندی بە خۆیەوە بکەن لە سوریا.

---

[56] Yuce, *Dogu'da,* Cilt II, 245.

## توركیا لە داڕوخاندا

یەکێك لەو هۆیانەی یاریدەی پەکەکەیدا دەرکەوێت‌و لێنەوێت بۆ چالاکی‌و کردەی سەربازیی، بریتی بوو لەو رەوشە نوێیەی کە لە نیوەی دووەمی حەفتاکاندا تورکیای بەرەو ئاڵۆزی‌و لێکترازان‌و دەرچوون لە کۆنترۆڵی میری بردبوو[57]. هەربۆیە لەپاش گرتنە بەری رێوشوێنی دێموکراسی لەولاتدا ئیتر تورکیا بەکاوەخۆ بەرەو لاوازی‌و لێکترازان‌و مایە پوچبوون دەبوویەوە. لەماوەی نێوان ١٩٧٥ تا ١٩٨٠ هاوپەیمانییەتی لەنێوان پارتەکاندا چوار حکومەتی لێکەوتەوە، هەر یەك لەوانە فرە بە سەختی دەیانتوانی کارەکانیان راپەڕێنن. هەریەك لەوانە بوونی کەمتر لەشەش مانگی دەخایاندو دوواتر بەتێکڕای دەنگ متمانەی لێدەسێنرایەوە. تەنانەت کاتێکیش هاوپەیمانییەتی دروستدەبوو لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا، ئیتر ئایدیۆلۆژیای قوڵ‌و کۆنەقینی نێوان پارتە بەشداربووەکان لەمپەری سەرەکی بوو لەپێش جێبەجێکردنی یاسا پێویستەکاندا. هاوکات ناجێگیریی رەوشی سیاسیی زێدەتر ولاتی بەرەو پشێویی‌و خراپی برد، ئەمەیش بەهۆی ئەو پاشەکشە ئابوورییەوە بوو کەلەلایەن ولاتانی ئەوروپییەوە لەو دەمەدا سەریهەڵدابوو.

لە ساڵی ١٩٧٩ دا دیاردەی هەڵاوسانی ئابووری ولات گەیشتبووە ٪٩٠. هاوکات هاوردەکردنی دراوی بیانی بووە هۆی کەمبوونەوەی داهاتی نەوت‌و هەروەها کەمبوونەوەو بچڕانی رۆژانەی وزەی کارەبا. بازرگانەکان نەیاندەتوانی کەرەستەی خاوی پێویست بهێننە ناوەوەو دواجار بەرهەمهێنان رووی لە کزی‌و کەمی کرد. تەنانەت هاولاتیان نەیاندەتوانی گڵۆپی رووناکی، کلینیکسی تەوالێت‌و داو دەرمان بەدەستبهێنن، لەهەمانکاتدا بێکاریی لەولاتدا روو لەگەشەبوو. زانکۆکان تەنها ٪٢٠

---

[57] This section draws its information from Birand, *General's Coup*; Zurcher, *Turkey;* and Ahmad, *Modern Turkey*

ئەو خوێنکارانەیان وەردەگرت کە ساڵانە لە دووا ناوەندییەکانەوە دەردەچوون. هەموو ئەوانە کە لە زانکۆکان وەرنەدەگیران، بەبێ کاری دەمانەوەو ئیشیان چنگ نەدەکەوت، هەربۆیە دەبوونە نێچیرێکی باش بۆ گروپە راستو چەپە توندڕەوەکان.

توندوتیژی سیاسیی لە نیوەی دووەمی حەفتاکانەوە لە هەڵکشانێکی سەیردا بوو. لێرەوە چەکدارەکانی نێو گروپی گورگە بۆرەکان گەیشتبوونە لوتکەی هێزو بەخواستی خۆیان تەراتێنی سیاسەتی نێو گۆڕەپانەکەیان دەکرد. گورگە بۆرەکان پارتێکی راستی نەتەوەیی پەرگیربوون بە نێوی پارتی کاری نەتەوایەتی تورکو لەگەڵ دوو لە کابینەکانی حکومەتدا هاوپەیمان بوون بۆ پێکهێنانی حکومەت. ئەم گروپە هەمیشە لە بگرەو بەردەو شەڕدابوون لەگەڵ گروپە توندڕەوە چەپەکان. لەلایەکی تریشەوە ئیسلامییەکان وەك رەوتێکی توندی راستڕەو دەرکەوتن. چەپەکان زۆر لە گروپە راستڕەوەکان پەرت پەرتو جیا بوون. زیاد لە ٤٠ رەوتو گروپی چەپی توندڕەو لە تورکیادا مکوڕبوون لە سەر جەنگو ململانێی چەکداریی، هەموو ئەوانە لەمەتەرێزدا بوون دژ بە گروپی گورگە بۆرەکانو لەنێو خودی خۆیاندا مژوڵی خوێنڕشتنو ناکۆکی ئایدیۆلۆژی بوون.

گروپە چەکدارەکان سەر شەقامو شوێنە گشتییەکانیان کردبووە مەیدانی رووبەڕوو بوونەوەی یەکتریی. زانکۆکان شوێنێك نەبوون جگە لە تەراتێنی بیرە جیاوازەکانو شوێنی نومایانی گروپە چەکدارەکان. تەواوی بەشەکانی زانکۆکان لەلایەن گروپە جوداکانەوە کۆنترۆڵکرابوون. خەڵکی بە چوونە دەرەوەیان لە ماڵەکانیان ترسو دڵەڕاوکێ دایدەگرتن.

لە ساڵی ١٩٧٦ دا ١٠٤ رووداوی کوشتنی سیاسی هەبوو، ساڵی ١٩٧٧ رێژەکە بەرز بووەوە بۆ ٢٣٠ رووداوی کوشتن، لە نیوەی ساڵی ١٩٧٩دا رۆژانە ٢٠ هاوڵاتی دەهاتنە کوشتن. ئامانجەکان زۆر بە بێ سەرەو بەرەیی لە برەودا بوون. هاوکات خەڵکێکی کەم لەبەرامبەر ئەو کوشتو کوشتارانەدا کە ئەنجامیان دەدا

قۆڵبەستدەكرانو زۆرینەی ئەوانە زۆر بەئاسانی لەدەستو پێوەندی میریی قوتاردەبوونو وەك بەرزەكی بەر بانان بۆی دەردەچوون. لەگەڵ ئەوەی سەپاندنی یاسای سەربازیو عورفیی لەهەندێك لە ویلایەتەكاندا لە ١٩٧٨ دەركرابوو، سوپا بانگەشەی ئەوەی دەكرد نەهێزی پێویستی هەیەو نەیش پشگیریی سیاسیی تا بتوانێت كۆتایی بە توندو تیژیی بهێنێت.

لەهەمانكاتدا ریزەكانی پۆلیسیش تێكچوو بوو، ئەوان بەهۆی دابەشبوونی ئایدیۆلۆژییەوە شیرازەیان پچرابوو، بەشێكیان لەگەڵ رێكخراوە راستە توندڕەوەكاندا دەستیان تێكەڵكردبوو، هەمیشە لە پلانگێڕاندا بوون. بۆ نموونە هەوەڵ گردبوونەوەی كرێكاران لە ئەستەمبولو لە ساڵی ١٩٧٧دا لەلایەن ماوییەكانەوە بلاوەی پێكرا، پاش ئەوەی لە بان كوچەو كۆڵانەكانەوە خۆپیشاندەران درانە بەر دەستڕێژی گوللە، لەم كاتەدا پۆلیس ئەم سەرو ئەوسەری شەقامەكانی تەنی بوو، هەر بۆیە لەكاتی هەڵهاتندا بەهۆی پایماڵو دەستڕێژی گوللەوە نێزیكەی ٤٠ هاوڵاتی گیانیان لەدەستدا. لێرەدا باوەڕوایە كە كوشتارگەكە دەستكیسەی هاوسۆزانو هەڵسوڕاوانی میریی بووە. دووا بەدووای ئەم رووداوە خوێناوییە كەمینەی عەلەویی مەزهەب لەلایەن گورگە بۆرەكانەوە بەسەختی هێرش گەلێكیان كرایە سەر. بۆ نموونە كوشتو بڕی مەرعەش لە ساڵی ١٩٧٨ دا، ئەم قڕكردنە كاتێك كۆتایی هات كە هێزەكانی میریی گەیشتنە شوێنی رووداوەكە. لێرەوە سوپا كەوتە مشتومڕی ئەوەی گوایا دەتوانێت دەست بگرێت بەسەر دۆخەكەدا، هەروەك چۆن توانی ساڵی ١٩٧٨ رەوشی مەرعەش هێوربكاتەوە. بەڵام لەماوەی ساڵەكەدا بارودۆخی سیاسیی، ئابووری، كۆمەڵایەتی ئێجگار تاریكو تەنگ ببویەوە، ئیدی مشتومڕەكان بەتەواوی لەدەورو خولی ئەوەبوون پێویستە كۆدەتای سەربازیی چۆنو كەی؟ لە وڵاتدا روویدات.

له كاتژمێر چواری بەرەبەیانی ٠٨-٠٩-١٩٨٠ دا رادیۆی فەرمی دەوڵەتی تورك لەگەڵ دەستپێکی مارشی سەربازیدا، بێژەر راگەیەنراوی سەربازیی کەنعان عیفرینی سەرۆکی ئەرکانی سوپای خوێندەوەو تێیدا ئاماژەی بەوە دابوو کە دەستیان گرتووە بەسەر تەواوی کاروباریی میرییدا. لێرەوە سەربازەکان بلاوەیان پێکرا بۆ کێومالکردنی تەواوی بەرپرسە سیاسییە بالاکان‌و دەستگیرکردنیان. هاوکات پەرلەمان هەلوەشێنرایەوەو یاسای عورفی لەسەرانسەریی ولاتدا سەپێنرا. ئیتر بەدرێژایی سێ ساڵ پاش رووداوی کودەتا دەیان هەزار لە چەپگەرو نەتەوەیی کوردو راستڕەو رووبەڕووی بەندو دادگا بوونەوەو ئەشکەنجەدان‌و دەستبەسەرکردن‌و بەندیخانە ببووە شتێکی رۆتین‌و رۆژانە.

هاوکات دەنگی جوداو ئۆپۆزسیۆنی سیاسیی رێگە لە کارو کردەوەی سیاسیانەیان گیرا، جارێکی تر دەستووری بنچینەیی ولات دارێژرایەوەو جارێکی تر فەلسەفەو هزری ئەتاتورکی دامەزرێنەری تورکیا برەوی پێدرایەوە. زانکۆکان لەسەر بنەماو ئەجێندایەکی نوێ رێکخرانەوەو ئەو بوارەیان لەبەردەمدا کلۆمدا، تا جارێکی تر ببنەوە پەناگەی کێبەرکێی سیاسیی‌و توندوتیژی ئایدیۆلۆژیی. لەم سەروبەندەداو کاتێك ولات لە ساڵی ١٩٨٤دا هێدی هێدی بەرەو هۆوربونەوەو دیموکراسیی دەڕۆی، پەکەکە مژوڵی خۆئامادەکردن بوو بۆ وەشاندنی هەوەڵ کوتەك‌و گورزی سەربازیی لە سنووری تورکیادا.

کاتێك کۆدەتای سەربازی ڕاگەیەنرا ،ئیبراهیم ئایدن لە چیاکانی دەوری شارۆچکەی قزڵتەپە، کە زۆر دوور نەبوو لە هێڵی سنووریی سوریاوە، مژوڵی بەجێهێنانی ئەرکی پاسەوانی بوو[٥٨]. ئایدن کاتێك لە ڕادیۆکەیەوە گوێبیستی هەواڵەکە بوو، ئیدی هەموو ئەوانی دی ئاگادار کردەوە. پێرەکەی ئایدن نێزیکەی دوازدە کەسێ دەبوون. ئەوان بەرپرسبوون لە چێکردن‌و هێشتنەوەی پێوەندیی لەنێوان گەریلاکانی نێوخۆی تورکیاو ڕێبەری پەکەکە لە سوریا. پەیك‌و هەواڵەکانیان لە سنوورەکاندا دەگەیاندو هاوکات یاریدەدەربوون بۆ دۆزینەوەی مەنزڵگای سەلامەت بۆ هەڵهاتووان لە قزڵتەپە. لەلایەکی ترەوە گردبوونەوەکانیان ڕێکدەخستن‌و پلان‌و تاکتیکیان بۆ کاروبارەکانیان نومایاندەکرد. ڕوودانی کۆدەتا لەوکاتەدا ئەوەی لەلای ئەوان چەسپاند، کە بۆ گەیشتن بە ڕزگاریی نەتەوەیی ، کۆدەتا نابێتە هۆی گۆڕان لە بەرپرسایەتی‌و ئامانجەکانیان دا. تەنها ڕەنگە ئەو ڕاستییە لەلای ئەوان بچێنێت کە بە تین‌و تاوتریان بکات بۆ ئەوەی جەنگەکەیان زوتر دژ بە تورکیا بەرپابکەن.

وەلێ دوو هەفتە پاش کۆدەتا لە سوریاوە پەیکێك گەیشتە جێ، ئەو پەیکە هەڵگری پەیامێك بوو بۆ تەواوی شۆڕشگێڕەکان کە پێویستبوو هەرچی زووترە نێوخۆی تورکیا بەجێبهێڵن. ئۆجەلان گەیشتە بڕیارێك کە ئیتر سەختبوو بۆ شۆڕشگێرەکان بتوانن لەنێو خاکی تورکیادا درێژە بە خەباتەکەیان بدەن. پاش بڕیارەکەی ئۆجەلان زۆرینەی خەباتکارەکان ڕازیبوون بەوەی کە پێویستە ماڵئاوایی لەخاکی تورکیا بکەن. هەڵمەتی بەرفراوانی دەستگیرکردن‌و ڕاوەدوونان هەموو دەرفەتێکی بۆ کارو چالاکی‌و خەبات لەنێو خۆی تورکیادا زەوتکردبوو. هەربۆیە گەریلاکان ناچارکرابوون زۆر زێدەتر بەپەنهانی‌و شاراوەیی وەسوڕێن. بەمجۆرە

[58] This section utilizes interviews with PKK and other militants who fled Turkey after the coup.

قوتاربوون لەخاکی تورکیا وادیاربوو تەنها رێگە چارەی ئەو رەوشەبوبێت. لەم نێوەندەدا ئایدنیش دەستی دایە خۆ ئامادەکردن بۆ جێهێشتنی بەرەکانی رووبەروو بوونەوەو قوتاربوون لە رەوشەکە. لە راستیدا مرۆ لە نێوچە سنورییەکاندا ساناتر دەیتوانی دەرباز بێت بۆ نێوخاکی سوریا.

قاچاخچییەکان چەندین شێوازو مەکرو فێڵو رێگەی هەورازو نشێوی پەنهان لە هێزە سەربازییەکانیان بەکاردەهێنا بۆ دەربازکردنی شۆڕشگێڕەکان. ئیبراهیم ئایدن لە گێڕانەوەکەیدا دەیوت:" من فرە بەسانایی هەڵهاتم". هەروەها دەیوت:"ئێمە لەلایەن ئاواییەکەی نێزیکمانەوە هاریکاریمان کرا، هەربۆیە لەو گوندەدا ماینەوە تا شەو داهات. سەربازانی تورك لە گوندەکەدا هەبوون، تەنانەت کاتێك ئێمە لەیەکێك لە ماڵەکاندا مابووینەوەو سەرگەرم بووین بە تەماشاکردنی تەلەفزیۆن‌وخواردنەوەی چاوە، ئەوان دابەزیبوونە نێو خانووەکەی تەنیشتمان، بەڵام خۆشبەختانە هەستیان بە بوونی ئێمە نەکرد". دوواجار ئایدن خۆی لە شاری کوردنشینی سنووریی قامیشلۆدا بینییەوە. لەوێو لە شوێنێکی تۆزاوی‌و تەژنەو نامۆدا زیاد لە سەد هەزار کەس تەنها لە لێوارەکانی باشوورێدا دەژیان. زۆرترینی خەڵکی ئەوێ کورد زوان بوون. لەراستیدا زۆبەیان ئەو کوردانە بوون کە لەدوای راپەرینە سەرنەکەوتووەکانی ساڵانی بیستی تورکیا لە چنگی جەنگ‌و کوشتاری تورکیا هەڵهاتبوون[59].

لەوێ کوردەکان نەك هەر تەنها بایەخیان بە رەوشی تورکیا دەدا، بەڵکو لە ژینگەی سیاسیی وڵاتەکەشیان دانەبڕابوون. ئەوان لەتەك رووداوەکانی ئێراقی دراوسێ‌و جەنگ‌و جیدالی مەلا موستەفای بارزانی بێئاگانەبوون‌و هەردەم لەغایەلەی پشتیوانی‌و دەستگرۆیی شۆڕشی کوردیدا بوون . خەڵکی قامیشلۆ زێدەتر هەوادارو هاوسۆزی لق‌و شاخەکانی پارتی دێکوکراتی کوردستانی ئێراق‌و رێکخراوی کوك

[59] McDowall, *Kurds of Syria,* 10–11

بوون، وەلێ خەڵکەکە بەگشتی فرە ناسیۆنالیستبوون، هەربۆیە پشتیوانو سەرخەری هەر کوردێکی شۆڕشگێڕو دەربەدەربوونو هاندەری هەستانەوەو هەیەجانی نەتەوەیی نوێبوون بۆ ئەوانەی کە پەنایان ئەهێنایە نێوچەکە.

ئیبراهیم بۆچەند رۆژێکی کەم لە قامیشلۆ مایەوە، دوواتر گەشتی کرد بۆ دیمەشقی پێتەختی سوریا، لەوێ بۆ هەوەڵجار لەپاش ساڵێك دابڕان چاوی کەوتەوە بە ئۆجەلانی رێبەری پەکەکە.

ئۆجەلان لەو دەمەدا خواستی خۆی نەشاردەوە بۆ ئەوەی هاریکاری ژمارەیەك لە گەریلا بکرێت تابتوانن تورکیا بەجێبهێڵن. هەروەها ئیبراهیم ئایدن دیگۆت:" ئۆجەلان پێی گۆتم ئێمە لێرە دەپارێزرێین، ئەو مەبەستی بوو هەموو گەریلایەك تورکیا بەجێبهێڵێت تا لە دەرێ خۆیان بۆ جەنگیی گەریلایی سازو ئامادەبکەن. بەڵێ ئۆجەلان لەسەر ئەو پرسە بۆچوونەکانی فرە جددیو رەوان بوون".

هەمیشە دەربارەی ئەوەی کە پەکەکە دەبێت ئەجێندای چی بێت. ئۆجەلان گەشبینی خۆی نەدەشاردەوە، چونکە سەختگیرییەکانی رژێمی سەربازی فرە سەرکەوتوو بوون لەدامرکاندنەوەی ئەو شەپۆلە توندوتیژییەی کە وڵاتی گرتبوویەوە. هەر لەپاش کۆدەتا هەزاران کەس دەستگیرکران، لەنێو ئەوانەدا زیاد لە هەزار ئەندامو هەوادارو کەسانی گومانلێکراوی نێزیك لە پەکەکە بەندی زیندانەکان کرابوون[٦٠]. لەگەڵ بەردەوامی دەستگیرکردنەکاندا بۆ ساڵی داهاتوو، ئیتر پەکەکە لەنێو زینداندا نێوبانگی بەشێوەیەکی بەرین بڵاوبوویەوەو وەك رێکخراوێکی کوردی لەنێو تەواوی گروپە شۆڕشگێڕەکاندا دەرکەوت.

لەراستیدا بوونی ژمارەیەکی زۆری هەوادارو دۆستی پەکەکە لە زیندانێدا ئاماژەبوو بۆ جەماوەریبوونی زێدەتری پەکەکە لەچاو گروپە نەیارەکانیدا، ئەمەیش

---

[60] Marvine Howe, “Turks Say They are Gaining on Kurdish Nationalists,” *The New York Times*, Dec. 12, 1980

تارادەیەکی کەم دڵدانەوەیەك بوو بۆ ئەو ئەندامانەی پەکەکە کە دەرفەتیان بۆ رەخسابوو تا دەربازی تورکیا بن. لە بەرگریی زیندانیدا پەکەکە زۆرێك لە بەتواناترین‌و کەسە کارێزماکانی نێوخۆی لە ژن‌و پیاو لەدەستدا. ساری باران دەیوت:" پەکەکە لەسەروەختی لەنێوچووندا بوو" .ناوبراو لەتەك هەشت لەئەندامانی پەکەکە بەماوەیەکی کەم پاش کۆدەتا دەربازی تورکیا ببوون.

وەلێ بە پێچەوانەی ئیبراهیم ئایدن، دەربازبوونی ساری لە سەربازگەیەکی شاخاوی دوور لە سنورەوە بوو. قوتاربوونی ئەوان بیست رۆژی پڕ دەردە سەری خایاند. لە ماوەی ئەو بیست رۆژەدا ئەوان بەدرێژایی رۆژ خۆیان لە کێوەکاندا حەشار دەداو بەشەوانیش بە پەنهانی هەورازو نشێویان دەبڕی. هاوکات بۆ خۆراك‌و جل‌و بەرگیشیان پشتیان دەبەست بە ئاوایی نشینەکانی سەر رێگەیان. زۆرجاریش سودیان دەبینی لە گوند نشینە چاوساغەکان، وەلێ ئەوانیش بەین بەین دەرنەدەکەوتن‌و خۆیان لەقەرەی وان نەدەدا. ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکان زۆر زیاد بوون‌و فشاری سەرئاواییەکان بەرین بوون. بەراستی ئەوە گەشتێکی ئاسان نەبوو بۆ ئەوانەی کە هەڵدەهاتن، هەندێك لەوانەی نیازی هەڵهاتنیان هەبوو، لە رێگەدا دەکوژران‌و لەنێو دەچوون.

هەوڵی یاخیبوانی پەکەکە بۆ گەیشتن بە خاکی سوریا هەوەڵ هەوڵی لەو جۆرە نەبوو. بەڵکو هەمیشە ئەم وڵاتە عەرەبییە دیمەشقی کردووەتە پەناو پێچی مانەوەی توندڕەوە چەپگەراکانی تورك.

چونکە دیمەشق‌و ئەنکەرە لەمێژە ناکۆکی گەلێك لەنێوانیاندا هەیە، هەربۆیە سوریا هەمیشە کاری لەسەر ئەو پرەنسیپە کردووە کە ئێژێ "دوژمنی دوژمنەکەم دۆستمە"، لەبەر رۆشنایی ئەم سیاسەتەیش خاکی خۆی کردووەتە پەنایەك بۆ گروپە تورك‌و کوردە یاخییەکانی دژ بە تورکیا. هەندێك لەوانە ئەو لێشاوی هەڵهاتنە لەوەدا دەبیننەوە تا سوریا وەك وێستگەیەك بەکاربهێنن بۆ بەدەستهێنانی مافی

پاسپۆرتو ڤیزای ئەوروپا. هەروەك چۆن هەندێکیش لە پلانی ئەوەدا بوون لە سوریا دا بمێننەوە یاخۆ لەوێوە بچنە ئێراقو لوبنان. بەمجۆرە لە سێ وڵاتدا پەکەکە دەرفەتی راهێنانو خۆسازدانی هەبوو بۆ سەرلەنوێ رووبەڕووبوونەوە دژ بە رژێمی تورکیا.

سەلاحەدین جلیك خەباتکاری پێشووی پەکەکە دەیوت:" کاتێك گەیشتینە سوریا پێمان وابوو ئیتر هەموو شتێك بە سانایی دەگوزەرێت". جیلیك بەماوەیەکی کەم پاش خۆحەشاردان لە کۆدەتاچییەکان، لە سنوریی قامیشلۆوە وەك زۆرێك لە ئاپۆچییەکانی تر خۆی گەیاندبووە سوریا. ناوبراو بڕوای وابوو پاش چەند مانگێك ئیتر دەتوانن بگەڕێنەوە تورکیاو بەشێوەی جەنگی ڤێتنام دەتوانن ئەرتەشی تورکیا لە زێدو زۆنەکەیان هەڵکەنن. لەم بارەیەوە دەیگۆت:" ئەمە هەموو ئەوە بوو کە لەبارەیەوە دەدواینو گفتوگۆکان لەسەر ئەوە بوو چۆن چۆنی بەزوویی وەگەڕێینەوەو جەنگ دەستپێبکەین".

## ئۆجەلان ماڵە نوێیەکەی پەکەکە دەدۆزێتەوە

سەلاحەدین جلیك بۆ دوو حەوتە لەسنووری شارۆچکەیەکی قامیشلۆدا مایەوە، تا ئەو کات لەلایەن ئۆجەلانەوە هەواڵ گەیشت. ئیدی ویش ماشێنێکی گرتو بەرەو دیمەشقی پایتەخت بەڕێکەوت. لەوێ ئۆجەلان چەندین بەشو یەکەی سەربازی لەسەرانسەری شارەکەدا رێکخستبوو، هاوکات چەندین یەکەی نیشتەجێبوونی ئامادەکردبوون. بەشێك لەو یەکانە لە نێوچەو گەڕەکە کوردیی یاخۆ فەلەستینییەکانی دیمەشقێدا بوون. زۆرێك لەوانە بەئاشکرا لەلایەن ئۆجەلان یاخۆ بەهۆی چێکردنی پێوەندییە نوێیەکانی لەتەك فەلەستینییەکان بە کرێگیرابوون .

به گوتەی چێلیك ئۆجەلان بووە پیاوێکی مەزنو دیار، ئەو توانی بەزوویی پشتیوانی بۆ گەریلاکان مسۆگەر بکەنو لە بنکەکانی مەشقی فەلەستینییەکان لە لوبنانو لە رووی سەربازییەوە خۆیان گورجکردەوە.

ئەودەم بۆ ماوەی زیاتر لە ساڵێك بو ئۆجەلان تورکیای بەجێهێشتبوو. ئەو لەماوەی ئەو ساڵەدا بەردەوام کاری کردبوو بۆ شوێن پا قایمکردنی لەو ژینگە سیاسییە پڕ سەرو سەدایەدا[61]. ئۆجەلانیش وەك زۆرێك لە هەڵهاتووان بە پێیانو بە رووتو رەجاڵی هەڵهاتو بە هێواشی سنووری تەنراوەکانی بڕی. ئەو بەهەماهەنگی لەتەك قاچاخچییە لۆکاڵییەکاندا توانی خۆی بگەیەنێتە ئەمدیو سنوور. هەوەڵین ئامانجی ئاپۆ لەهەوڵەکەیدا پاراستنی گیانی خۆی بوو، پاشان کاری کرد تا پێگەیەك بۆ راهێنانی خەباتکارەکان لە نێو خێوەتگە فەلەستینییەکاندا لە لوبنانو سوریادا دیاری بکات. فەلەستینییەکان نێوبانگ بوون بۆ هەماهەنگی لەتەك خەباتکارە غەوارەکاندا. لەوانە بۆ ماوەیەکی کورت هاریکاریی چەپگەراکانی تورکیان کردبوو لە سەرەتای حەفتاکاندا. وەلێ ئۆجەلان بەگشتی لە چێکردنی پێوەندییەکاندا شکستی هێنا، بەتایبەتی لە خۆناساندن لەتەك گروپە فەلەستینییەکاندا، کە بارەگای سەرەکییان لە دیمەشقدا پەنا دابوو. ئەوە بوو پاش ماوەیەکی کەم ئۆجەلان وازی لە دیمەشقو سوریا هێناو ملی رێگەی بەرەو لوبنان گرتە بەر.

لوبنان تازە بەتازە لەجەنگی نێوخۆیی پڕ دەردی سەر قوتاربیبوو، وڵات دابەشبیبوو بۆ دووبەرەی خەباتکاری فەلەستینیو کریستیانییەوە. ئەرتەشی سوریا کە لەساڵی ١٩٧٦ هاتبوونە ئەوێندەر تا پێشگیریی لەجەنگ بکەن، بەتەواوی کۆنترۆڵی دۆڵی بیقاعیان کردبوو ، ئەوێ شوێنێکە هەڵکەوتووە لە هەرێمی

[61] 4. The reconstruction of Ocalan's activities draws on Birand, *Apo ve PKK,* 108–118; Yuce, *Dogu'da,* Cilt II, 257 –260; and interviews with former PKK members and others who met with Ocalan during this period.

ڕۆژهەڵاتی لوبنان[62]. بەمجۆرە سوریا بەتەواوی بەسەر بەشێکی بەرین لەوڵاتدا دەسەڵاتی دەشکایەوە. ئۆجەلان لەوێ لە پایتەختی لوبناندا شوێنێکی دیکەی دۆزیەوەو پێوەندی لەتەك کوردانی نیشتەجێبووی ئەوێندەر چێکرد.

بەشی هەرەزۆری کۆمەڵگەی کوردیی لوبنان رەچەڵەکو رابردوویان دەگەڕایەوە بۆ تورکیا. کۆچی وان دەگەڕایەوە بۆ چەند دەیەیەك پێشترو دووا بەدووای شکستی راپەرینەکانی کورد لە بیستەکانو سییەکاندا لە زێدی خۆیان هەڵکەنرابوون. لە راستیدا کە تازە بەتازە دەگەیشتنە ئەوێ، ئیتر هەمیشە هەژاریو نەداری لەگەڵ ئەوانەدا هاورێ بوو، هەر بۆیە بەشوێن کارو کەسابەتدا دەگەڕانو لە کارگەو کۆمپانیاکانی بیناکاریدا دەستیان لەکار گیردەبوو[62]. ئۆجەلان دەگێڕێتەوە:" لەوێ چەندین خێزانی کوردو تورك ژیانیان بەسەر دەبرد، من بەنێوی عەلی بانگدەکرام، بەمجۆرە شەش مانگ بگرە ساڵێك تێپەڕی"[63]. لەکۆتایی ۱۹۷۹ یان لە سەرەتای ۱۹۸۰ دا بۆ هەوەڵجار ئۆجەلان لەتەك نایف حەواتیمەی بەرەی پشتیوانی دێموکراتی سوریا بۆ رزگارکردنی فەلەستین کۆبویەوە(د.ف.ل.پ)، لەو کۆبوونەوەیەدا کە شایەد لەلایەن کوردەکانەوە رێکخرابێت، ئۆجەلان لە بەیروتدا چاوی بە نایف کەوت. کە دوواجار ئەم گردبوونەوەیە بووە هۆی ئەوەی لە دووەم کۆبونەوەی گرنگو چارەنوسسازدا لە دیمەشق، ئۆجەلان ئەبو لەیلا (قەیس عەبدوللا کەریم) ببینێت، ناوبراو ئەندامی رێبەرایەتی سیاسیی گروپی فەلەستین بوو. ئەو زۆرکەمی لەبارەی چەپڕەوەکانی تورکەوە دەزانی. ئەبو لەیلا ئەوەی لەبارەی ئۆجەلانەوە بیستبووی زۆر قایلکەر نەبوو. هەربۆیە ناوبراو بە ئۆجەلانی وت:" گروپەکانی تر ئۆجەلانیان تۆمەتبار دەکرد بە بەکارهێنانی رێگەی تێرۆرو

---

[62] For an overview of Kurds in Lebanon, see McDowall, *Kurds of Syria,* 93–104.
[63] Birand, *Apo ve PKK,* 110.

توندو تیژ لەگەڵ نەیارانی نێو پارتەکەی‌و بەکارهێنانی ڕێگەی تری هاوشێوەی ئەوە". هەروەها ئاماژەی بۆ ئەوە دا کە گروپەکان لە رامەڵاداو لە بەشی خۆبەڕێوە بەری فەلەستین لە کەرتی خۆرئاوا ئەو زانیاریانەی پێدراوە. ئەبو لەیلا لە درێژەی وتەکانیدا دەیوت:"بەدڵنیاییەوە ئۆجەلان دانی نەدەنا بەمەدا، ئەو کەسێکی زۆر خەباتکار بوو لە پێگەو پلە ئایدیۆلۆژییەکەی خۆیدا". هەروەها دەیوت:" ئۆجەلان بەوردی دەربارەی پراگماتیزم‌و نوێکردنەوەی بیروبۆچونەکان دووا لەگەڵماو موحازەرەیەکی درێژی پێدام، هاوکات پێی وتم چۆن دەتوانین لە پراگماتیککەراکان قوتارمانبێت تا بتوانین جەنگ لەبەرامبەر دوژمنماندا هەڵبگرسێنین". شەوق‌و زەوقی ئۆجەلان بۆ وتوێژکردن لەبارەی بابەتەکانەوە و وەرگێرانی وتەکانی بۆ بەرامبەر لە نیوەی شەوەوە تا بەرەبەیانی خایاند. لە کۆتایدا ئەبوو لەیلا بەخەندەیەکەوە گۆتی:"ئەوە دژوارترین‌و گەرم‌و گوڕترین دیدارو کۆبوونەوە بوو لە ژیانمدا".

بەهەمان شێوە تێکڕای بەرپرسە فەلەستینییەکان کەوتنە ژێر کاریگەریی ئۆجەلانەوە. ئەوان دەیانگۆت ئێمە زۆرێك لە رێبەرە کوردو تورکەکانمان بینی بوو، بەڵام هیچ کام لەوان وادیار نەبوو جێ متمانەو باوەڕپێکراو بن. وەلێ ئەم پیاوە واتە ئۆجەلان وادیارە ئێجگار گەرم‌و گوڕو جدییە. ئەو نە یارمەتی دارایی گەرەکەو نە یاریدەی سەربازیی، تەنها گەرەکییە خۆبەخشەکانی رابهێنرێن‌و ئامادەبکرێن بۆ داهاتوو. بەرەی دێموکراتی لەسەرەتاوە رەزامەندی نیشاندا کە ژمارەیەکی کەم لە ئەندامانی پەکەکە بگرێتە خۆ، تا بتوانێت لەسەر شێوازەکانی جەنگی گەریلایی رایانبهێنێت. لەراستیدا ئۆفەرێکی لەمجۆرە بۆ گەریلاکانی پەکەکە شتێکی هەوانتەو نائاسایی نەبوو، بەڵکوو لە سەردەمە جۆراو جۆرو جیاکاندا بەرەی دێموکراتی فەلەستینی هاریکاریی زۆرێك لە شۆڕگێرەکانی دنیای کردووە لەوانە ساندیانیستەکانی نیکاراگوای، کۆمۆنیستەکانی یۆنان، چەپەکانی ئێران‌و تەنانەت

غەوارە سعودییەکانی داڵدەداوە. لەم بارەیەوە مەمدوح نوفل دەیوت:"مادام بۆ خۆمان مارکسی‌و لینینی بووین، هەموو گروپە مارکسی‌و لینینییەکان لەلامان پەسەند بوون". مەمدوح سەرکردەیەکی سەربازیی پێشووی بەرەی دیموکراتی بوو، ئەم بەرەیە گەورەترین رەوتی نێو رێکخراوی رزگاریی خوازی فەلەستینی بوو. ناوبراو لە شوێنێکی دیکەدا دەیوت:"ئێمە شۆڕشگێڕبووین، هەربۆیە پشتیوانی بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکانیش بووین". لەراستیدا دەکرا چەندین هۆکاری مەلموس چنگ بخەین کە لەپشت هاریکاریی بەرەی دیموکراتی فەلەستینییەوە بۆ کۆمەڵ‌و پشتیوانییەکانی".

داڵدەدانی گروپە چەپخوازەکانی تر ئەو هەستەی دەگەیاند کە دەخوازرێت بەرەی رزگاریخوازیی فەلەستینی دابنرێت بە بەرەیەکی رزگاریخوازیی لەلایەن هاوپەیمانانەوەو هاوکات وەك بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕیی نێونەتەوەیی نێوزەد بکرێت. ئەم رەوشەیش هاریکاریی فەلەستینییەکانی دەکرد تا لەکاتی زێدەبوونی تەنگژەکانیان لەگەڵ ئیسرائیل بیانخەنە مەتەرێزی نەیارەکەیانەوە. هەرچەندە بەرەی دیموکرات هیچ پلانێکی ئەوتۆی نەبوو تاوەکو کورد لە جەنگی دژە ئیسرائیلدا وەربدات. ئەوەش لە ئاماژەیەکی مەمدوح دا روونددەبێتەوە کە پێی وابوو ئەوکات گەریلاکانی پەکەکە ئێجگار بێ ئەزموون‌و سادە بوون. وەلێ ئەوەیشیان لەلا گەلاڵە ببوو کە چەکدارەکانی پەکەکە دەتوانن بەرگری لە بنکەکانیان بکەن لەکاتی هەر هێرشێکی ئیسرائیل بۆ سەریان.

هاوکات ئەو دەم پەکەکەیش ئەوەی نومایانکرد کە ئەوان نایانەوێ لەجەنگی ئیسرائیل تێوە بگلێن. سەبارەت بە بۆچوونی پەکەکەیش نۆفل وتی: پەکەکە دارای بەرژەوەندی تایبەت بەخۆیان بوون‌و ئێمەیش هیچ دەستێوەردانێکمان نەبوو لە سیاسەتیاندا". لەم سەروبەندەدا و لە نیوەی هەوڵی هەشتاکاندا ژمارەیەکی کەم لە یاخیبووانی پەکەکە پەڕینەوە بۆ سووریا بەمەبەستی راهێنانیان‌و

پرچەککردنیان. ئەوەیش پاش ئەوەی سەربازانی کۆدەتا سەربازییەکە زێدەتر جێدەستیان لە فەرمانبەرداری وڵاتدا جێگیر ببوو. پاش گەیشتنیان لەنێو کەمپەکانی بەرەی دیموکراتی فەلەستینیی لە لوبنان بڵاوەیان پێکرا. بۆنموونە ئۆردوگای حلوە لەسەر لێواری سوریە. ئەویّ واتە دۆڵی بیقاع زۆردوور نەبوو لە ئاوایی حلوەی سەر بەلوبنان.

لەراستیدا سوریە ساڵی ١٩٧٦ دۆڵی بیقاعی لوبنانی داگیرکردبوو تابەو هۆیەوە بتوانێت پارێزگاری لە سنوورەکانی خۆی بکات. بەمەیش تۆپخانەی چڕو پڕی سوریە فرە بەقورسی گەمارۆی گردۆڵکەکانی دەوروبەرەکەی دەدا. ساڵی ١٩٨٠ کاتێك گەریلاکانی پەکەکە لە سەربازگەی حلوە رادەهێنران، ئەوکات کەمپەکە تەنها لەتوانایدا بوو ١٠٠ گەریلا لەخۆی بگرێت[٦٤]. لەوێدا بنکەی سەرەکی بەکاردەهات بۆ راهێنانی سیاسییو مشتومڕە فیکرییەکانو سیّ یان چوار خانەی گچکەتر هەبوون تایبەتبوون بە چێشتخانەو تەوالێتو ژووری نوستنی گەریلاکان. وانەو بابەتە سەربازییەکان لە هۆڵێکی گەورەتردا بەرێوە دەچوون. لە گردۆلکەکانی دەوروبەریشدا گەریلاکان بە شێوەیەکی کرداریی راهێنانیان پێدەکرا، ئەویّ وێنەیەکی بچووکی هەرێمەکوردییەکان بوون، کە بڕیاربوو لەوێدا پلانەکانیان دارێژن بۆ خەباتی چەکداریو جەنگ. کوردەکانو فەلەستینییەکان بەگشتی مەشقە سەربازییەکانیان پێکەوە ئەنجام دەدا، وەلیّ لە راهێنانە تیۆرییو سیاسییەکاندا جودا دەکرانەوەو لە پۆلی جیاجیادا گۆشدەکران. نۆفل ئاماژەی بەوەداوەو وتویەتی:" کۆرسە سەربازییەکان بەگوێرەی گروپەکان دەوترانەوە". هەروەها دەیگۆت:" هەندێك لە کۆرسەکان تایبەتبوون بە مەوادی تەقینەوە، ئەم کۆرسانە دە رۆژ تا دوو هەفتەیان پێویستبوو بۆ یادگیریی. هەروەها هەندێك لە خولەکان دوو

---

[64] Description of the camp provided by Kurdish militants who trained there and the DFLP's Nofal and Abu Laila.

مانگی دەخایاند، بۆنموونە بۆ ئەفسەرانی ئەرکان، ئەوان کۆرسەکانیان لە یەکەی سەربازیی، تۆپۆگرافی، تەقینەوەو تۆپخانەو جەنگی گەریلایی وەردەگرت. فەلەستینییەکان کەسانێکی بەئەزموون بوون لە جەنگو جیدالدا، هەر بۆیە ئەندامانی پەکەکەیان رادەهێنا لەسەر بنچینەکانی شێوازی خەباتی گەریلاییو جەنگی دەستەو یەخەیی. لەم بارەیەوە باران دەیوت:" ئێمە هیچ ئەزمونێکمان لە مەڕ خەباتی گەریلایی نەبوو، وەلێ فەلەستینییەکان دارای ئەو ئەزموونە بوون، هەر بۆیە خولەکانیان وادیاربوو دروستو فرە پڕبایەخ بوون". هاوکات فەلەستینییەکان رێگەکانی دیکەی هەڵگیرساندنو سەرکەوتنی جەنگیان فەرامۆش نەکردبوو، ئەوان گەریلاکانیان رادەهێنا لەسەر نەزمی پڕوپاگەندەو رێکخستنی هاوڵاتیانی مەدەنی بۆ خزمەتی ئامانجەکان. یەکێك لە دیارترین ئامڕازەکانی جەنگ کە فەلەستینییەکان بۆ خەباتکارانی پەکەکە دەستەبەریانکرد، بریتی بوو لە خولەکانی بایەخدان بە میلیشیای مەدەنی لە پێناو کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر جموجوڵە سەربازییەکانو دابینکردنی خۆراكو شوێنو دامەزراندنی لیژنە تایبەتییەکانی وەك لیژنەی قوتابیانو ژنان تا لەم رێگەیەوە ئاسانتر کۆمەكو کۆنترۆڵی شوێنەکان دەستەبەر بکرێن. لەنێوان ساڵانی ۱۹۸۰و ۱۹۸۲ دا زیاد لە ۳۰۰ خەباتکاری پەکەکە گەیشتنە سوریا بەمەبەستی راهێنانو خۆکۆکردنەوە. رێژەی گەریلاکان بەجۆرێك گەشەی کرد کە ئیتر کەمپەکانی بەرەی دێموکرات نەیدەتوانی زێدەتر پەنای پەنابەرەکان بدات. لەم بارەیەوە نۆفل گلەو گازاندەی رەوشەکەی گەیاندە ئۆجەلانو ئەوەی درکاند کە راهێنانەکان تێچوونێکی فرەو بارێکی سەختی خستووەتە سەرشانی گروپەکەیان. لەراستیدا بەرەی دێموکرات تەنها بڕی پارەی بۆ تێچوونی خەباتکارەکان لە بنکەکانیان تەرخان نەکردبوو، بەڵکوو بەگوێرەی ئاستە جوداکان پارەی مانگانەی بۆ ئەندامان دابین دەکرد کە لە ۱۰ دۆلارەوە بیگرە تا سەد دۆلارو سێ سەد دۆلار دەگەیشت. نۆفال لەم بارەیەوە دەیوت:" تێبینیمان کردبوو کە

پەنابەرەکان دەستیان دابوویە هێنانی ئەندامانێکی ئێجگار زۆر بۆ نێو کەمپەکانمان. ئێمەیش گوتمان ئێمە ناتوانین رازی بین ئەو هەموو ئەندامە لە خۆ بگرین ئەوە بۆ ئێمە تێچوونێکی زۆر گەورەی گەرەکە" . نۆفل پێشنیاری کرد چی دی پێویستە راهێنانی پەکەکە لە شوێنە تایبەتییەکانیان لە بیقاع یان لە ئاپارتمانەکانی دیمەشق بێت، ئەو شوێنەی کە زۆرجار ئۆجەلان تێیدا دەمایەوە. هەر بۆیە لەهەمانکاتدا ئۆجەلان فرە بە گورجو گۆڵیو سەرکەوتوانە لەلایەن رێکخراوە فەلەستینییەکانی دیکەوە یەکەی تایبەتی بۆ راهێنان دەستەبەر کرد. ئەمەیش بواری رەخساند تا ئەندامانی پەکەکە لەنێو بەرەو رەوتە جوداکانی فەلەستیندا پەرشو بلاو ببنەوە، لەوانە رێکخراوی فەتحی یاسر عەرەفات، بەرەی گەلی جۆرج حەبەش بۆ رزگارکردنی فەلەستین، بەرەی خەباتی گەلی فەلەستیی سەمیر غوشەو هەروەها پارتی کۆمۆنیستی لوبنانی. لە راستیدا خەباتکارانی کورد ئێجگار گەلکگیریی ئەوان بوون، چونکە دەکرا ببنە سەنگەر بەندێکی بەهێز لەکاتی رووداني هەر هێرشێکی سەربازی ئیسرائیلدا یاخۆ دەکرا ببرێنە بەرەکانی رووبەرووبوونەوە لەگەڵ نەیارەکانیان.

هەموو ئەو خەباتکارانە ببوونە سەرباز یاخۆ جەنگاوەرێکی بەهێزو کارامەو بەسوود. ئەبوو لەیلا وتبووی:" ئەوە ئاشکرا بوو کە عەبدوڵا ئۆجەلان دارای بنکەیەکی جەماوەریی بەرفراوان بوو، پیاوەکانیشی دیسپلینترو یەککرتوو تر بوون لە ئەندامانی گروپەکانی دیکە. ئێمە بیرمانکردەوە کە ئەم گروپە مەترسیدارترین گروپە لە کوردستانی تورکیا دا، هەر بۆیە ئێمە ئەو گروپەمان لەنێو کەمپەکانی خۆماندا پاراست". گەریلاکانیش تاڕادەیەك عەقلانی دەیانڕوانییە بارودۆخەکە.

چیلیك لە روونکرنەوەیەکدا دەیوت:"ئێمە لە هەر شوێنێك بماینایەتەوە هەمان بەرگمان دەپۆشی، هاوکات لەسەر ئەوە کۆك بووین کە لە جەنگو جیدالی نێوان گروپە فەلەستینییەکانو فەلەستینییو لوبنانییەکان نەگلێن". وەلێ دابەشبوونی

ئەندامانی پەکەکە بەسەر گروپە فەلەستینییەکاندا هیچی لە بارگرانی گەریلاکان بەسەر شانی ئەو ڕێکخراوە فەلەستینیانەوە کەمنەکردەوە، بەڵکو نیازیان بوو پەکەکە وەك پەرژینێك بۆ ئامانجو خواستەکانیان بەکاربهێنن. چیلیك لەم ڕووەوە دەپرسی:" بە هاتنمان بۆ سوریا چیمان بەدەستهێنا. پاشماوەیەك دۆشدامان، لە ڕاستیدا ئێمە وەك ڕێکخراوێك لە پاش ١٩٨٠ کۆتایمان پێهێنرا بوو. ئێمە دارای هیچ هێزو هەرەکەتێك نەبووین نە لە ئەوروپاو نەیش لەتورکیا، ئێمە لەزینداندا بووین، تەنها لە سوریا توانیمان بۆ خۆمان خۆمان گرد بکەینەوە. ئێمە ماوەیەکی فرەکەم بوو دەستمان گەیشتبووە پوڵو پارە، ناچار بووین خەڵکیمان دەنارد بۆ ئەوروپا تا لەوێ کاربکەن. لە فەلەستینییەکانیشەوە شتانێك فێربووین. لەوانەوە فێر بووین لەمەراسیمی شەهیدەکانمانداو لە بۆنەکاندا خۆپیشاندان ئەنجام بدەین. هاوکات شتانێکی فرەمان لەسەر جەنگی خەڵكو ڕاهێنانی سەربازی خوێندەوەو ئەنجاماندا. ئەوان جلو بەرگو جگەرەیان پێدەداین. ئێمە گەلێ قەرزداری فەلەستینییەکانین".

## وابەستەگی سورییەکان

لەراستیدا یاخی بووەکان ڕەنگە ویستبێتیان سنووربەزاندنیان بۆ سوریا بەشێوەیەکی نهێنی بێت، وەلێ دەزگای هەواڵگیریی سورییە ئاگاداری ڕەوشەکە بوو[٦٥]. کامەران حاجۆ ئاماژەی بەوەکردو وتی:" کە کاتێك پەنابەرەکان دەگەیشتنە سوریا لەسەریان بوو نێوی نهێنی بۆ خۆیان بەکاربهێنن، هەروەها ئێمە حەشارمان دەدان لە ماڵەکانی خۆماندا". پاشان لەدێهاتە سنوورییەکانی قامیشلۆدا قوتابیانی ئامادەیی کورد دەژیان. هەروەها دەیوت:" ئێمە واماندەزانی کەس هیچ شتێك

[65] Additional information on Syrian attitudes toward militant groups comes from Reuven Ehrlich, "Terrorism as a Preferred Instrument of Syrian Policy," Institute for Counter-Terrorism (Israel), www.ict.org.il and interview with Ely Carmon of the ICT

نازانێت، بەڵام ئەوە تێگەیشتنێکی ساویلکانە بوو، لەکاتێکدا هەندێك لە کوردەکانی تورکیان پێیان وابوو ئەوان بە شاراوەیی‌و ئەسپایی گەیشتوونەتە جێ. لەراستیدا هەندێك ئەو هەستەیان هەبوو، وەلێ ئەمە زۆری نەخایاندو هەر زوو بۆیان دەرکەوت کە هەموو ئەوانەی سنوور شکێنییان کردووەو بەوردی لەژێرچاودێریدان. یەکێك لە خەباتکارەکانی گروپی رزگاریی لەلایەن یەکێك لە دەزگەی هەواڵگریی سوورییەوە سەردانی کرابوو، پاش رۆژێك لە دەرکەوتنی ئەو کەسە لە سوریا دا. " سوورییەکان چۆن زانیان تۆ لەم وڵاتەدایت". ئەوە پرسیاربوو لە ئەندامێکی پێشووی گروپەکە بەنێوی کامەران. لەوەڵامدا وتبووی:" ئێمە هێندەی بوترێت یەك‌و دوو لە سنوور پەرینەوەو گەیشتینە ماڵە کوردێك . ئەویش راستەو خۆ خۆی گەیاندە دەزگای هەواڵگریی نێوچەکە، لەوێ پێی راگەیاندن کە میوانێکی غەوارەی هەیە، گەر وای نەکردایە ئەوە رووبەڕووی گێچەڵی دەزگا سیخوڕییەکان دەبوویەوە". لەپرسی ئەوەی ئایا دەمێننەوە لە سوریا یان نا، لەکاتێکدا دەسەڵاتدارانی ئێرەیش فەرمانرەوایی وڵاتەکەیان بەجۆرێکە کوردەکان دەچەوسێننەوە، ئەوەیش پرسیارێك بوو زۆرچار دەوروژا. هەروەها کامەران دەیوت:" لە مشتومڕی ئەوەدا بووین ئایا دەتوانین رێگە بدەین بە خۆمان لە ژێر دەسەڵاتی سوریادا بمێنینەوە، ئەم مشتومڕە لەکاتێکدا بوو کە جیا لە رژێمە غەدارو سەربازییەکەی تورکیا ئەو راستییە گەلاڵە ببوو کە سوریا زیاد لە تورکیا رژێمێکی چەوسێنەرو دیکتاتۆرو دووا کەوتوو بوو لە نەزمی سیاسیدا.

لەبەر ئەوە گروپێك لە کوردەکان لە دووی بەدیلێك دەگەڕان بۆ رژێمی سوریا، ئەوان پێیان وابوو بیری پشت بەستن بەدیمەشق بیرێکی هەڵەیەو تەرەفداری سوریە نەبوون، ئەوان نیازیان وابوو بنکەی هێزەکانیان بەرنەوە خودی کوردستان، ئەگەرچی ئەودەم کوردستان بەشێك بوو لە ئێراق‌و تورکیا. وەلێ بەبێ رەچاوکردنی

ئەوەی ئایا ئەوانە دەیانەوێ لە دەرێی سوریە کار بکەنە یان نا، تەواوی گروپەکان نوێنەران‌و کەسە بالأکانیان لە پایتەختدا هێشتەوە.

ئیبراهیم ئایدن رێبەری پێشووی پەکەکە لەم بارەیەوە دەیوت:" لەراستیدا ناکۆکی‌و مشتو مڕ لە گۆڕێدا بوو، ئایا پشت بەسوریا ببەستن یان نا، وەلێ زۆرترین ناکۆکی لەسەر پرسی رۆژهەلاتی نێوەراست بوو". لەسەرەتاوە پشتیوانی سوریا بۆ گروپە کوردییەکان فرە لاوەکی‌و بێ سەرو سەداتر بوو تا ئەوەی ئاشکراو روون بێت. ئەوەیش مانای ئەوە بوو کە دیمەشق نایەوێت دەرگا لەبەردەم ئاوارە نا یاساییەکانی تورکیا دابخات، ئەوکات بەربەستیش لەبەردەم پەنابەرەکان دروست ناکات تا شوێن بۆ حەوانەوەو مەنزڵ بۆ ژیانیان لە ولأتەکەیدا دابین بکەن‌و هاوکات رێگەیشی نەدەگرت لە هامو شۆی گروپەکان لە سوریاوە بەرەو لوبنان.

سوریا هیچ کام لەوانەی نەکرد، لە هەمانکاتیشدا بایەخی نەدەدا بەوەی هانی کەسانی تر بدا زێدەتر پەنا بەرنە بەر ولأتەکەی. لەسەرەتاوە سوریا نیگەرانی ئەوە بوو کە کوردی ولأتەکەی بەهەمان شێوە بیری دژ راوەستان دژ بە میریی لەکەلەیان زیندو نەبێتەوە، هەر بۆیە نیازی بوو دڵنیا بێت لەوەی ئەو رەوشە کارناکاتە سەر ئەوانیش.

پەکەکە زۆر باش ئاگاداری سنوورو تەڵەزگەکانی سوریابوو، سەرەڕای ئەوەیش دروشمە فەرمییەکانی خۆی دەبینییەوە لە کوردستانێکی سەربەخۆ، کە کوردستانی سوریایشی دەگرتەوە. چیلیك دەیوت:" ئەوە زۆر روون و رەوان بوو کە ئێمە هیچ چالاکییەکمان رانەدەپەڕاند کە دژ بێت لەگەڵ سوریا، لە راستیدا هیچ بڕیارێکیش لە گۆڕێدا نەبوو، ئێمە باش ئەوەمان لە گوێ گرتبوو کە ناتوانین هیچ کارێکی ئەوتۆ لەوبارەیەوە ئەنجام بدەین، ئەوەیش کورتەی باسەکە بوو".

هاوکات گروپە فەلەستینییەکانیش کە دەستگرۆیی کوردەکانیان دەکرد، هەمیشە بەرژەوەندی سوریایان لەپێشچاو دەگرت‌و بەوردی سەرنجیان دەدایە ئەو

مەسەلەیە. سوریایش پشتیوانێکی گرنگ بوو بۆ فەلەستینییەکان، بەتایبەتی لەو جەنگەی کە ئیسرائیل بۆی تواندبوونەوە.

کۆنترۆڵی سوریا بەتەمامی ببووە ئەمری واقیع لە لوبناندا. هەر بۆیە جیهانبینی سوریا دەبوو لەنێو هەموو فەلەستینییە چالاکوانەکانی نێوان سوریەو لوبنان رەچاو بکرایە، بەتایبەتی ئەو گروپە سیاسیانەی کە بارەگا سەرەکییەکانیان لە دیمەشقی پایتەختدا بوون دەبوو رەنگدانەوەی سیاسیی سوریا لە ئەدای کاریاندا نومایان بووایە. مەسعود ئەکیولێ، کە ناوێکی خوازراوی چەپگەرێکی تورك بوو دەیوت:" بەبێ روخسەتی سوریا، هیچ گروپێکی فەلەستینی نەیدەتوانی لە تەڤگەرە کوردیو تورکییە ئاوارەکان نێزیك بێتەوە". ناو براو لەو دەمەیدا هامو شۆی نێوەوەو دەرەوەی سوریای دەکرد، لە شوێنێکی تردا ئاماژەی بەوە دەکردو دەیوت:" روخسەتو بەڵێنی سوریا مەرجی سەرەکی بوو". لە راستیدا یەکێك لەو هۆکارانەی کە سوریا راستەوخۆ خۆی لە رێکخراوە کوردییەکان تێ نەدەگەیاند، دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە سوریا دەیەویست واخۆی پیشانبدات کە ئەو جەنگاوەرە هەڵهاتووانەی ژێر رکێفی دادو ئەمانی تورکیا لە کیشوەری ویدا نین.

گروپە ئۆپۆزسیۆنە کوردو تورکییەکان شوناسنامەیان لەلایەن گروپە فەلەستینییەکان، کوردانی ئێراق، پارتی کۆمۆنیستی سورییەکان، گروپە ئۆپۆزسیۆنەکانی ترو تەنانەت هەندێك کات لەلایەن دەزگای هەواڵگریی سورییەوە شوناسنامەیان بۆ دەکرا . دیارە ئەوەیش تەنا لەپێناو ئەوەدا بوو کە تورەیی بێئەندازەی تورکیا لەمەڕ رەوشەکە رابگرن. کامەران لەم بارەیەوە دەگێرێتەوە:" ئێمە هەموومان نێوی عەرەبیمان لێنرابوو".

کامەران لەلایەن دەزگای هەواڵگری سورییەوە شوناسنامەی بۆ دەرهێنرابوو، ئەو لە شوناسنامەکەیدا وەك کوردی ئێراقی ئەژمارکرابوو. سورییەکان ئێمەیان ناچارکردبوو کە ئەو شوناسنامانە وەربگرین بۆ ئەوەی گەر هاتوو تورکیا داوای کرد

بگەڕێینەوە بۆ زێدی خۆمان، پاساوی ئەوەیان هەبێت کە بڵێن کەسانێك شك نابەین بەشێوەیەکی نایاسایی لە وڵاتدا بن. لە راستیدا سوریا ناکۆکیگەلێکی فرەی لەتەك تورکیادا هەبوو، ئەوان دانوویان پێکەوە نەدەکولاً، هەر بۆیە ئەم دەرفەتو دەرەتانەی بۆ گروپە توندڕەو و خەباتکارە یاخییەکانی تورکیا رەخساندبوو، گەر نا هەرگیز بوارێکی لەم جۆرەی بۆ ئەو هەموو گەریلاو خەڵکی جیاجیاو گەجەرو گوجەر نەدەکردەوە کە روو لە وڵاتەکە بنێن[٦٦].

سوریا هەمیشە خوازیاری پارێزگای ئەسکەندەرۆنەبوو، کە لەپاش راپرسی ١٩٣٩ تورکیا توانی بەتەواوی لە ژێر رکێفی سوریا بیهێنێتە دەر. هەر بۆیە سوریا هەرگیز بە فەرمی ئەو پارێزگایەی وەك بەشێك لە تورکیا نەدەناسی. پشێوی‌و پەستی تورکیایش لەوە بوو کە نەخشەکانی سوریا بەردەوام ئەوەیان دەخستە پێشچاو، نێوی پارێزگای هاتایان گۆڕیوەو وەك بەشێك لە وڵاتی خۆیان لە نەخشەدا دیارییان کردووە.

هەروەها زێدەتر ئەسەد نیگەرانی ئەوەبوو، تورکیا مژوڵی دروستکردنی پرۆژەی بەرفراوانی گاپ بوو بەنیازی گلدانەوەی ئاوی رووبارەکانی دیجلەو فورات، تابتوانێت بەو هۆیەوە بۆمەبەستی کشتوکاڵی نێوخۆ یاخۆ بوارەکانی کارەبا کەڵکیان لێوەربگرێت. هەردوو رووباری دیجلەو فورات کە لە تورکیاوە هەڵدەقوڵێن، پاش ئەوەی دیجلە دەڕژێتە نێو بەشێك لە سنوورەکانی سوریاو پاشان دەچێتە نێو ئێراق، هەروەها فوراتیش سەرانسەری سوریا تەی دەکاتو دواتر دێتە نێوخاکی ئێراق، ئەم رووبارانە بەهۆی پرۆژەی گاپەوە دەدەن لەکەمی‌و وشکی‌و دەیمیی رووبەکاتە بەشێکی گەورە لە زەوییەکانی سوریا. هەروەها سوریا لەو بڕوایەشدا بوو کە تورکیا داڵدەی ژمارەیەك لە ئەندامانی برایانی موسڵمان، هێزی چەکداری

[66] Information on Syrian-Turkish discontent largely drawn from Makovsky, "Defusing the Turkish-Syrian Crisis," and Daniel Pipes, "Hafiz al-Asad Should be Careful," *Turkish Times*, Dec. 15, 1994

ئۆپۆزسیۆنی دابوو کە هەستابوون بە هێرشێکی هەمەلایەن بۆ سەر حکومەتی سوریا بەتایبەتی لەو کاتەوەی کە ئۆجەلانو هاوەڵەکانی پەڕیبوونەوە بۆ نێو خاکی سوریا[٦٧].

لەم ڕەوشەدا سوریا تەنها هەڵبژاردنێکی لاوازی لەبەردەمدا بوو، لەکاتێکدا فشارەکانی تورکیا بۆ سەر خاکو خەڵك ڕووی لە زیادی دەکرد، هەر بۆیە تورکیا لە ڕووی دانیشتوانو خاکەوە کە پێنج جار قەبارەی هێندەی سوریا دەبوو فرە بەئاسانی لە بگرەو بەردەکەدا دەیدۆڕاند. هاوکات تورکیا بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ ئەندامی ناتۆو هاوپەیمانێکی بەبەهای ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بوو. سنوری تورکیا لەتەك بەشی خۆرئاوای دووری یەکێتی سۆڤییەت، ئەوەی دابیندەکرد کە بەلایەنی کەمەوە لە بگرەو بەردەکانی جەنگی ساردا ناکرێت دەستبەرداری تورکیا ببن.

ئەسەد باش لەو ڕاستییە گەیشتبوو، کە لە ڕووی سەربازییەوە چەنسێکی ئێجگار کەمی هەیە بۆ ئەوەی بتوانێت دژ بە تورکیا بوەستێت. هەر بۆیە باشترین دەر فەت بۆ سوریا کە کاربکاتە سەر سیاسەتی تورکیا پەیدا کردنی گروپو دەستەیەك بوو کە زۆرانبگرێت لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی تورکیا. هەر بۆیە گەڕان بۆ دۆزینەوەی نوێنەرو نێوەندێك تا ململانێ هەرێمییەکان بەقازانجی سوریا هەڵسوڕێنێت شتێکی نوێو نادان نەبوو بەنیسبەت سوریاوە. لەڕاستیدا سوریا دارای ڕابردوویەکی زەنگین بوو لە پشتبەستن بە هێزو گروپە غەوارەو دەرەکییەکان تا برەو بدات بە ئامانجە سەربازیو سیاسییەکانی خۆی[٦٨].

---

[67] This was a frequent complaint of Syrian officials, who made their views clear to many Turkish and Kurdish militants. Jalal Talabani also discusses this in Birand, *Apo ve PKK,* 199

[68] For details on Syria's general approach and policy goals see Ehrlich,

بۆ نموونە ڕێکخراوە فەلەستینییەکان کە سوریا پشتگیریدەکردن، ئێجگار بەسوود بوون، هێرشەکانی ئەوان دژ بە ئیسرائیل زێدەتر کۆمەکی دەکرد بە ئارەزووی ئەسەد بۆ لاوازکردنی کیانی جوو لە نێوچەکەدا، هاوکات ئەوان شوێن پای ئاسایشیی ئەسەدیان لە لوبناندا زێدەتر پایەدارو پتەو دەکرد، کە دەکرا ئەوە بەکاربهێنرێن دژ بە وڵاتە عەرەبییەکانی دیکە گەر پێویستی بکردایە.

هەموو ئەم دەستکەوتانە دەکرا بەدەستبهێنرێن بەبێ ئەوەی سوریا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ تێوە بگلێنرێت لە بگرەو بەردەی هەرێمیو مشتومڕی دەرەکییەوە. لە ڕاستیدا سوریا لەپێناو ڕێبەرایەتی کردنی هەرێمەکە کەوتبووە کێبەرکێیەکی سەختو دژوارەوە لەگەڵ ئێراق. ئەودەم کوردانی ئێراق لە پاش هەرەسی خەباتەکەیان لە ساڵی ١٩٧٥ دا، بەتەواوی دوچاری ڕەشبینیو نامۆبوون ببوون، هەربۆیە لەو قۆناغەدا ئامادەییان دەر دەبڕی بۆ ئەوەی بێنە بەرەی سوریاوە لە ململانێکانیاندا لەتەك ئێراق[69]. لە هەوەڵ ئەنگاودا جەلال تاڵەبانی توانی مافی پەنابەرێتی لە سوریا وەربگرێتو پاشان توانی لە دیمەشقی پایتەختدا ڕێکخراوێکی نوێ بەنێوی یەکێتی نیشتمانی کوردستان دابمەزرێنێتو هەوەڵ بەیانی دامەزراندنی ڕێکخراوەکە لە دیمەشقدا وەشانبکات، هاوکات پارتی سۆشیالیستی کوردستان پاش ئەوەی ساڵی ١٩٧٩ لە یەکێتی جودا دەبێتەوە، بەهەمان شێوە بارەگاکانی لە دیمەشقدا دەهێڵێتەوە، هەروەها حزبی شویعی عێراقیش کە هاوپەیمانی کوردەکان بوو، دیسانەوە بارەگاکانی لە دیمەشقدا بوون.

---

"Terrorism . . . Syrian Policy" and Maoz, *Asad,* 170–177; information on Syrian-Iraqi relations is taken from Maoz, *Asad,* 112–113, 146–147

[69] Details taken from McDowall, *Modern History,* 343 – 347; see also Montgomery, *Kurds of Syria,* 136–139

دیاره نەرمو نیانی سوریا لەگەڵ گروپە کوردییەکان ئێراقو سوریا، ئاماژە نەبوو بۆ چۆنییەتی مامەڵەکردنی ئەو رژێمە لەتەك کوردەکانی خۆیدا[٧٠]. چونکە هەمیشە دیمەشق بەوە زەندەقی چوبوو کە کوردەکانی خۆی داوای خۆ بەڕێوەبەری بکەن یاخۆ ببنە مەترسی بۆ سەر جڵەوی ئارامیو ئاسایشی وڵاتەکەی. هەر بۆیە لە شەستەکاندا نێزیکەی سەدو بیست هەزار هاوڵاتی کورد لە سوریا مافی هاوڵاتیبوونیان لێ زەوتکراو ناچارکران لە هەرێمە بێ پیتو بەرەکەتەکاندا ژیان بگوزەرێنن، ئەوان زۆرێك لەمافە سەرەتاییەکانیان لێ قەدەغە کرا.

کورد بۆی نەبوو موڵكو ماڵو ماشینی هەبێت، هاوکات بۆیان نەبوو پاسپۆرتیان هەبێت تا وڵات بەجێبهێڵن یاخۆ پیشەو پێناسی دیاریکراویان نەبوو. هەروەها سوریا هەموو جۆرە پارتێکی سیاسیی کوردی لە وڵاتدا قەدەغەکردبوو، هاوکات هاو شێوەی تورکیای دراوسێی کۆتو بەندی بەسەر هەموو جۆرە جموجوڵێکی زمانو فێرکارییو بڵاوکراوەی کوردییەوە دانابوو. کوردانی سوریا ئێجگار پەستو رق پیشاوە بوون لە بەرامبەر ئەو کۆتو بەندو سنوورانەی رژێمدا، وەلێ زەبرو زەنگو دڕندەیی رژێمو دەسەڵاتداران کە ئەسەد ڕێبەرایەتی دەکرد، چەنسێکی ئێجگار کەمی بۆ کوردی سوریا هێڵابوویەوە. بەڵام لە قامیشلۆ و لە شارۆچکە کوردییەکانی هاوسنووری تورکیاو سوریا، بەکاریگەریی پەکەکەو گروپە کوردییەکانی دیکە بەجۆشو خرۆشێکی زۆرەوە کاریگەرییان لەسەر دانرابوو. هاوکات مشتو مڕو شەڕی نێوان چەندین رەوتی ناکاریگەری کوردی سوریا، کوردانی لە وەهمو خورافیاتو پوچەڵی سیاسەتی ئەو گروپانە هۆشیارکردبوویەوە. هاوکات لەگەڵ مەلا موستەفای بارزانیدا ئەوان بەشێوەیەکی دڵسۆزانە نەوینە خەباتو بوونە پارویەکی چەور بۆ ئامانجەکانی هەڵایسان.

---

[70] For details see Montgomery, *Kurds of Syria,* and McDowall, *Kurds of Syria*

## ئۆج ئالان پێدەگات

ئۆجەلان هەمیشە خۆی وەك ڕێبەری بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد بینیوە لە تورکیا. ئێستا کە ئەو لە دیمەشق جێگیر کراوە، کاتی هەبوو بۆ ئەوەی کۆڵینەوە بکات و بزانێت چ هێزێك مابوونەوە بۆ ململانێکان[71]. توندڕەوترین ڕێکخراوەکان لە هەوڵی دووبارە دامەزراندنەوەدا بوون، ئەوان بەشی زۆریان لە زینداندا بوون ، ڕێبەرە ڕزگاربووەکانیشیان نەیاندەزانی پلانی داب ی و داهاتوویان دەبێت چیبێت. هەموو بەڵێن و پەیمانێك کە چەپڕەوە کوردو تورکەکان دابوویان تێکڕا بە کارەسات کۆتاییان هات. فەرمانڕەوایی بە زەبرو زەنگی ڕژێمی سەربازیی هەرگیز تا ئەو کات ئەزموون نەکرابوو. مەتین کەهرەمان کە هاوسۆزێکی چەپ بوو، ٢٥ ساڵ پێش ئێستا وتبووی: " هەموو کەس لە شۆك و شپرزەییدا بوو، من بۆ خۆم تێکشکابووم" . لەڕاستیدا بە ڕوودانی کۆدەتاو تەنانەت تا یەك دوو ساڵێك پاش کۆدەتایش لێرەو لەوێ و لە چەند شوێنێکی دوورو دابڕاو و تەق و تۆق و لە ڕوو وەستانەوەی میریی ڕوویدەدا. وەڵێ ڕاستییەکەی ئەو وردە بەرەنگارییانە هیچ ئەنجام و جۆششێکی نەدایە ڕەوشەکەو بگرە نەهامەتی و نانیانی زێدەتر پەرەی گرت[72] .

لە بۆ ئۆجەلان توانەوەو داڕمانی سەرلەنوێ جەماوەریی گروپ و پارتە سیاسییەکان مایەی پرسیار نەبوو. بەڵکو لە مەژگی ئۆجەلاندا ئەو ڕەوشە تەنها

---

[71] The analysis of Ocalan's activities and plans during this period is based on interviews with those who had contact with him during this period. It also draws on the unpublished English-language copy of Mesut Akyol's political autobiography, "A Slice of My Life." Information about the 1st Conference comes from Birand, *Apo ve PKK,* 116–117, Imset, *the PKK,* 32–33, and Celik, *Agri,* 53–54

[72] Quoted in "Express" dergisi, Sept. 2005, 58

هەنگاوێك بوو بۆ نومایانی تواناکانی رێبەرایەتی کردنی رەوشەکە. وەك ئەوەی چەند ساڵێك پێشتر ئامازەی پێدابوو. ئۆجەلان بڕیاری دەرباز بوونی لە تورکیا وەك کارێکی خود سەرانە وای دەهاتە پێشچاو کە نەك تەنها خودی خۆی بەڵکو رێکخراوەکەیشی لە تەڵەو تەڵەزگەی مەرگ ترازاند. هاوکات لەپاش کۆدەتا ئەوی کردە پێشەنگو پاڵەوانی ئەو ململانێیەی کە لەنێو تەڤگەری شۆڕشگێڕی تورکیدا دەستەو یەخەی ببویەوە. ئۆجەلان هەمیشە دەیگۆت:"ئەوان دووساڵ لە پاش من توانیان دەرباز بن، پاش ئەوەی دەستیان لەبنی هەمانەکەوە دەرچوو بوو. رێکخراوەکانیان لە دەست دابوو."

لە شوێنێکی دیکەدا دەیگۆت:" لە بەر ئەوەی پێش کۆدەتا توانیم قوتاربم، توانیشم گیانی سەدان لە هاوسەنگەرانم بپارێزمو بە نەزمێکی دروستیش راهێنانیان پێبکەم"[٧٣]. لەم کاتەدا رێبەری پەکەکە بڕیاری دا دەستپێشخەری ئاشتی بکەن لە گەڵ تەواوی تەڤگەرەکانی چەپی تورکو کورد داو پەرەیەکی هاوبەش دژ بە رژێمی سەربازی تورکیا پێك بهێنن. ئەگەرچی ئەم بانگەشەیەی ئۆجەلان تەنها مەکرێکی سیاسیی بوو، لە هەمانکاتدا هەوڵێکی جدیش بوو تا هەموو ئەوانی تر لە نێو بازنەی پاتەکەی خۆیدا جێگە بکاتەوە، هاوکات هەوڵێکیش بوو تا لە رێگە کۆنەکانی کارکردن لەگەڵ ئەو گروپانە قوتاربیێتو ئەم جارەیان لەنێو پارتەکەی خۆیدا بیانتوێنێتەوەو لە نێزیکەوە دەستو پەنجەی لەتەکیاندا نەرم کات. هەر بۆیە بە درێژی لە نامەو پەیامەکانیدا کە بۆ رێبەران چەپی تورکی دەنارد لە ئەوروپا، ئەو نیاز پاکیو دڵسۆزی خۆی لە ئامانجو ئایەی خەباتەکەی ئاگاداردەکرنەوە.

مەسعود ئاکیۆڵ یەکێك لە رێبەرانی پێشووی بزووتنەوەی چەپی تورك کە ناسراو بوو بە دەڤ یۆڵ یاخۆ رێگای شۆڕشگێڕیی لەم ساڵانەی دوایدا ژیاننامەی سیاسیی خۆی نوسیی، ئەو لەوێدا وتبووی:" ئاپۆ لە نامەکەیدا ئامازەی دابوو بە

---

[73] Birand, *Apo ve PKK,* 111

بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی تورك". هەروەها مەسعوود ئامارەی بەوەدابوو کە جەنگی سەربەخۆیی تورکیا ئەنجامی هاوپەیمانی لە نێوان کوردو تورکدا بوو. ئاپۆ هەمیشە دەیگوت ئەدی ئێمە بۆ ناتوانین هەمان ئەو کارە بکەین کە باپیرانی دەرەبەگو بۆرجوامان بەدەستیانهێنابوو"[٧٤]. دەڤ یۆل کە بەهێزترین رێکخراوی توندڕەوی چەپ بوو لە تورکیا، لە پاش کۆدەتای ١٩٨٠ بەتەواوی هەڵوەشابوویەوە.

زۆرینەی ئەندامەکانیان یان لە زینداندێدا مردبوون یاخۆ لە وەختی دەستگیرکردنو هەڵهاتنیاندا کوژرابوون. مەسعود ساڵی ١٩٧٧ پاش ئەوەی بەتۆمەتی پروپاگەندە بۆ کۆمۆنیزمو کورد ٨ ساڵ زیندانی بەسەردا سەپابوو، لە وڵات هەڵدێت. ئیتر لە دەرێ ببویە رێبەری دیفاکتۆی بزووتنەوەکە.

لە راستیدا پەیامەکەی ئۆجەلان چارەسەری گەلێ تەنگو چەڵەمەی لە خۆ گرتبوو، کە تا ئەوکات چەپەکانی تورك گازاندەیان لە رەوشی لێکترازانی ریزەکانیانو ئەو شکستە گشتییەی کە روویکردبوویە هەموویان هەبوو. ئاکیۆل نوسیبووی:" پێشنیازەکەی ئۆجەلانم گەلێ کاریگەر دەهاتە پێشچاو". هەروەها گۆتی:" کاتێك پێوەندیم دەکرد بە هاوەڵەکانمەوە لە بارەی پەیامەکەی ئۆجەلان، ئەوانیش پێیان دەگوتم هەمان پەیامـمان لە ئۆجەلانەوە بۆ هاتووە، ئایا بۆ لە بارەی وتەکانی ئۆجەلان هەڵوێستە ناکەنو بۆچی گوێناگرن داخۆ ئەو لە بارەی چییەوە دەدوێ"[٧٥].

لە بەهاری ساڵی ١٩٨١ دا ئاکیۆلْ لە رێگەی فڕۆکەوە گەشتی کرد بۆ دیمەشق، تا لە نێزیکەوە لەگەڵ ئۆجەلان وتووێژبکەن. لەوێ ئۆجەلان میوانەکەی برد بۆ تەماشاکردنی بنکە سەربازییەکانو شوێنی راهێنانی گەریلاکان لە حلوە. لە راستیدا

---

[74] Akyol, "Slice of Life," 6
[75] Ibid., 6

بۆ ئاکیۆلو هاورێکەی ئامادەسازیی بۆ شۆڕشێکی چەکداریی خەونێك بوو کە لەوێندەر رێگەیەکی زۆر درێژیان بینی بۆ بە ئاکامگەیاندنی ئەو خەونە. ئیتر هەرکە ئاکیۆل گەڕایەوە بۆ کیشوەری ئەورووپا، لەوێ بێ چەندو چوون بە هەمو لای راگەیاند کە ئۆجەلان لە غایەلەی ئەوەدایە خەباتێکی چەکداریی لە هەمبەر رژێمی تورك لێنەوێت، هەر بۆیە فرە بەجدی بۆ کارەکەی کاردەکاتو دەخوازێت لەتەك گروپە رکابەرەکانی پێکەوە کاربکەنو هەموو گێرمەو کێشەو توندوتیژییەکانی رابردوویشی فەرامۆشکردووە.

لەپاش چەند مانگێکی کەم، هەردوو لا لەبارەی ئەوەی چلۆن هاوپەیمانییەکەیان دەتوانێت رۆڵ بگێڕێت وتوێژیان کرد. کاری ئەوان وەستان بوو لەسەر ئەو گریمانانەی کە تەنها خەباتی چەکداریی دەتوانێت رژێمی سەربازی ناچاربکات دەستبەرداری هێزو هاتو هاواری توندوتیژیی بێت. هەربۆیە تەنها خەباتی چەکداریو جەنگانی تورکو کورد لە سەنگەرێکداو بە هاوبەشی دەتوانن تێکۆشانێکی دروست بە ئاکامبگەیەنن. ئاکیۆل گوتبووی:"ئاپۆ ئەوەی روونکردبوویەوە، کە لە خوارێدا( کوردستان) خۆیان نومایان دەکەن، ئێمەیش لە سەرێڕا (شارەکان)" وەلێ زۆرێك لە ئەندامانی دەڤ یۆل فرە دڵکرمیو خوتخوتەی راستیو دروستی نیازی پەکەکەیان بوو، ئەوان دەیانپرسی ئایا بەراستی پەکەکە دەیەوێ واز بێنێت لە هێرشو دەستدرێژی بۆ سەر نەیارەکانی، لە کاتێکدا ئەو نەزمە پێناسەی پێشوو تری پەکەکەو ستراتیژی ئاپۆچییەکان بوو.

ئاکیۆل سەرانسەری ئەورووپا دەگەڕاو گروپو تاقمە چەپەکانی دیکەی لەمەڕ پەیامەکەی ئۆجەلان و بەرەی پێشنیازکراو هۆشیاردەکردەوەو ئەوەی بە هەموان رادەگەیاند کە ئۆجەلان نیازو نواڕینی رابردووی لە هەگبەدا نییەو کاری لەو جۆرە لە داهاتووی پەکەکەدا دووبارە نابێتەوە. لە شوێنێکی تردا ئاکیۆل روونی کردەوە کە ئەمە مەرجی بنچینەیی ئێمە بوو.

هاوکات ئۆجەلان لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە خۆشنوودی خۆی بۆ گروپە کوردییە بەرهەڵستکارەکانی دی دەرببڕێت‌و پەیامەکانی دەناردە دەرێ‌و دەیخواست لەتەك ڕێبەرە کوردییەکانی دیکەدا دیدارو وتوێژ بکەن. هەوڵی ئۆجەلان بۆ دانوستان‌و ئاشتی هەوەڵجار لەلایەن ڕێبەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان، جەلال تاڵەبانییەوە پێشوازیلێکرا. جەلال تاڵەبانی لەوکاتەوەی هەڵکەنرابوو بۆ نێو سنووری جیاکەرەوەی نێوان ئێراق‌و ئێران، لە سەرو کاریی ئەوەدا بوو کە بگەڕێتەوە بۆ سنووری سوریا. " من ناوبژیوانیم کرد"، جەلال تاڵەبانی ئەوەی وت بە موحەمەد عەلی بیراندی ڕۆژنامەنووسی تورك" من دەمهەویست زاڵبم بە سەر جیاوازییەکان لە تێروانینەکاندا یان هیچ نەبێت کۆتایی بهێنم بەو کوشت‌و بڕەی لە نێوانیاندا هەیە"[76].

بەمجۆرە تاڵەبانی هامڕا لەگەڵ حزبی شویعی ئێراقی‌و پارتە جۆراوجۆرە کوردییەکانی سوریا کەمال بۆرکایان ناچارکرد تا وتوێژ لەتەك عەبدوڵا ئۆجەلاندا بکات. کەمال بۆرکای ڕێبەری پارتی سۆشیالیستی کوردستانی تورکیا بوو. پارتەکەی ئەو یەکێك بوو لە کاریگەرترین پارتە کوردی‌و تورکییەکانی تورکیا. بۆیە لێك نێزیکبوونەوە لە نێوان ئەو و ئۆجەلاندا دەکرا ڕێگەی نێزیکبوونەوە لە نێوان پارت‌و گروپەکانی تریش خۆشبکات. بورکای لە ئەورووپا دەژیا، ئەویش وەك ئۆجەلان پێشبینی ڕووداانی کۆدەتای کردبوو، هەربۆیە پێش ڕووداوەکە قوتاربووبوو. بۆرکای جارەجارە سەردانی سوریای دەکرد، چونکە لەوێ بەشێك لە نوێنەرانی گروپەکەی پارێزرابوون.

ڕەخنە توندەکانی سەر پەکەکە لە هەمبەر هێرشەکانی بۆ سەر نەیارەکانی، لە سەرەتاوە ڕێگر بوون لە برەودان بە ئایدیاکە. هاوکات کوشتنی چالاکوانێکی پارتەکەی بورکای لەلایەن گەریلاکانی پەکەکەوە لە مانگی سێی ١٩٧٩دا ،

---

[76] Quoted in Birand, *Apo Ve PKK,* 194

هۆکارێکی تر بوو کە بورکای باوەڕ بە ئۆجەلان نەکات. بۆرکای دەیوت:" گروپەکانی دی پێمان دەڵێن پەکەکە کەوتە هەڵەوە، ئێستا ئێوە رازیبوون بەهەڵەکان". هەروەها دەیوت:" گروپەکانی دی پێیان خۆش نەبوو بەوەی من چ دەڵێم، ئەوان وایان دادەنا پەکەکەیش هەر کوردن". بەمجۆرە هەریەك بە شتێك ئەوی دی تاوانباردەکرد، لە راستیدا ئەوە زۆربێمانابوو کە بەو تەوسەوە هەستێك هەبوو بۆ یەکتر تاوانبارکردن. لەلایەکی تریشەوە هەندێك دەیانوت ئێستا ئۆجەلان لە تورکیادا نییە، کەواتە وەرن با هەوڵبدەین گروپەکە بگۆڕین.

دواجار لەگەڵ بوونی کەمێك لامو جیمیدا، بۆرکای ملیدا بۆ ئەوەی لەتەك ئۆجەلاندا قسەبکات. هەردووك لە ماڵێکدا لە پێتەختی سوریا کە ئەندامانی پارتەکەی بۆرکای تێدادەمانەوە، یەکتریان بینی. ئەوان سێ تا چوار ساڵ بوو کە دواین جار لە ئەنکەرەی پێتەختی تورکیا یەکترییان بینی بوو. ئەوکات ئۆجەلان پیاوێکی گەنجی سەرگەرم بوو، مژوڵی ئەوە بوو پارتێکی تایبەت بەخۆی چێبکات. ئۆجەلان ئەوکات لەتەك هاورێیەکیدا هاتنە دیداری بۆرکای لە ئۆفیسەکەیدا کە کاری پارێزەری دەکرد.

ئەوان لە گەرمەی مشتومڕی شێوازی خەباتو چالاکیدابوونو لەو تەوەرەیەدا دەسوڕانەوە ئایا کوردستان داگیرکراوە یان نا؟. بۆرکای کتێبێکی تەنها لەبارەی ئەو مشتومڕانەوە نووسیبوو.

بەهەر حاڵ ئۆجەلان شادومان بوو بەوەی کە توانیویەتی رێگەی راست بپێکێت. ئۆجەلان لەو دەمەدا دەهاتە کن بۆرکای تا نێزیکتر لە بنەمایەکی یەکسان کاربکەن. بۆرکای دەگێڕێتەوە:"دادەنیشتینو پێکەوە دەدواین". هەروەها دەیگۆت:" ئۆجەلان گازاندەی لەخۆی دەکردو دەیوت کە وەك رابردوو نابین". لە مشتو مڕو دانیشتنەکاندا پێنج کەس لە گۆڕێدا بوون کە تاڵەبانی یەکێك بوو لەوانە. هەروەها بۆرکای دەگێڕێتەوە:"وتم بە ئۆجەلان، هەموو ئەمانە هەڵە نەبوون، تۆ دەتکوشتن،

تۆ بەرنامەیەکت هەڵبژاردو هەوڵت دەدا گەلەکەمان وەك دوژمن تەماشامان بکات، هەڵەکە ئەمە بوو، گەر ئەم کردەوانەت هەڵەبوون، ئێستا پەیامێك بڵاوبکەرەوەو بڵێ کە رابردوومان هەڵە بووە، ئەمانە دوژمن نیین، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە پێکەوە لە سەنگەرێکدا کار بکەین". وەلێ بۆرکای لە بیست ساڵی رابردوو زێدەتر لە ئۆجەلان‌و کارو کردەوەکانی ناجۆرو نائومێد بوو. رێکخراوە کوردییەکانی تریش بە پێی وتەی بۆرکای هەر هەمان داواکارییان لە ئۆجەلان هەبوو، ئەوانیش رازیبوون بەوەی ئۆجەلان میتۆدی رابردووی بگۆرێت‌و دان بنێت بە هەڵەکاندا، ئەوکات پێکەوە دادەنیشن‌و باس لە ئەگەرەکانی کارکردنی هاوبەش‌و پێکەوەیی دەکەن.

پاش ئەوە بەماوەیەکی کەم، پەکەکە یەکەم کۆنفرانسی خۆی گرێدا، ئەوە هەوەڵ گردبوونەوەی بەرفراوانی پەکەکە بوو لەماوەی دامەزراندنییەوە وەك پارتێکی سیاسیی. لە گردبوونەوەکەی ٢٥– ٢٦ی تەمووزی ١٩٨١ لە کەمپی حلوە نێزیکەی ٨٠ کەس لە هەڵسوڕاوانی پەکەکە ئامادەبوون. خاڵی گرنگ لە کۆنفرانسەکەدا جەختکردنەوە بوو لەسەر ئەوەی کە چی پێویستە بکرێت بۆ ئەوەی گروپەکە پایەداربێت‌و جارێکی تر دەستبکاتەوە بەخەبات لەنێوخۆی تورکیا دا. هەروەها بڕیاردرا تا بەنەزمێکی رێکخراوەیی برەو بدرێت بە چالاکی‌و کردەوەی رامیاریی لە نێو کوردانی ئەورووپادا. هاوکات لەدارشتنی پلاندا بوون تا دەستبدەنە چەك لەنێوخۆی تورکیادا. وەك ئەوەی بۆرکای‌و ئاکیۆل‌و ئەوانی دیکە داوایانکرد لە ئۆجەلان تا رەخنە لە رابردووی کارەکانی بگرێت، خواستەکانی ئەوان بۆ پاشگەزبوونەوەی ئۆجەلان بوو لە رابردووی بیرو سەرنج‌و وتەکانی‌و وەستان بوو لە رووی کردە توندو توند رەوییەکانی پەکەکە. رەخنەکان هاوڕا لەگەڵ بەیانێکی نوسراوی شایستە بوو لەبۆ رێکخراوی توندڕەوی دەڤ یۆل یش. بەمجۆرە ساڵی دواتر بەرەی شۆڕشگێڕانی یەکگرتوو دژ بە فاشیزم راگەیەنرا. کە پەکەکەو دەڤ یۆل‌و نێزیکەی پێنج پارتی گچکەی چەپی لەخۆگرتبوو[٧٧]. دەڤ یۆل‌و پەکەکە لە ئەورووپایش ئەنجومەنی

---

[77] For further details on the Front, see Celik, *Agri,* 63–64; for informa-

ئەوروپی–بیرلیك كۆمۆنیستییان تامەزراند، ئەم ئەنجوومەنە بووە نێوەندێكی گرنگ بۆ بەرهەڵستكارە چەپەكانی تورك بۆ خەملێنی ئەنجومەنێكی سەربازیی. هاوكات لە سووریایش هەردوو گرووپەكە ستافێكی هاوبەشیان پێكەوەنا تا پلان دابڕێژن بۆ جموجوڵو خەباتە سەربازییەكەیان. هەروەها دیڤ یۆل بەشێوەیەكی سەربەخۆ دەستی دایە ناردنی ئەندامەكانی بۆ سووریاو لوبنان تا لەگەڵ بزووتنەوەی فەتحی فەلەستینیدا خۆیان بۆ كردە سەربازییەكان رابهێنن. وەلێ هەوڵەكانی ئۆجەلان بۆ كەمەندكێشكردنی پارتە كوردستانییەكانو گردكردنەوەیان لە بەرەیەكدا دوچاری تەنگو چەڵەمە بوویەوەو شكستی هێنا.

بۆركای‌و بەرپرسە كوردەكانی دی ئەوانەی لە پێش كۆدەتادا بەهۆی توندووتیژییەكانی ئۆجەلانەوە لەتمەیان بەركەوتبوو، نەیان دەتوانی باوەڕ بە دروستی بۆچوونەكانی ئۆجەلان بكەنو پێیان وابوو بانگەشەكانی ئۆجەلان هیچیتر نییە جگە لە مەكرو مەیلی سەركردایەتیكردنی تەڤگەرەكە.

هەندێك لە چالاكوانە كوردەكانی تر پەڵپی ئەوەیان دەگرت لە ئاكیۆڵ كە هاوپەیمانییەكەی لەتەك ئۆجەلاندا جۆرێك شەرعییەتی داوە بە ئۆجەلان كە لە راستیدا شیاوی ئەوە نەبوو. خەجۆ یەشار یەكێك لە رێبەرانی ئاڵای رزگاری هۆشداری دایە ئاكیۆڵ، كە بەڵێ ئەو مژوڵی هەڵەیەكی مەزنە. خەجۆ دەیوت:" هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووین ئەو پیاوە بگۆڕێت، لەكاتێكدا پەكەكە ئاتاجی بە خوێن بوو".

## پەكەكە لە ئەوروپا

پەكەكە هەمیشە رێژەیەكی كەم لە ئەندامانی لە ئەوروپا دا هەبوون، وەلێ لە نێوەندی ١٩٨١ دا پێنج لە بەرپرسە بالاكانی ناردنە ئەوێ تا بتوانن كۆمەك بە چالاكیو چەلەنگییەكانی پارتەكە بكەنو بازنەی كردەكانیان فراوانتر بكەن[٧٨]. لە

tion on internal Dev-Yol debates on the alliance by a leading member, see Aslan, *Devrimci-Yol,* 63–99

[78]Details on PKK operations and other militant groups in Europe in the

راستیدا رێگەی گەیشتن بە ئەوروپا بەبێ ئەوەی ئاتاج بە پاسپۆرت بێت ئێجگار ئاسانو بۆ لوواو بوو. هەندێك لەوانەی سنووریان دەبڕی، ئەوانە بوون کە لەداخو دەستی دەسەلاتدارانی تورکییە دەربازببوون. باوترین رێگە بۆ بەدەستهێنانی پاسپۆرتی ساختە، کەلك وەرگرتن بوو لە پاسپۆرتی خانەوادە یاخۆ کەسو ناسراوێکت، پاشان وێنەکەیت دەگۆڕیو لە دیمەشقێدا سواری فرۆکە دەبوویت بەرەو ئەوێندەر.

ئیبراهیم ئایدن لە ئامازەیەکیدا وتبووی:" لە سوریادا بە پارە دەتوانی هەموو شتێك ئەنجامبدەیت"، ناوبراو بۆخۆی لە رێگەی فرۆکەوە تکتی سوریەی بۆ ئالمان بڕی بوو. دوواجار ئەورپا بوویە نیشتمانی نێزیکەی دووملیۆن، کە پێیان دەگوترا میوان. زیاتر لە نیوەی ئەوانەی کە لەتورکیاوە ملی رێگەیان گرتبوو لە ولاتی ئالماندا گیرسابوونەوە. ئەم ولاتە لەلایەن گروپە خەباتکارەکانەوە وادەبینرا کە ژینگەیەکی باشە بۆ کەمەندکێشکردنی پشتیوانانی پرۆژە سیاسیەکەیانو گلێرکردنەوەی کۆمەکی داراییو داهات .

هاوکات ئەوروپا بۆ چالاکوانەکان جایەکی ئێجگار سەرنج راکێشو سەرحالبوو، هەر بۆیە پاش بالادەستبوونی تورکییە بەدەیان هەزار هەلسوڕاو روویان ن لەو

---

early 1980s benefited from interviews with Kemal, Burkay, and former Turkish
leftist leader Ertugrul
Kurkcu. General information on the situation of political
refugees
taken from
Info-Turk,
*Black*
*Book*

نوێیە نا[٧٩]. مەسعود ئاککۆل ئێژێ:"لەسەرەتاوە چەپخوازەکان ئەوروپایان بە ئیمپریالیست نێودەبرد، وەلێ کاتێك گەیشتنە ئەوێو داڵدەدران، ئیدی هێند ژینگەکەیان لا پەسەند بوو، بە ئەوروپا سوێندیان دەخوارد".

ئەو یەکێك بوو لەوانەی لە١٩٧٧ دا لەبەر جەوری رژێم هەڵهاتبوو، ئیدی لە رێگەی سوریاوە خۆی گەیاندبوویە وڵاتی ئاڵمانو داوای مافی پەنابەری کردبوو.

ئاکۆڵ هەر لەسەرەتاوە دەیزانی نەزمی دیموکراسی ئەوروپا جێگەی ئەو دەکاتەوە. خاڵی دووەم لە ملنان بەرەو ئەوروپا دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە ئەوێ پەسەندو پەنای پاڵەو کرێکار بوو. دەستپێکی کاری رێکخراوەیی پەکەکە لە ئەڵمانیاوە دەستی پێکردو پاشان بەرەو وڵاتانی هۆڵەنداو سویدو فەرەنسا تەشەنی سەند. سەلمان ئەرسلان دەیوت:" لە سەرەتادا پەکەکە لەنێو پەنابەرەکاندا زۆر کاریگەرو کردە دەرکەوت، بەتایبەتی لەنێو ئەوانەی لەنێوچە دێهاتییەکانەوە هاتبوون" پەکەکە بۆ خۆیشی گرنگی دەدا بە رێکخستنی ئەوانەی کە دەگەیشتنە ئەوروپاو ئەمەیش زێدەتر ئەوانی گەرمدەکرد بۆ خۆ پێچاندن لە پەکەکەوە. نێوەندگەلێك بۆ چالاکی نواندنی پەکەکە لە ئەوروپا برێتی بوون لە پانە کلتورییەکان، ئەوانیش بریتی بوونی لە قاوەخانەکان، هۆڵەکانی خوێندنەوە، دامەزراوەکانی خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتیو نێوەندەکانی مشتومڕ.

لەوێدا ئایدیاکان خەڵکەکەیان گۆشدەکردو پێدەگەیاند. ئەرسلان دەیگۆت:" یاریدەیان دەدرا بۆ خستنە رووی گرفتەکانیانو کۆمەککردنی یەکتریو زێدەتر پەیوەستییان بەیەکەوە". ئەرسلان بۆ خۆی کۆمەڵەی فەرهەنگیو کرێکارانی فرانکفۆرتی لە ١٩٨١ دا دامەزراند. هاوکات تەنگو چەڵەمەو ناسۆریی زیندانیانی سیاسییو سەرکوتی سەربازیی نێو تورکیا، زێدەتر ئەجێندای کاروو چالاکی گروپە

[79] About 110,000 people applied for political asylum in Europe after the military coup, *Black Book,* 234

خەباتکارەکانی لە ئەوروپادا برەو پێدا. لەناوخۆی وڵاتدا تەواوی پارتە سیاسییەکانو گروپو کۆمەڵە فەرهەنگییەکانو سەندیکا کرێکارییەکان داخرانو بەتۆمەتی هاوسۆزییان بۆ رەوتی چەپو کۆمۆنیست رۆژنامەو گۆڤارو نێوەندە ئەکادیمییەکان یاساغکران.

هاوکات جارێکی تر دەستوری بنچینەیی نوسرایەوەو تێیدا زێدەتر کۆتو بەندەکان توندکرانەوەو کۆڵانەکانی ئازادی لەوڵاتدا تەسکتر بوونەوە. لەو دەستوورەدا ئەوە دەخوێنرایەوە کە بەڵێ تورکیا وڵاتێکی فاشیستەو بەبێ شۆڕش ناتوانرێت هیچ نەزمێکی دیموکراسی بچەسپێنرێت. لەگەڵ ئەوەیشدا گرتنی بەکۆمەڵو دادگا سەربازییەکان برەویان سەند، جگە لەوەیش راپۆرتەکان ئاماژەیان دەدا بە زەبرو زەنگو ئازادرانی زیندانییەکانو کوشتن لە ژێر سزادا. بەم جۆرە دادگا سەربازییەکانو لەسێدارەدانی زیندانیان، لەگەڵ ناچارکردنی زیندانیانی کورد بە گوتنەوەی سرودی نیشتمانی تورکو سوکایەتیو ئازاردانی دەروونی گەیشتبووە لوتکە، دواجار لەکاردانەوەی ئەو رەوشەدا ئامادەکاریو زەمینەی فراوانبوونی بازنەی بەرهەڵستکاریی لە دەرێ کاری بۆکرا.

پەکەکەیش وەك گروپە بەرهەڵستکارەکانی دی لە ئەوروپا راهاتبوو بە برەودان بە ئەجێندای سیاسیی تایبەت بەخۆی. هاوکات نەبەردی زیندانیانی پەکەکە لە گرتوخانەکانی دیاربەکردا، بەتەواوی جەماوەری پەکەکەیان ئاڕاستە دەکرد، کاردانەوەی رێبەرە بەندکراوەکانی پەکەکە لە دڕندانەترین گرتووخانەکانی تورکیادا ئامێزی خەڵکی نارازییان بۆ پەکەکە کردەوە.

لە راستیدا ئەندامانی دیکەی گروپە کوردییەکانی تر هەوڵیاندەدا لەبەرامبە رژێمی دیسپۆتیزمو واقیعەکەدا بووەستنەوە، وەلێ ئەندامانی پەکەکە لە زینداندا زۆرینە بوونو بەتینو تاوتر دەیانتوانی رووبەروو ببنەوەو نەبەردی ئەنجام بدەن[٨٠].

[80] The description of abuses inside Diyarbakir prison was taken from

مەهدی زانا سەرۆکی شارەوانی دیاربەکر لەوبارەیەوەو لەسەر مەشهەدی نێو زیندانەکان نوسیبووی:"هەموو شەوێك فەریادو هاواری پیاوان، کە لەژێر زەبری شەلاق و سزادا بەرزدەبووەوە دەژنەورا". مەهدی زانا هاوسۆزو هەواداری پەکەکە نەبوو. لە پاش کۆدەتای ١٩٨٠ وە توندی زیندانی سەربازی دیاربەکر کرابوو. ناوبراو باس لە ناڵەو فیغانی زیندانییەکان دەکات لە شەواندا، دەنوسێت چۆن هاتوو هاواری گرتووەکان تێکەڵ بە لوورە لووری ئاژەڵان دەبوو، لە راستیدا ئەوە نەزمێك بوو بۆ چەشتنی ئازاری دەروونی لەناو ناخی هەر تاکێکدا"[٨١]. زیندانییەکان بەشێوازی جۆراوجۆر ئازاری جەستەیی و گیانییان روبەڕوودەبووەوە، لەوانە دەیانخوساندن لەنێو حەوزی پڕکراو لە بۆگەنی و پیسیی، هاوکات سەگی هاریان تێبەردەدرا یاخۆ ناچاریان دەکردن بە پۆشاکی ژێرەوەیان لەسەر سەهۆڵ و بەفردا رابکشێن، هاوکات لەنێو مارو مێروو مشکدا جێیان دەهێشتن و ئاوی خواردنەوەیان تێکەڵ بە تایت و سابووناو دەکردن. هەروەها لەپێناو ئەنجامدانی خواستەکاندا زیندانییەکان تاڵ و ترشی زۆریان چەشت، ئەوان ناچاردەکران هاوار بکەن و بڵێن شانازی بەتورکبوونمانەوە دەکەین، هاواریان دەکرد تورك شیاوترین و بەئەرزشترینە لەتەواوی جیهاندا"[٨٢].

لە شەوی ٢١ی مانگی ئازاری ١٩٨٢ کە هاوکاتە لەگەڵ هەوەڵ رۆژیساڵی نوێی کوردی، مەزڵوم دۆغان کە هەڵسوراوێکی کارای پەکەکە بوو لە زیندانێدا، وەك نومایانی نارەزایەتی و بەرخودانێکی نێو زیندان گیانی خۆی بەختکردو خۆی

---

Zana, *Prison No. 5,* and interviews with former prisoners. There are numerous books in Turkish about Diyarbakir prison; see especially the personal memoir of lawyer Kaya, *Diyarbakir'da Iskence,* and the Internet site about the prison, www.diyarbakirzindani.com, organized by former PKK prisoner Selim Curuk-
kaya

[81] Zana, *Prison No. 5,* 26

[82] Ibid., 19

خنكان. له ١٨ی مانگی پێنجیشدا چوار ئەندامی دیکەی پەکەکە له زینداندا خۆیان سوتاند، له ١٤ی مانگی شەشی هەمانساڵدا لەپێناو دوایهێنان بە رەوشی تۆمەتبارکردن‌و دەستدرێژی بۆ سەریان، چەندین ئەندام مەرگیان هەڵبژارد، هاوکات لەگەڵ مانگی ئەیلولی هەمانساڵدا چوار کادێری پێشکەوتووی تری پەکەکە لەو پێناوەدا گیانیان سپارد. راپۆرت‌و هەواڵی نەبەردی زیندانیانی پەکەکە لەو ساڵەدا زێدەتر نێو و ناوبانگی پەکەکەی بڵاوکردەوە. ئەرسلان دەگێڕێتەوە کە ئەم هۆکارە بووە هۆی جەماوەریی بوون‌و جێکردنەوەی شوێنی پەکەکە لە دڵ‌و دەروونی خەڵكدا.

هاوکات هاندەرێکیش بوو تا خەڵك تەرکیزی زیاتر بخەنە سەر پەیام‌و پێڕەوی پەکەکە. ئەندامانی پەکەکە یش لە ئەورووپادا بەردەوام بوون بۆ پێداگریکردن لەسەر ساغکردنەوەی ئەو بڕوایەی کە خەباتی چەکداریی تەنها رێگەی تێکۆشانە بۆ رزگارکردنی کوردستان.

گروپە کوردییەکانی دیکە لەم رەوشەدا یان باوەڕیان وابوو کە رەوشەکە وەختێکی گونجاو نییە بۆ شۆڕش یاخۆ دەرگیربوون لەگەڵ مشتوومڕە باو و نێوخۆییەکانی دیکە لەمەڕ تەنگ‌و چەڵەمەکە. ئەرسلان نوسی:" ئێمە زیاتر باوەڕدارو یەکلابووین‌و بێچەندووچوون لێنەویبووین". ناوبراو خۆی وەك مرۆڤێکی بەباوەڕو جدی نومایان دەکرد. دەیگۆت ئێمە هەمیشە پێداگربووین لەسەر پێویستی خەباتی چەکداریی دژی تورکیا، ئێمە تەنها بە ووتن ناتوانین هەرگیز مافە زەوتکراوەکانمان بەدەستبهێنینەوە. هەروەها ئەسلان دەیگۆت، لە رژێمێکی دیکتاتۆرییەتدا ئەستەمە بتوانین بە رێگەی ئاشتی مافە زەوتکراوەکانمان چنگ بخەین.

## پێکەوەنانی بارەگا لە باکووری ئێراق

چەند مانگێك پاش کۆچی دوایی مەلا موستەفای بارزان، مەسعود بارزانی وەك سەرۆکی پارتی دێموکراتی کوردستان دەستنیشانکرا. مەسعود بارزانی تەمەن ۳۲سالّ، زیاتر لە نیمەی تەمەنی وەك پێشمەرگەیەکی جەنگاوەر گوزەراندبوو، ئەو بووە میراتگری رێکراوێکی پەرتەوازەو پەرت بە بیروبۆچوونی سیاسیی پەراگەندەو لاوازو شکستخواردوو لەبواری سەربازیدا. هەرەسی جەنگو رووبەڕووبوونەوەی کورد لەتەك بەغداد ٤سالّ بوو قەومابوو. هەرەسو ئاشبەتالّی شۆڕش پاش رێکەوتننامەی دیپلۆماسیی نێوان تارانو بەغداد، پارتی دێموکراتی کوردستانی لە پاشاگەردانیی و بێنەزمیدا هێشتەوە، دواجار هەندێك لە ئەندامانی ئاست بالأی پارتەکە جودابوونەوەو پارتی سیاسیی تایبەت بەخۆیان پێکەوەنا. یەکێتی نیشتمانی کوردستان یەکێك بوو لە پارتە سەرەکییە نوێیەکان، ئەم پارتە سیاسییە لە نێوچە شاخاوییەکانی باکووری ئێراقدا هەمیشە لەگەل پارتی دیموکراتی کوردستاندا لە کێشمەکێشو بگرەو بەردەدابوون[۸۳]. لە راستیدا پێشووتر میریی یاسای خۆبەڕێوەبەری بۆ نێوچەی کوردستان دەرکردبوو، وەلێ لەئاکامی پێکنەگەیشتن بە ئەنجامێکی دروست جەنگ لە نێوان ۱۹۷٤–۱۹۷٥ هەلگیرسابوو.

بە کۆتایهاتنی جەنگو شکستی کورد لە گۆڕەپانەکەدا نێزیکەی ۱٤۰۰ ئاوایی کورد خاپوورکرانو بەلایەنی کەمەوە ٦۰۰۰۰ کورد دەربەدەربوونو بەتۆپزی لە

[83] Details on Barzani and the situation of the Iraqi Kurdish groups at this time draws on McDowall, *Modern History,* 335–347; Gunter, *Kurds of Iraq*37–39; and Ghareeb, *Kurdish Question in Iraq,* 14–28, 187–193. The description of developing PKK-KDP relations utilizes also Ozcan, *PKK,* 228–229; Birand, *Apo ve PKK,* 123–124; and Dagli, *Birakuji,* 20–32

زێدی خۆیان هەڵکەنران. لە رەوشێکی وەهایشداو لە پاش هەرەس هەرچەند کوردانی ئێراق دابەشببوون بەسەر چەند پارتێکی رکابەرو نەیاری یەکتریدا، وەلێ دووبارە قاڵی خەباتی چەکدارییان دایەوە بە گوێی میرییدا.

وەلێ ئەمجارە جەنگ ئەستەم بوو، یادەوەری شکستە چەکدارییەکە نەزمی جەنگو رووبەڕوو بوونەوەی لە نێو کورداندا بێبایەخکردبوو، هاوکات جەنگی چەکداریی نێوخۆی پارتە سیاسییەکانیش هێندەی تر رێچکەی خەباتی خوارو خێچکردبوو.

رووخانی رژێمی شای ئێران لە ساڵی ١٩٧٩ دا، هاوکات دەسپێکی جەنگی نێوان ئێرانو ئێراق، سەرلەنوێ زەمینە کۆنەکەی بۆ کوردانی ئێراق فەراهەم هێنایەوە، دیسانەوە بایەخی کوردان بۆ هێزە هەرێمییەکان نومایان بوو. پارتی لەتەك رژێمی ئیسلامی ئێراندا پێوەندی نێزیکی دامەزراند.

ئێران نیازی بوو یاخیبوونی کوردانی ئێران لە رێگەی کۆمەککردن بە پارتی دامرکێنێتەوە، ئەوان دارای خواستو خولیای سەربەخۆیی‌و مافی ئۆتۆنۆمی بوون لە رژێمی تازە دامەزراوی ئێران.

لە لایەکی ترەوە، پارتەکەی تاڵەبانی بووە هاوپەیمانی پارتی دێموکراتی کوردستانی ئێران (حدکا). یەکێتی بە روانگەی چەپگەرایانەی خۆیەوە یاریدەی حدکای دا لە هێرشەکەیاندا بۆ سەر شاری مەهەباد. هاوکات هەردوو پارتی‌و یەکێتی لەم رەوشەدا لەتەك یەکتریدا دەرگیرببوونو لەجەنگدا بوون. بەهاتنی ساڵی ١٩٨٢ جەنگ شانبەشانی ئێران دژ بە رژێمی سەدام ئاراستەی خۆی گرت.

ئیتر رژێمی ئێراق ناچارکرا بەشێکی گەورە لە هێزە سەربازییەکانی بەرەو باشووری وڵات رابگوێزێت تا رێگە لەبەردەم پێشڕەوییەکانی ئەرتەشی ئێران بگرێت. هەرچەندە سەدام حوسەین باوەڕی وابوو دابەشبوونی پارتە سیاسییە کوردییەکان ئەگەرێکی کاریگەرەو خاڵێکی بەهێزە لە فەرمانڕەواییەتەکەیدا، لەگەڵ

ئەوەیشدا رژێم هەستا بە دروستکردنی هێزی تایبەت لە کوردەکان کە هەوادارو سەرخەری پرۆژەی میریی بوون تا لەم رێیەوە ئاسایشی هەرێمەکانی باکوور زامنبکات. لەراستیدا نێوچە سنوورییەکانی باکوری ئێراق ئەستەم بوو لە باشترین بارودۆخیی سوپایی رژێمدا کۆنترۆڵبکرێت، ئەوێ سنورێکی شاخاوی سەختو ئێجگار دژوار بوو بۆ میریی. بارودۆخی جوگرافیی و ئاڵوگۆڕی سەربازی رژێم هەلێکی زێڕینی دایە پارتە کوردییەکان تا زیاتر شوێنپێی خۆیان لە نێوچە سنوورییەکاندا جێگیر بکەن. هەیمەنەی هێزەکانی بارزانی بە درێژایی نێوچە سنوورییەکانی ئێران تا سەراسەری نێوچە سنوورییەکانی تورکیا درێژدەبوویەوە.

هەموو ئەو ناوچانەی کە هێزی سەرەکی پارتی لێبوو بە نێوچەی بادینان دەناسرا. تەنانەت لەو نێوچانەدا دێهاتییەکان لەژێر هەیمەنەو هێزی پارتیدا گەڕانەوە سەرماڵو حاڵو زێدی خۆیان. هەروەها جەنگاوەرانی تاڵەبانی لە نێو قسەکەرانی سۆرانی زمانی نێوچەی سلێمانیدا بەهێزترو تۆکمە تربوون لە پارتەکانی دی. کە شوێنی نفوسیان دەکەوتە باشووری نێوچە کۆنترۆڵکراوەکانی ژێر دەستی بارزانی. هەرچەند هەردوو پارتی نەیار لەسەر ئەوە کۆك بوون کە جەنگاوەرانیان بۆیان هەیە بەنێو نێوچەکەکانی یەکتریدا بەبێ قەڵسکردنی یەکتریی هاموشۆبکەن، وەلێ ئەم رێککەوتنە ساڵێك کەمتری خایاندو هەرزوو لە ساڵی ١٩٨٣دا پێکدادانو بەریەککەتن لەنێو هەردوولادا رویدایەوە.

ئۆجەلان زۆر گرنگی بە پێکدادانەکانی نێوخۆی کوردستان نەدەدا، ئەو تەنها مژوڵی ئەوە بوو هێزەکانی خۆی لە نێو سنووری کوردستانی ئێراقدا جێگیربکات. چەند ئەندامێکی کەمی پەکەکە پێش دەستپێکردنی جەنگ لەنێوان ئێراقو ئێران رۆیشتبوونە نێو خاکی ئێرانەوە، لەوێو لە نێوچە سنوورییەکانی تورکیاداو لەنێو کەمپە سەربازییەکانی حدکا دا شوێنی خۆیانکردبوویەوە.

وەلێ پێوەندییەکە فرە کەمو لەسەر ئاستێکی لاواز بوو. بەلاَم پێوەندییەکان لەتەك جەنگاوەرانی کوردستانی ئێراقدا فرەتر تۆکمەو تەواو بوون، رەنگە هۆکارەکە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هێزە کوردییەکانی ئێراق کاراترو بەهێزترو بەئەزموونتربوون لە جەنگە گەریلاییەکەداو زۆرجاریش پێشوازییان لە گروپە کوردییەکانی باکوری کوردستان کردبوو. وەلێ ئەم جارە پەکەکە بۆ شوێنێك دەگەڕا کە شوێنێکی کاتیو سەرپێیی نەبێتو دەیخواست زیاتر تێیدا جێگیربێتو هێزەکانی خۆی باشتر رێکبخاتەوە. لە راستیدا پەکەکە ئاتاجی بە پێگەیەك هەبوو تا لێیەوە هێرشەکانی بۆ ناو قولاَیی خاکی تورکیا رێکبخاتو پاشان بکشێنەوە بۆی. هەرچەند ئەم پێگەیە تا ئەو کات هیچ رێگەیەکی لەپێشدا تەختنەکرابوو.

لەهاوینی ١٩٨٢دا هێرشی ئیسرائیل بۆ سەر لوبنان. رەوشێکی نائارامی بەسەر بنکەو بارەگاکانی پەکەکەدا هانی بوو لە دۆلّی بیقاعدا. هاوکات سوریا کە تائەوکات مەنزڵگایەکی باشبوو بۆ وەرگرتنی ئاوارەو گەریلا پەراگەندەکان، وەلێ شوێنێکی گونجاو نەبوو بۆ ئەوەی لێیەوە هێرشو تەکبیری شەڕ بکرێت بۆ نێو خاکی تورکیا. زەوییەکانی نێوان سوریاو تورکیا پانتاییەکی ئێجگار تەختو دەشتایی بوو. جیا لەوەیش دیمەشق ناجۆربو لەگەڵ هەر هەوڵێکدا گەر بیهەوێت لەقەڵەمڕەوی ئەودا پەلاماری تورکیا بدا .

سوریا لەگەڵ ئەوە نەبوو کونی زەردەواڵەکە بدێوێنرێت بە رووی خاکی ئەودا. لەبەر ئەوە تێگەیشتنی ئۆجەلان لەوەدا بوو کە پێویستە شوێنپێیەك بەتایبەتی لەو ناوچانەدا کە لەژێر کۆنترۆڵی بارزانیدان چنگبخات. هەربۆیە ئۆجەلان ناچاربوو چاوبخشێنێتەوە بە بیروبۆچوونە لە مێژیینەکانیو باری سەرنجی لەمەڕ بنەماڵەی بارزانی کە نەزمێکی شەڕەنگێزانە بووە بگۆڕێت. لە راستیدا رەخنە توندو شەرەنگێزییەکانی ئۆجەلان لەسەر مەلا موستەفای بارزان بەتەواوی جێگەی قەڵسیو قسەو باسبوونو بەهەند وەردەگیران لەلایەن پارتی دێموکراتی کوردستان.

بەتایبەت لەکاتێکیشدا بوو کە سەرداری ئەو پارتە کۆچی دوایی کردبوو. وەلێ ئۆجەلان وەك خووی تایبەتی خۆی فرە وردو وریابوو، بۆیە هەمیشە کارو کردەوەکانی لەپێشەوەی هزرو ئایدیۆلۆژیاوە شوێندەکردەوە. هەربۆیە ئۆجەلان لەو سەرو بەندەدا لەتەك مەسعوود بارزانیدا گەیشتنە رێکەوتنێك، بەگوێرەی ئەو رێکەوتنە گەریلای پەکەکە بۆی هەبوو ئەو نێوچانەی کە سەر بەقەڵەمڕەوی پێشمەرگەکانی پارتین بەکاربهێنن. هەر بەگوێرەی رێککەوتننامەکە، کە ساڵی دوواتر زێدەتر گشتی کراو بە فەرمی راگەیەنرا، گروپە کوردییەکانی ئێراق نێوچەیەکیان تەرخانکرد بۆ گەریلاکانی پەکەکە تا تێیدا بارەگا سەربازییەکانی خۆیان دابمەزرێنن و لەهەموویش گرنگتر بەپێی رێککەوتنەکە گەریلاکان دەیانتوانی لە نێوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی پارتیدا بپەڕنەوە بۆ نێو سنوورەکانی تورکیاو کەس بۆی نەبوو رێگەیان لێبگرێت. ئاکیۆڵ دەڵێ:"ئۆجەلان لە کۆتایی ١٩٨١ یاخۆ بەدرێژایی ١٩٨٢ پێوەندیی باش و پتەوی لەگەڵ مەسعود بارزانیدا پێشخستو رووخسەتی لەپارتی وەرگرت تا بارەگاکانی لەباکووری ئێراقدا پێکەوە بنێت". ئاکیۆل زۆرجار لە تواناکانیان وەك ئەندامانی سەرکردایەتی دیڤ یۆل وەك ئۆجەلان بەتین و تاوبوون.

ناوبراو دەگێڕێتەوە کە ئۆجەلان لەیەکێك لە وتووێژەکانیاندا پێی گوتووە، ئەو رێککەوتنە وەك وەرچەرخانێکی مێژوویی وەها بوو لە مێژووی پەکەکە دا. لە راستیدا رێککەوتنەکە فرە چارەنوسساز بوو بۆ دەستپێکی خەباتی چەکداریی پەکەکەو خاڵی دەستپێکردنی هەڵمەت و هێرشەکان بۆ نێوخاکی تورکییە. هەر بۆیە لەگرنگیدا ئەم رێککەوتنە هیچی کەمتر نەبوو لە پێوەندییەکانیان لەتەك سوریادا. لە راستیدا بەبێ ئەم رێککەوتنە پەکەکە رووبەڕووی دژواری و دابڕانێکی گەورە دەبووەوە لە دەستپێکردنی پلانەکانیدا بۆ جەنگی گەریلایی لە ناوخۆی تورکیا دا.

هەر بۆیە تێگەیشتنی بارزانی لە دەرهاویشتەکانی رێککەوتنەوە ئێجگار بێ نەزمو پەروا بوو. بەدرێژایی ئەو ساڵانەی کە بارزانی دوورخرابوویەوە بۆ مەنفا، ئیدی پارتی جەماوەرو جەنگاوەری لەدەستدابوو. چونکە پارتی ئیتر وەك جاران تەنها پارتی کوردیی نەبوو لە گۆرەپانەکەدا، لەلایەکی تریشەوە ئامادەیی نیشاندانی بۆ ئەوەی هێرش بەرێتە سەر کوردانی ئێران لە بەرژەوەندیی تاراندا. گورزێکی بەهێزوو لەتمەیەکی گەورەی دابوویە هێزو هەرەکەتی پارتی لەپێشچاوی جەماوەرەکەیدا. هەروەها پارتی هاوپەیمانە دێرینەکانی دەنێو بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردی تورکیادا لەدەستدابوو، چونکە زۆرێك لەو گروپە نەتەوەییانەی کورد لە تورکیادا لەچالاکی کەوتبوونو شوێنەواریان نەمابوو، هاوکات رەوشەکە رووبەرووی هەرەشەی چەکداری کردبوویەوە لەلایەن یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە.

بەم حاڵەیشەوە رێککەوتنی پاتی لەگەل تۆجەلاندا ئەوەی دووپاتکردەوە کە ئاپۆچییەکانو کوردچییەکان خوازیاری چاوپیاخشاندنەوەن بە ئەزموونو ئارمانجی پارتییدا. ساڵێك دوواتر بارزانی لەوەلامی رۆژنامەنوسێکدا گوتی:" هەمیشە ئەوە جێگەی شانازیمانە کە بە قوربانیدانو رشتنی خوێنمان نێوچەیەکی ئازادو رزگارکراومان لەژێر دەستدایە، ئەم نێوچەیەشمان وەك قەلایەك والاکردووە لەبەردەم هەر پێشمەرگەیەکی کورد دا".

هەروەها بارزانی لە دیمانەکەدا وتی:" ئێمە لە پێناو ئەم لۆژیکەو بۆ ئەم هۆکارانە واژۆی رێککەوتنمان لەتەك پەکەکە دا کرد"[٨٤]. وەلێ پەکەکە پاش جێگیربوونی شوێن پێیو شارەزابوونیان لە نێوچەکەدا ئیتر کاتی خۆیان بۆ واژۆکردنی پەیمانێکی نوێ لەتەك پارتیدا بەهەدەر نەدا، ئەوان بنکەو بارەگا

---

[84] Balli, *Kurt Dosyasi,* 447.

سەرەکییەکانیان بردە سێگۆشەی سنووری ناسراو کە درێژدەبێتەوە لەنێوەند هێڵە سنوورییەکانی ئێراقو ئێرانو تورکیە. لەراستیدا ئەم شوێنەیش هەمیشە بنکەیەکی گرنگ بووە بۆ جەنگاوەرانی پارتی لە چیادا. هاوکات نێزیکی جوگرافیی لە سنووری تورکییەوە تەواو شوێنەکەی لە پێشچاو پەکەکەدا بەبایەخکردبوو. هەر بۆیە تەواوی گەریلا پەراگەندەکانو ئەوانەی لەتەك گروپە کوردییەکانی تر مابوونەوە، هەمووان بانگهێشتکران بۆ بارەگای نێوەندیی پەکەکەو بۆ بارەگاکانی بەرەکانی پێشەوەی سنووری تورکیە.

هەندێك لە گەریلاکان لە دیمەشقەوە بەفڕۆکە قوتاربوونو چوونە ئێرانو لەوێشەوە بەپێیان هاتنە نێو خاکی ئێراقەوە. هەندێکی تریش بە لاپلاو کورتبڕییانکرد لە سنورەکانی ئێرانو ئێراقو تورکیادا، ئەوان بە کورتی توانیان بچنە نێو تورکیاوە بەبێ ئەوەی پێیان بچێتە ناو ئێراقەوە. جێلیك دەیوت:" پێویست بوو بە هەر نرخێك بێت خۆمان بگەیەنینە بارەگای سەرەکی، ئێمە بە پێیان هەموو ئەو سنوورانەمان بڕی ، بەراستی گەشتێکی سەختو دژوار بوو، ڕێگەکان بەفراویو کەشو هەوا سەرماو سۆڵەبوو". لە راستیدا بارودۆخی گەریلاکان لە نێوبارەگاکانیشیاندا لە نێوچەی سێگۆشەی نێزیك سنووری تورکیا هیچ باشتر نەبوو. چیلیك دەیوت:" لە لوبنان هەموو ڕۆژێك خواردنی باشو گۆشتمان دەخوارد، جگەرەو بەرگی باشمان هەبوو، وەلێ لە چیاداو لە بارەگا نوێیەکانماندا هیچ شتێك نەبوو، تەنها شۆرباو لاسکی گەنمو هەندێ گژوگیای کێویمان دەخواردو لە پیسو پۆخڵێدا ئەسپێ تێیدابووین". لە راستیدا ئەم رەوشە دژوارو ناهەموارە یاریدەدەرێکی باشبوو بۆ راهێنانی گەریلاکان لەسەر نەزمو نەریتی جەنگی چەکداریی. گەریلاکان لە لوبناندا فێربوون چۆن بۆمبەکان بتەقێننەوەو چلۆن نارنجۆکێك بهاوێژن، وەلێ لە باکوری ئێراقدا یادیانگرت کە چۆن خۆیان زیندوو رابگرن لە چیاداو وەك هێزێکی پارتیزان خۆڕاگربن.

## دەربازبوونی زۆرینەی ئەوانی تر

چیرۆکی دەستپێکردنی خەباتی گەریلایی لە بانگەشەکانی ئۆجەلاندا وردە وردە لەنێو گروپە بەرهەڵستکارو نەیارە کوردییەکانیدا، ئەوانەی لە دیمەشقەوە قوتار ببوون وەك نوکتەیەك باسی لێوە دەکرا[85]. چونکە سێ ساڵ بەسەر روودانی کودەتای سەربازیی تورکیادا تێپەری بوو، هێشتا پەکەکە ئەو بەڵێنەی کەدابووی بۆ دەستپێکردنی جەنگی پارتی زانی نەیبردبووە سەر. هەرچەند پەکەکە لە ناردنی جەنگاوەرەکانی دا بوو بۆ نێو سنوورەکانی ئێراق، بەلاّم زۆرێك لەوانە لەکاتی تێپەربوونیان بەنێو سنورەکانی تورکیا کوژران یاخۆ دەستگیرکران، هەندێکیشیان پاش ئەوەی دەرفەتیان بۆ رەخسا لە گروپەکە تەکینەوەو هەڵهاتن.

ئاکیۆل دەیگوت:" ئەو بەهەڵسوڕاوەکانی خۆی دەگوت، کە هاوینی داهاتوو دەستبەکاردەبین، وەلێ ئەوە هاوینی ١٩٨٢ هاتوو هێشتا خەباتی چەکداریی دەستی پێنەکردبوو، ئەوکات دەیگوت پرۆژەی خەباتە چەکدارییەکەمان تا ١٩٨٣ دوواخستووە". بەمجۆرە دەنگۆی خەباتە چەکدارییەکەی پەکەکە ببووە نوکتەو جێگەی شۆخیکردنی نێو خەڵکی، وەلێ بۆ ئۆجەلان پرسەکە ئێجگار جددیو بەبەرنامەوە دەجولاّیەوە. هەروەها ئاکیۆل دەیگوت:"ئۆجەلان گوێی بەو مقۆمقۆیە نەدەدا ، ئەو بەرنامەیەکی جێگیری هەبوو، لە زیهنیشیدا کاتێك دیاریکراو هەبوو بۆ جێبەجێکردنی پرۆسە چەکدارییەکە". کەمال بۆرکای سەرسەخترین رەخنەگری کورد لەبەرامبەر ئۆجەلان لە ١٩٨٠ بلاّوترین رەخنەو گازاندەی خۆی لەسەر پەکەکە

---

[85] This section draws primarily on interviews with Kurdish and Turkish activists in Syria at the time. Information on Syria and the Palestinians uses Seale, *Asad*, 378–396, and Maoz, *Asad*, 119–122, 167–169.

وەشاندەکرد، ئەو لە ساڵی ١٩٨٢دا کتێبێکی بەچاپگەیاند، ئەو کتێبە فرە بەوردیو سەرنجەوە شیکاری پرسو جۆی پەکەکەو رەوشی رێکخراوەیی ئەو هێزەی کردبوو. بۆرکای ئەنجامگیریی کردبوو کە پەکەکەیش تەنها بزووتنەوەیەکی شکستخواردووە لە نێو تێکرای شکستەکانی تردا. هەروەها دەیگوت ئەوانە خەڵکی نەخوێندەوارو ئاست نزمن لە رووی ئاگاهیو هۆشیارییەوە[٨٦]. ئەوانەیش کە خۆنەواری نێو پارتەکەبوون، بڕیاری وازهێنانیان داوەو لە ئۆجەلان دابڕاون.

لە راستیدا بانگەشەگەلێك کە پەکەکە تێیدا دۆڕاو بوو، ببونە گۆشەنیگایەك بۆ پارتەکانی ترو نەیارەکانی، هەر بۆیە تێکرا لەو رابردووەوە تەماشای هەر کارو جموجوڵێکی پەکەکەیان دەکرد.

دیارە ئۆجەلان تەنها کەسێك نەبوو کە بەڵێنی دابوو بۆ رزگارکردنی هەرێمی کوردستان لە چنگی داگیرکەر. رکابەرەکانی ئۆجەلانیش تاوتوێی ئەو پرسەیان کردبوو، وەلێ تائەوکات هیچ کام لەوانە نەیانتوانی بوو سەرکەوتن بەدەستبهێنن. بۆ نموونە ئاڵای رزگاری لە ساڵی ١٩٨٠ دا نێزیکەی ١٥٠ چەکداری ناردە سنوورەکانی باکووری ئێراق. ئەم چەکدارانەی ئاڵای رزگاری بەهۆی گرفتی دابەشبوونی ئایدیۆلۆژیو پەراگەندەیی هزرییەوە هەرزوو چەکەکانیان فڕێ داو لە هەوەڵی ساڵی ١٩٨٢دا چیایان بەجێهێشت[٨٧].

لەراستیدا هەر دەوڵەتێك لە هەرێمەکەدا دارای تەنگو چەڵەمەو گرفتی تایبەت بە پرسیی کوردەکانی خۆی بوو. خەجۆیەشار کە ژنە سەردارێکی نێو رزگاری بوو بەدەم جگەرەکێشانەوەو بەتووندی پێویستی بۆ دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان دووپاتدەکردەوەو دەیگوت:"هەر رووداوێك لە هەر پارچەیەك لەپارچەکانی

---

[86] Burkay, *Devrimcilik Mi Terorizm Mi,* 207

[87] For a full discussion of Ala Rizgari's activities during this period, see the interview with Yasar, one of the group's leaders, in Balli, *Kurt Dosyasi,* 83–106

کوردستان روویبدایە راستەوخۆ کاریدەکردە سەر پارچەکانی دیکە. هەر بۆیە هەریەك لەو دەوڵەتانە گەر یاریدەی گروپێکی کوردیی بدایە بۆ ئەوەبوو ئەو گروپە کۆنترۆڵبکاتو سود لە توانا مرۆییەکانی وەربگرێت لەبەرژەوەندی خۆیدا". هەر بۆیە خەجۆ یەشار پێی وابوو:" ئەم جۆرە پێوەندیانە لەتەك وڵاتانی هەرێمیدا، لەکۆتاییدا جگە لە خۆ دۆراندن هیچی دیکەی لێسەوزنابێت".

هەر بۆیە پاشە کشەی ئاڵای رزگاریو وازهێنانیان لە خەباتو چیا، نێزیکەی ٤ مانگی خایاند، لەو ماوەیەداو بەنهێنی توانیان لە تورکیاوە دەربازی سوریە بنو لەوێیش تێکرا ملیان نا بەرەو ئەوروپا. تێکرای گروپەکانی تر چاویانخشاندەوە بە زیانو سودییانداو هەمووان دەستیان دایە چۆڵکردنی مەیدانەکەو سوریایان کردە ئامانجی چۆڵکردنی خەبات بەرەو ئەوروپا. هەر بۆیە لەنێوان ساڵانی ١٩٨٢ بۆ ١٩٨٤ بەشێوەیەکی نهێنی تەواوی کادێرو کاروچالاکییەکانیان گواستەوە بۆ ئەوروپا. کامەران کادێری باڵای رزگاری گوتی:" ئێمە لەلایەن تورکیاوە تێکشکێنرابووین، هیچ کادێرو جەنگاوەرێکمان بەدەستەوە نەمابوو، بڕیارماندا ئیدی نەمێنینەوە". بەهەمان شێوە (د.د.ك.د) کە لەلایەن فەتحی یاسر عەرەفاتەوە مژوڵی راهێنان ببوون، ئەوانیش بڕیاریاندا سوریە جێبهێڵن. وەهبی ئایدن دەگێڕێتەوە:" ئێمە وەك د.د.ك.د نێزیکەی دووساڵ لەسوریادا سەرقاڵی خۆ سازدان بووینو دارای کۆمەڵگەیەکی تایبەت بەخۆمان بووین، وەلێ هیچ کام لە ئەندامانمان لەتەك ئەوەدا نەبووین کە پێوەندیمان لەتەك سوریادا هەبێت". وەهبی ئایدن لە ساڵی ١٩٨١ لە تورکیاوە دەربازی سوریابوو تا سەربازەکان قۆڵبەستی نەکەن، ناوبراو ئێستەکانێ لە پاریسدا ژیان بەسەردەبات. لەگەڵ ئەوەیشدا هیچ کام لەو گروپانە پلانی خۆسازدانیان بۆ جەنگی گەریلایی نەخستبووە بواری کارو فەرمانەوە. ئایدن رایگەیاندبوو:" هەندێك لە ئەندامانی بێ چەکمان ناردبووەوە خاکی تورکیاو بەشێك لە ئەندامانیشمان دەستگیرکرابوون". هەروەها

دەیگوت:"ئێمە بیرکردنەوەمان لەو چوارچێوەیەدا بوو کە برەو بە هۆشیاریی خەڵکی بدەین، پاشان دەست بدەینە خەباتی چەکداریی".

لە هەمانکاتدا هاوەڵە چەپڕەوە تورکەکانی ئۆجەلانو خەباتکارەکانی نێو دەڤ یۆل هەموو ئەوانە لەسەرو بەندی چاوخشاندنەوەدا بوون بە هاوپەیمانییەکەیاندا لەگەڵ پەکەکە. هاوکات ئاماژەگەلێکیش لە گۆڕێدابوون کە پەکەکە دەستیدابوویەوە هەمان ئەو نەزمی هەڵسوکەوتو ڕێبازە دێرینە توندەی کە لەتەك پارتەکانی دەورروبەردا هەیبوو. هاوکات هەندێك لە ئەندامانی پەکەکە دیار نەدەمان، تەنانەت دەنگۆی ئەوە بڵاوبوو کەلەلایەن خودی پەکەکەوە قۆڵبەستکراون. ڕێکخراوی کۆمکاری کەمال بۆرکای لە ئەورووپا پێوەندی کرد بە ئاکیۆلو لیستێك لە ناوی خەباتکارانی پەکەکەی دایە کەلەلایەن خودی پەکەکەوە دەستبەسەر کرابوون. ئاکیۆل لە ژیانانمەی سیاسی خۆیدا هێناویەتی:" پەکەکە دەستیدابوویە دەستگیرکردنی هەندێك لە ئەندامەکانی خۆیو کەسیش زانیاری لەو بارەوە نەبوو کە چ بەڵایەك بەسەر ئەوانەدا دەهێنرێت". هەروەها دەڵێت:" نامەیەکی پەلەو توندم نووسی بۆ ئۆجەلانو پێیم ڕاگەیاند کە پێویستە یەکسەر هەموو ئەندامان ئازاد بکات. ئەو کارەی ئەو ناسازگارە لەگەڵ ئەو ڕێککەوتنەی کە لەگەڵ پەکەکە کردبوومان، بەپێچەوانەوە ناچارین بە ئاشکرا جاڕی ئەوە بدەینو سەرزەنشتی خەراپەکارییەکانی پەکەکە بکەین"[88]. بەڵام ئۆجەلان هەڕەشەو گوڕەشەکەی ئاکیۆلی پشتگوێخست. دیڤ یۆل ئیتر ئەو ڕێکخراوە بەهێزو سیاسییەی جاران نەبوو، کە پەکەکە وەك هاوپەیمانێك پشتی پێببەستێت. ئاکیۆل دەڵێ:" ڕێکخراوێکی هێند سیاسیو کاریگەر نەبووین کە داواکارییەکانمان کاربکاتە سەر

[88] Akyol, "Slice of Life," 7

ئاكارو رامياريى ئۆجەلان. هاوكات لەسەروبەندى لێكهەڵوەشانو پارچە پارچەبوونیشدا بووین"[89].

ئەندامانی دەڤ یۆل لەنێوەندی مشتومڕێكی نێوخۆیی تاڵدا سەبارەت بە نەزمی زانیاریی ڕێكخراوەییو لینینگەرایی گروپەكەو ئامانجە شۆڕشگێڕییەكانیان ژیانیان دەگوزەران. ئاكیۆل ڕێبەری ڕەوتێكی نێو دیڤ یۆل بوو كە بەپێویستی دەزانی چاوبخشێنرێتەوە بەنەزمو نواڕینو ئارمانجەكانیاندا. مشتومڕەكان دارای چەند هۆكارێك بوون، گرنگترینیان كاریگەرییەكانی ژیانی شێوە دێموكراسیانەی ئەورووپا بوو لەسەر ئەندامەكانی دیڤ یۆل، ئەوان لە ئەورووپا دا دارای ژیانێكی جیاوازبوونو لەوێ دەركیان بە هەموو نابەرابەرییەكانی ژیانی دێموكراسیانەی خۆیانكردبوو.

لەم ئاڵو گۆڕە هزرییەدا كە بەسەر ئەندامانی دیڤ یۆل دا هات، ئیتر پلانەكان بۆ دەستپێكردنی خەباتی چەكداریی لە نێو هەندێك لە ئەندامانی گرۆی دیڤ یۆڵدا فرە بە ناواقیعی دەهاتنە پێشچاو، ئاكیۆل یەكێك بوو لەو ئەندامانە كە زەرورەتی خەباتی چەكداریی بە ڕەوا نەدەبینی. ئاكیۆڵ لە نووسینەوەی ژیاننامەی سیاسیی خۆیدا نوسیویەتی:" دەتوانم بێژم، كە بزووتنەوە ساواو ڕۆمانسییەكەمان بەزوویی بەهۆی پێوەندییە تاڵەكانی ڕۆژگارمانەوە ڕووبەرووی تەنگو كۆسپ دەبێتەوە". هەروەها دەنوسێت:" ئێمە دارای ڕێكخراوێك نەبووین كە بتوانێت خەونەكانمان بكاتە واقیع، هەر بۆیە بە زوویی تێگەیشتم كە ئێمە خەریكین لە نێو دنیای خەونو خەیاڵدا ژیان دەگوزەرێنین"[90]. لە ڕاستیدا ئەم مشتومڕو چەندو چوونەی كە لەنێو ئەم ڕێكخراوەدا ڕوویدەدا، ڕاستەوخۆ كاریگەریو كاردانەوەی لەسەر خەباتكارو جەنگاوەرەكانی دی دروستدەكرد.

---

[89] Ibid
[90] Ibid., 6

پرسیاری سەرەکی لەنێو ئەو گروپانەدا بەردەوام لەدەوری ئەو تەوەرەیەدا دەسوڕایەوە، ئایا دەستبردن بۆ خەباتی چەکداری زەمینەی بۆ رەخساوە یاخۆ هێشتا بفیەو خەونێکی ئەستەمە؟.لەبەر ئەوە هیچ کام لە گروپە کوردییەکان ئەو توانایەیان نەبوو لەنێو تورکیادا دەستبکەنەوەو شەڕە تەقەی چەکداریی بنێنەوە، چ جای ئەوەی بنکەو بنەمای سەربازیو کۆمەك بۆ خۆیان کۆبکەنەوە.

لەتورکیادا پێش روودانی کۆدەتا توندوو تیژییو ئاگریی تورەیی لەلایەن چەپو راستەکانەوەو گروپە نەتەوەییە کوردییەکانەوە هەڵدەگیرسێنراو ولأتیان دووچاری تۆقینو ترس کردبوویەوە. لە رەوشێکی وەهادا زۆرینەی خەڵکی تورکیا عەودالی ئارامشو ئاشتییەکی هەمیشەیی بوون بۆ ولأت.

ئاکیۆڵ دەنوسێت:" هەربۆیە زۆرینەی گەل پشتیوانی خۆیان بۆ ئەنجومەنی سەربازی نیشاندەدا، ئەویٚ دەم بزووتنەوەکەمان کۆنترۆڵی سەراسەر شارەکانی تورکیای کردبوو، وەلێ هەموو پشتیوانییەکی جەماوەریمان لەناخی جەماوەردا لەدەست دابوو"[91]. لێرە بەدوواوەو لە رۆژگاری داهاتوودا بەکاوەخۆ ئاکیۆل هەوڵی دەدا گۆڕان لە ئەجێنداو هزریی سیاسییدا قبوڵبکاتو روونیبکاتەوە، ئەو تەمتومانەیش لادەدا کە بەڵێ ئەوەی لە سوریاو ئەڵمانیادا مژوڵی بووین، فرە گەمژانەوە زارۆیانە بووە. ئاکیۆڵ دەنوسێت:"ئیدی رێکخراوێك لە تورکیادا نەبوو. نە گەلەکۆمەیەکی پشتیوانیو نەهیچ، جگە لە چەند گەجەرو گوجەرێكو گەمەچییەکی کۆدەتا لە دەرێو بۆ خزمەتی کۆدەتا هەڵدەسوڕان".

هەروەها کێشە گەلێکی دیکە لە گۆرەپانەکەدا قوتببوونەوە کە پەیوەندیدار بوون بە پێوەندییەکانی نێوان دیمەشقو گروپە خەباتکارە دەرەکییەکانەوە کە بانگهێشتکرابوون. هەڵمەتی سەربازی ئیسرائیل بۆ سەر لوبنان لە ١٩٨٢ دا، هاوزەمان هێرشی لەناکاو بۆ سەر پێگەو پەناگە ئامانجدارەکانی سوریا، لە رووی

---

[91] 34. Ibid

مادیو مەعنەوییەوە سوریاو سەرۆك ئەسەدی خزاندە رەوشێکی بەرگریکارانەوە. لە هەمانکاتدا تێکچوونی پێوەندییەکانی یاسر عەرەفاتو ئەسەد لەسەر مناوەراتی سیاسیی سەرۆکی رێکخراوی ئازادیخوازی فەلەستینی لەتەك وڵاتە عەرەبییەکانی دیکەدا، ئیدی پێکدادانو مشتومڕی ئەسەد لەتەك وڵاتانی عەرەبییدا بەتەواوی ئەسەدی ماندوو دڵگرمیٚ کرد لەسەر ئەو نێوچانەی کە دەیخواست بەسەریاندا باڵادەستبێت. سەرۆکی سوریا زێدەتر بەرچاوتەنگبوو بۆ کۆنترۆڵکردنی زیاتری گروپە فەلەستینییەکان. ئەم نیازو نەزمەی سەرۆك جارێکی تر بەسەر گروپە کوردیو تورکییەکانەوە رەنگی دایەوە، کاتێك کە خاکی سوریایان کردبووە پەناو پێگەی چالاکییەکانیان. ئەوەبوو لەناکاو سوریا هەموو ئەو بەڵگەنامەو شوناسنامانەی رێکخراوە فەلەستینییەکانی دایە دوواوە کە بۆ گروپە بیانییەکانی وەك دیڤ یۆل کرابوون.

سوریا بەمەرجێك قایل بوو ئەو رێکخراوە تورکیانە شوناسنامە هەڵبگرن کە لەلایەن دەزگای هەواڵگریی سورییەوە ئەو کارتانەیان بۆ دەربکرێت. هاوکات پەکەکەو رێکخراوە هامکارەکەی دیڤ یۆڵ داوایان لێکرا بەزوویی لیستی نێوی ئەندامەکانیان لە سوریاو ئەڵمانیادا بۆ ئامادە بکەن. ئاکیۆڵ دەڵێت ئەم خواستەی دەزگەی هەواڵگریی سوریا سەرو سەدایەکیٚ فرەی نایەوەو بووە خاڵێکی وەرچەرخان لەنەزمی چالاکی ئێمەدا. هەروەها دەڵیٚ ئەم خواستەی سوریا ئەوەی دەگەیاند ، کە ئیتر ئێمە بۆمان نەبوو خەبات بکەین بۆ دیموکراتیزەکردنی تورکیا.

ئاکیۆڵ دەنوسێت:"ئەگەر نا ئێمە بارمتەی سوریا بووین، ئێمە زۆر بەسەختی هەستمان بەوە دەکرد، ئەوە بیرکردنەوەی ئێمە بوو لە سوریا". بەڵام بە بۆچوونی ئاکیۆڵ ئەوان نەیانتوانیوە ئۆجەلان قایل بکەن بەوەی پێدانی لیستی نێوەکانیان بەدەزگای هەواڵگریی هەنگاوێکی مەترسیدار دەبێت بۆ ئایندەیان. ئاکیۆڵ لەسەری دەڕواتو دەڵێت:" لەوبارەوە وتوێژم کرد لەتەك ئۆجەلاندان ،بەراستی ئەو کەسێکی

گەمژە نەبوو، پێیم وت گەر زێدەتر لە سوریادا وەمێنین دەبینە بارمتەی ولآتانی هەرێمی. ئۆجەلان لەوەلآمدا گوتی: "بەدڵنیاییەوە ئەوە دەزانم، وەلێ لە ئێستادا من ئاتاجم بە وەخت هەیە، دەزانم ئەوان تەمایانە من بەکاربهێنن، وەلێ منیش وان لەداهاتوودا بەکاردەهێنم". لەسەروبەندی کۆتایی ۱۹۸۳ دا دیڤ یۆلێ تەواوی ئەندامو دۆستانی خۆی لە سوریادا پاشەکشە پێکردو نەچووە ژێر ئەو خواستانەی رژێمی سوریاوە. ئاکیۆلێ دەنوسێت:" دەسەلآتدارانی سوریا تێگەیشتن کە ئێمە ساردو سڕین لە هەمبەر پێشنیازەکەیاندا، هەربۆیە ئەوان هیچ تەگەرەیەکیان لەپێشماندا دروست نەدەکرد وەختێ کە لەسوریادا قوتاردەبووین".

لە راستیدا ئەم بریارەی دیڤ یۆلێ گورزێکی کوشندەی سرەواندە پلانە سەربازییەکانیان بۆ رووبەڕوو بوونەوەی تورکیا، وەلێ لەوەختی ئێستادا پلانەکەی ئەوان هیچ بایەخو بنچینەیەکی نەبوو. ئیدی ئەم گروپە پەرتو پەرتەوازە بوونو توانەوە. ئەوبالەی کە سەربە ئاکیۆلێ بوون، وازیان لە خەونی خەباتی چەکداری هاوردوو لە خەمو خولیای دەستگرتن بەسەر پێکهاتەی نێوخۆیی پارتەکەیشدا رەوینەوە. هاوکات هاوپەیمانییەتیشیان لەگەلێ پەکەکەدا بەتەواوی لە گۆڕنرا. ئاکیۆلێ دەنوسێت:" لەوکاتەوەی پەکەکە خۆی بۆ خەباتی چەکداری ماوە درێژ سازدەکرد، ئەو هەنگاوەی منی بۆ دوواوە وەك خیانەت دەناساند"[92].

هەرچەندە دیڤ یۆل سوریایان بەجێهێشتو هاوپەیمانیان لەتەك پەکەکە کۆتایی پێهێناو توانەوە، وەلێ هێشتا بەرەی بەرگریی یەکگرتوو دژی فاشیزم (ئێف.کەی.بی.دی.سی)بەردەوام بوون، ئەوە تەنها هێمایەکی لاوەکی بوو، یاخۆ ئامازەبوو بۆ شکستی پرۆژەی هاوبەشی تورکی کوردی بۆ شۆڕش لە تورکیا. تارادەیەکی فراوانیش ئامازەیەکی بێ پێچو پەنا بوو لەسەر شکستی بیست سالێ لە ئەزموونی شۆڕشی رادیکالی تورکییدا .

---

[92] 35. Ibid., 7

چونکە لەتەك بڕیاری ئاشبەتاڵی دیڤ یۆڵدا تەواوی هێزە چەپەکانی تورکیش مەیدانەکەیان چۆڵکردو وازیان لە خەباتو خەونی چەکداری هێناو لەتورکیاو لەپێناو نیازێکی ناروونو دیارینەکراودا خۆیان هەڵپەسارد. بەمجۆرە هزرڤانەکانی چەپی تورکی یا مردن یان لە زیندانەکانی تورکیادا پەراگەندەو پیرو کەڕبوون یاخۆ ژیانیان لەمەنفاو لە دابڕانی ئەوروپادا بەهەدەردا. ئەمەبوو داهاتووی نادیارو لێڵی چەپ لە تورکیادا. ئاکیۆڵ دەڵێ:"روون نەبوو بەرەو چ داهاتوویەك ملدەنێین ، تەنها پێویست بوو سوریا چۆڵکەینو لە قۆناغەکانی داهاتوودا کاربکەین".

ناوبراو دوواتر گەرایەوە سەر خوێندنە ئەکادیمییەکەیو ئەلئان لەیەکێ لە زانکۆکانی خۆئاوادا مژوڵی دەرسو دەوری خۆیەتیو وانە دەڵێتەوە. ئاکیۆڵ لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ:" گەر پێویست بێت بەڵێ، دەگەڕێینەوە بۆ خەباتی چەکداریی، گەر ٩٠ساڵی تریش پێویست بێت، وەلێ لە ئێستادا خەباتی چەکداری ئەستەمەو ئەنجامێکی ناکامی هەیە".

بەنێوبانگترین خەباتکاری دێرینی پەکەکە بە ساری باران ناسرابوو. ئەو قەدو باڵا درێژوو باریك‌و نێوچەوان قوڵ بوو، لە کۆتایی ١٩٨٢ نێردرایە باکووری ئێراق. ئەم هەوڵەی پەکەکە بەشێك بوو لەو پلانەی کە خوازیاربوو بە کاوەخۆ بنکەو بارەگاکانی پەکەکە لە سوریاوە بگوازێتەوە بۆ نێوچە سنورییەکانی نێزیك تورکیا لە باکووری ئێراق.

لەراستیدا لەمانگەکانی زستاندا هاموشۆ لەنێوچە شاخاوییەکاندا ئێجگار ئەستەم‌و ناهەمواربوو، مرۆ نەیدەتوانی بە سانایی پەڕێتە ئەودیو سنووروو خاکی دوژمن، وەلێ لە نەورۆزدا نێوچەکە دەکرایەوە بەرووی رێبواراندا‌و دەکرا لەوێندەرەوە گوزەر بکرێت. پاش ئەوە باران‌و دوو لە هاورێکانی بەنهێنی‌و بە شاراوەیی دەستیان دایە ئەنجامدانی گەشتێکی شەش مانگەی پڕ لە ناسۆر بۆ ئەوەی رێو شوێن بۆ پلانەکانیان تەخت بکەن. لە هەکارییەوە دەستیان دایە گەشتەکەیان تا تونجەلی. هاوکات تیمێکی تر رەوانەی نێوچەکانی باشوری رۆژهەڵاتی تورکیە کران‌و لەدیاربەکرو هەرێمی شرناخدا کەوتنە شوێنپێهەڵگرتنی رەوشەکە.

لەسەر ئەم تیمانە بوو بەتەواوی زانیاری وردو درشت کۆبکەنەوە لە سەر بارودۆخی نێوچەکان‌و خەڵك‌و شێوەی ئەندازیاری نێوچەکە ئایا کات‌و شوێنەکان لەبارن و رێگەدەدەن بەپەکەکە دەستبداتە چەك‌و تیۆرە شۆرشگێرییەکانی بخاتە بواری جێبەجێکردنەوە یان نا. باران دەیوت:"لە چیاکاندا دەماینەوە، لە چیایەکەوە دەچووینە چیایەکی دیکە".

باران لە ساڵی ١٩٧٨ دا، پاش ئەوەی لەپارتێکی کوردی تر جودابویەوە پێوەندی کردبوو بە پەکەکە وە. ئامانجی تیمەکان برێتی بوو لە شەن‌و کەوکردنی شوێنە جوگرافییەکان‌و ئاشنابوون بەو جێگایانەی کە دەکرێت گەریلاکان خۆیان تێیدا حەشاربدەن، لەلایەکی ترەوە دەبوو تێبگەن لە سەرنج‌و روانینی خەڵکی

لەمەڕ خەباتی چەکداریی پەکەکەو هاوکات ئاشنابن بە بنکەو بارەگاکانی سەربازانی تورك لە نێوچەکەدا.

لەراستیدا وەك چۆن گەریلاکانی پەکەکە ئامارەیان پێدەدا، زیاد لە نیوەی خەڵکی کوردستان لە دێهاتەکاندا دەژیانو بەشێك لە ئاواییە گچکەکان نە کارەبایان هەبوو نە ڕێگەیەکی تەوەن ڕێژ[93]. دووری زۆرێك لە ئاواییەکان، ئاسانکارییان کردبوو بۆ تیمەکەی باران تا دەسەلآتداران دەستیان رانەگات بە قۆڵبەستکردنیان. بەگشتی بارەگاو بنکە سەربازییەکانی تورك لە شارەکانو ڕێگە سەرەکییەکانەوە نێزیکتربوون تا لەو ئاواییانەوە کە گەریلاکان خۆیان تێدا حەشار دابوو. هەرکاتێکیش دەوڵەت گوێبیستی سەرو سەداو پشێوی بوایە، ئەوا بەزوویی تیمەکەی باران دەکرا شوێن پێیان ونکەن خۆیان حەشاربدەن.

باران دەگێڕێتەوە:"لە هەندێك لە شوێنەکاندا گوێبیست دەبووین و پێمان رادەگەیەنرا کە میری هەڵیان کوتاوەتە سەرمان، وەلێ ئەوە لەپاش کاتێك بوو کە ئێمە ئەو شوێنانەمان جێهێشتبوو". لە رەوشێکی لەم جۆرەدا ئەوە ئاسان بوو بۆ سێ کەسی یاخی کە هەڵبێنو خۆیان حەشاربدەن. هەربۆیە فەرمانەکە زۆر روون بوو، یاخۆ کۆکردنەوەی زانیاریو بەسلآمەتی گەرانەوە بۆ باکووری ئێراق لەبار بوو. بۆئەوەیش مەترسی دەستگیرکرانیان لەلایەن ئەرتەشی تورکییەوە کاڵکەنەوە، ئەوا پێشتر پێیان راگەیەنرابوو لە ئەگەری هەرچالاکیو کردەیەك خۆیان بەدووربگرن کە دەکرا ڕووبەڕوویان بێتەوە. باران لە روونکردنەوەیەکدا دەڵێ:" ئێمە چەکمان

---

[93] 1. In 1985, the national average of people living in Turkey's urban centers stood at 53 percent. In southeastern Turkey, the percentage of people living in urban centers ranged from a high of 50.5 percent in Diyarbakir province to a low of 23.1 percent in Mus province. All figures from the Il Gostergeleri, 1980– 2003 (Ankara: T.C. Basbakanlik Devlet Istatistik Enstitusu Yayinlari, 2004).

هەڵگرت، وەلێ لەتەك هیچ کەسێکدا پێکدادانمان نەکرد، ئامانجی ئێمە تەنها بەدەستهێنانی زانیاری بوو".

پێرەکەی باران لەهیچ کام لە ئاوایییەکاندا شەوانە نەدەمانەوە، ئەوان تەنها لەو کوردە نیشتەجێیانە نێزیك دەبوونەوە کە لە دەوروخولی نشینگەکانی خەڵکدا بوون. چونکە لەرەوشێکی لەو جۆرەدا گەر کۆسپو کێشەیەکیش روویبدایە دەکرا بەخێرایی وەخۆبکەویتو هەڵبێیت. یاخۆ هەرگیز نەیاندەهێلاّ کەسێك ئاگابێت وەختێ سەریان لەماڵێك دەدا، چونکە دوور نەبوو کەسەکە هەواڵی ئەو خێزانە بە پۆلیس رابگەیەنێت. لە هەرێمە کوردییەکەدا. شتێکی ئاسایی نەبوو بۆ کەسانێك کە تێوەگلابوون بە بەیتو بالۆرەی چەپگەرییو نەتەوایەتی کوردیی یاخۆ هەر لە یاسادەرچونێکی تر کە بۆ خۆلادان لە دەستگیرکردنیان پەنابەرنەبەر ئاوایییەکان، لە روانینی ئاوایییەکاندا ئەو سێ کەسە، کەسانێکی هەڵهاتوو بوون. وەلێ باران دەیگۆت هەندێك جار ئاوایییەکان لەتەکماندا هاو سۆزبوونو تەنانەت بۆ خۆیان زانیارییان بۆ دەهاوردین کە کام لە دێهاتییەکان هاوکاریی میرینو کامەیش وەك کورپەروەر ناسراون. وەلێ دێهاتییەکان پرۆژەی خەباتی چەکداری پەکەکەیان فرە بەهەند وەرنەدەگرت.

خەڵکی کورد لە رووی رۆحیو دەروونییەوە بندەستکرابوون. دێهاتییەکان هەمیشە گوێیان بۆ دەگرتین، وەلێ بە راستیان نەبوو، ئەوان وایان دادەنا ئێمە قوتابین، ئەو قوتابیانەی لە تورکیادا لە ژێر رەنجو ئازاردابوون، بۆیە واگومانیان دەبرد هاتوینو خۆمان حەشارداوە، ئەوان کاتێك لە ئێمەیان دەڕوانی ، وەك ئەوە وابوو زارۆکانی خۆیان ببینن، پێیان وابوو خەڵکێکین و ناچارکراوین رێگەی چیا بگرینە بەر. ئەوان لەلایان وابوو گەر میریی ئێمەیان دەستبکەوێت، ئەوا لەنێومان دەبات، بۆیە بەداخ بوون بۆمانو دەستی هاوکارییان بۆ درێژدەکردینو خواردنیان بۆ دەهانیین، وەلێ داواشیان دەکرد ئاوایییەکەیان جێبهێڵینو ئیدی نەگەڕێینەوە. لە

راستیدا ئێستەیش‌و ئەوسایش گروپەکەی باران ، هەرچەندە ڕووبەڕووی خەڵکانێکی زەبەند بوونەوە، وەلێ تەنها مەگەر لەتەك شوان‌و گاوان تێکەڵییانکردبێت، ئەوانەی لە ئاواییە دوورە دەستەکاندا مێگەلەکانیان دەلەڕەواند.

بارانیش وەك هەوانی دیکەی نێو پەکەکە فرە لێزانانە دەیتوانی پڕوپاگەندەکانی ببڕێت‌و بدورێت بۆ جەماوەرەکەی. گەر بەکەسێك بگەیشتینایەو جێگەی بایەخبوایە، ڕاستەوخۆ لەبارەی مارکس‌و لینینەوە قسەمان بۆی دەکرد، ئەگەر نا لەبارەی خەباتی چەکدارییەوە دەدواین. ئەوەیش ڕێگەیەك بوو کە خەڵکی گرنگییان پێدەدا. ئەوان یان هیچ شتێکیان لەمەڕ سۆشیالیزم نەدەزانی، یاخۆ ئەوان دژی سۆشیالیزم بوون‌و پێیان وابوو ئەم ڕێبازە لەگەڵ ئیسلامدا پێکەوە دانوویان ناکوڵێت. هەندێك لە لاوەکان کە لەوتوێژدا بوون تا پێوەندی لەتەك پەکەکە دا دروستبکەن، تیمەکان خواستەکانی ئەوانیان بۆ ئەوەی بێنە نێو ریزی پەکەکە وە دەدایە دواوە.

بە بڕوای باران ئەو رامیارییە لەدەرەوەی ئامانجەکانیان نەبووە. باران ئەم روونکردنەوانەی کاتێك دەدا کە لە باڵکۆنی شوقەکەیداو لە شوێنێکی دەوروبەر ستۆکۆڵمدا دانیشتبوو، ئەو لە کۆتایی نەوەدەکاندا داوای مافی پەنابەریی کردبوو لەو وڵاتەدا[٩٤].

باران دەیگۆت:" ئێمە خواستی ئەوەمان بوو ئەو خەڵکە ڕێك بخەین تا لە دەرێی تورکیادا پێوەندیمان لەگەڵ بکەن‌و رووبکەنە باکووری ئێراق". کورد بەتایبەت ئەوانەی لە ئاواییە دوور دەستەکاندا دەژیان، سەرچاوەی زانیارییەکانیان رادیۆ یان قسەی دەماو دەم بوو، ئاستی خۆنەواریی لە هەکاریدا ٣١,٦٪ بوو وەلێ لە تونجەلیدا ئەم ئاستە بەرز ببویەوە بۆ ٦٠,٦٪ لەبەر ئەوە بەدگومانیشیان لەمەڕ

[94] In 1980, the average literacy rate in Turkey was 67.48 percent. All fig- ures from Il Gostergeleri, 1980–2003.

تیمەکەی باران، دیسانەوە چانسێك بوو تاڵیانەوە راستیو دروستی بارودۆخەکە بزانن.

زۆرجار ئەوان دەیانپرسی لە باشووری کوردستاندا خەریکە چی روودەدات. ئەوان دەیانویست بزانن ئێمە چیمان دەوێتو چ گرەنتییەك هەیە بۆ ئەوەی پەکەکە براوە بێت لە خەباتەکەیدا. هەر بۆیە باران وا هەستی کردبوو کە هەوەڵ جەنگی پەکەکە جەنگێك دەبێت بۆ ئەوەی ئەو خەڵکەو پشتیوانی نێوچەکە بەدەستبهێنێتو ئەمەیش شتێکی ئاڵۆز بوو. کوشتو برو سەرکوت لەپاش کۆدەتا سەربازییەکەوە خەڵکی چاوترسێنو بەرچاو تاریك کردبوو لە بەرامبەر هەر ئەگەرێکی داهاتوودا. لەهەمان کاتیشدا تورەیی لە دەوڵەت، گرتنی بەکۆمەڵو ئەشکەنجەو زیندان، ژینگەیەکی بەر هەمهێنابوو کە هەر هێرشێکی تۆڵەسێن بەگەرمی پێشوازی لێوە دەکرا.

باران دوپاتی دەکاتەوە:"خەڵکی ئامادەبوون، بەڵێ تامەزرۆیی بۆ خەباتی چەکداریی لە گۆرێدا بوو". بەڵام بە هۆی شکستی شۆرشەکانی پێشوو ترەوە نائومێدییەکی تایبەت لەنێو چینو توێژەکانی خەڵکا چێنرابوو. باران دەڵێ:" بیرمانکردەوە گەر دەستبدەینە چەكو واخۆمان نومایان کەین بەهێزو هەرەکەتین، ئەوا پشتیوانیو کۆمەکی خەڵکی بۆ خۆمان بەدەستدەهێنین".

شتانێك کە باران تێبینی کردبوو نائومێدییەکی دیاریکراو بوو کە هامرابوو بە بێزارییو تورەیی خەڵك لە میریی، ئەم تێبینییە رێك لەلای گروپە کوردییەکانی دیکەیش دروستببوو.[٩٥]

هەمان ساڵ ئەندامێکی تەمەن ٢٩ساڵی رزگاری لە سوریاوە گەیشتە جێ، ئەو دەیەویست ئەندازەگیریی بکات بۆ پلانەکەیان تا سەرلەنوێ خۆیان رێکبخەنەوە بۆ

---

[95] A handful of unidentified militants, apparently from Dev-Yol, who took to the mountains in Turkey after the coup, described similar experiences in Uyan, Gerilla Kartaldir

خەباتی چەکداریی. سەیموس ئۆزەنگین دەگێڕێتەوە:"هەموو کەس چاوەڕێی ڕێکخراوەکانی دەرێی تورکیا بوون تا بەڵکو شتێك بکەن بەشت. بەڵێ بارو دۆخەکە بەجۆرێك بوو کە پێشبینی ڕوودانی شتێك دەکرا لەنێوچەکەدا". ناوبراو پیاوێکی ڕەوان‌و کارابوو، پاش ساڵێك بەنهێنی هاتنەناوەوەی بۆ تورکیا لەلایەن هێزەکانی ئاسایشەوە قۆڵبەستکرا. ئەو لەو ماوەیەدا گەیشتبووە بڕوایەك کە هەرکەسێك دەستبداتە خەباتی چەکداریی لەلایەن گەلەوە پشتیوانی لێدەکرێت، بەڵام پێی وابوو لەو قۆناغەدا هیچ گروپێك لە هیچ پێگەیەکدا نەبوو بۆ ئەوەی دەستبدەنە کارو چالاکی. ئەو دەیوت:" گروپێك نەبوو کە بەشێوەیەکی سیستەماتیکی کار بکات".

لەراستیدا جەماوەرو قاعیدە هەبوو بۆ کۆمەکیی گروپە کوردییەکان ، بەڵام گروپی چالاك‌و کردە نەبوو. بەڵام خەباتکارانی پەکەکە لەو قۆناغەدا ڕەوشەکەیان جودا دەبینی. هەرچەندە خەباتکارێکی کەمیان هەبوو تا لەنێو تورکیادا دەستبدەنە چالاکی، وەلێ گروپەکە هەم خۆی بەچالاك دەزانی هەمیش وایدەبینی کە لە گەشەکردندایە. باران لە هەرشوێنێك ڕێی بکەوتایە کاریگەریی دادەناو هۆشداریی دەدا کە پەکەکە لە ئامادەکاریدایە بۆ جەنگێکی دوورو درێژ.

## شەڕ

لە دەستپێکی ساڵی ١٩٨٤ دا، پەکەکە سازو ئامادەبوو، ئەوێ دەمێ تیمەکانی هەڵسەنگاندن‌و شەن‌و کەوکردنی ڕەوشەکە لە تورکیاوە بە زانیاری تێروتەسەلەوە لەمەڕ ڕەوشی هەست‌و سۆزی نەتەوەیی خەڵك‌و شوێن‌و پێگەی هێزوو لەشکری تورك گەڕابوونەوە نێو گەریلاکان لە چیادا. دەیەها شۆڕشگێر لە جەرگەی تورکیادا بە تۆکمەیی خۆیان حەشاردابوو، ئەوان لەهەوڵی پێکهێنانی میلیشیای مەدەنی بوون لەنێو چین‌و توێژەکانی خەڵکدا. ژمارەیەك لە پەکەکە ئەو باوەڕەیان لادروستببوو کە پەکەکە توانیویەتی لە هەرێمەکەدا هاو هەڵوێستی‌و هاوسۆزی

بەدەستبهێنێت. لە دیمەشقیشدا ئۆجەلان سەرکردە باڵاکانی پەکەکەی گردکردەوە تا لەبارەی رەوشە نوێیەکەوە وتوێژ بکەن. پێشتر لە وەهار یاخۆ دەستپێکدی هاویندا، رێبەری پەکەکە دووا فەرمانی دابوو، کە ئیتر کاتی هەڵایسانی جەنگە دژ بە تورکیا[٩٦].

گەریلاکانی پەکەکەیش مژووڵ دوا پلانو چالاکییەکانیان بوون، ئەوان زۆرجار لە ئاواییەکی چۆڵو راگوێزراوی کوردیی ئێراقدا کە هەڵکەوتوو لەسەر سنووریی نێوان تورکیاو ئێراق بوو، گرد دەبوونەوە، هەڵبژاردنی ئەم ئاواییەش بەهۆی نێزیکی بوو لە باشوری شارۆچکەی یەکسێکۆڤای تورکییەوە. ئەوکات چیلیك دەیوت:" شوێنێکی زۆر نهێنییە". ئەو یەکێك بوو لە سێ رێکخەرە سەرەکییەکە. ناوبراو سێ پارێزگای دیاریکردبوو، ئەو لە سێ ویلایەتی تورکیادا ورد دەبوویەوە تا شوێنێك دیاری بکات، شوێنێك هەم هێندە سەخت بێت کە بسازێت لەگەڵ خەباتی گەریلاییدا، هەمیش هاوسۆزیی نەتەوەگەرایانی کوردی تێدا بەرجەستەبکرێت.

بۆ ئەو مەبەستە سێ یەکەی سەربازیی لەنێوان ١٠ بۆ ٣٠ چەکدار پێکهات. هەریەکەیان بەرپرس لە ئامانجێکی جیاوازدا. دەستیانکرد بە پەڕینەوە بۆ نێو خاکی تورکیا، تابتوانن بگەنە ئەنجامێك لەو پارێزگایانەدا کەلەسەری رێککەوتوون. ئەوان بەدووی پێگەیەکی نێوەندییەوە بوون تابتوانن لێیەوە هێرش ئەنجام بدەنو دەرفەتی قوتاربوونیش مسۆگەر بکەن تا نەکەونە دەست دوژمن.

هەموو ئامانجە سنوورییەکان پشتگوێخران، لەبەر ئەوەی پێکدادانەکان لەوسنورانەدا، هەم لەلایەن قاچاخچییەکانەوە هەمیش لەلایەن دەوڵەتو کوردەکانەوە رەنگە رووبەرووی پلارو گازاندە ببنەوە . باران دەیوت:"لەراستیدا ئامانجمان کوشتنی رێژەیەکی زۆر لە سەربازان نەبوو". یان دەیوت:" ئامانجمان

---

[96] Extensive details on the practical planning, along with information on who took part in the attacks can be found in Celik, Agri, 73–98.

ئەوە بوو پشتیوانی خەڵك بەدەستبهێنین‌و کەمەندکێشیان بکەین تا بێنە نێو ریزەکانمانەوە".

لەهەمانکاتدا خواستێك بوو تاورەو بڕوا بدەن بەخەڵك‌و هێرشەکانیشیان پلەبەند بکەن. هەوەڵجار ئامانجەکان دەستنیشانکران‌و ژمارەیەك خەڵك دوایین بۆچوون‌و سەرنجیان لەوبارەوە دا.

باران دەیوت:" ئێمە نیازمان بوو بچینە نێوشارەکان(لەوێوە تەواوی پلانەکان دادەرێژران) لەشارەکاندا ئاگاداری ئاڵوگۆڕی پاسەوانەکان‌و جموجوڵی سەربازەکان دەبووین‌و لەنزیکەوە چاومان بەرووی رەوشەکەدا دەکرایەوە". هاوکات خەباتکارەکان رێگاکانی رەفت‌و ئامەدی نێوچەکە زۆرئاشنابوون‌و توانیان چەندین یەکەو حەشارگەی تایبەت بە گردبونەوەی چەك‌و چۆڵ چێبکەن" . هاوکات باران بەزەردەخەنەیەکەوە دەیوت": زانیارییەکانمان لەوەدا بوو کە میریی پێشبینی روودانی هیچی نەدەکرد، میریی لەو باوەڕەدا بوو کە دارای هێزو توانایەکی زۆرە"[٩٧].

باران سەبارەت بەیەکەم چالاکی‌و لێدانی یەکەسەربازییەکانی ئەروح‌و سێمیدیلی بەمجۆرە هاتە دووان:"ئێمە چاوەڕێی رۆژێکی لەو جۆرە بووین، هەستێکی زۆر سەیرمان لەوشەوەدا هەبوو، ئاخر ئێمە خۆمان بۆ چارەنوسێکی دژوار ئامادە دەکرد. ئەروح تەنها ٤٠٠٠ دانیشتووی لەخۆگرتبوو، ئەم شارۆچکەکە بە زنجیرە چیایەك گەمارۆ درابوو. لە کاتژمێر حەوتو نیوی بەیانیدا گروپێکی ٣٠ کەسیی لە گەریلاکانی پەکەکە خۆیان خزاندە نێو شارۆچکەی ئەروحەوە، یەکێك لە تیمەکان راستەوخۆ هەڵیانکوتایە سەر بارەگایەکی سەربازی لەنێوچەکەداو یەکێك لە پاسەوانەکانیان کوشت. هاوکات یەکێك لە یەکە سەربازییەکانی پەکەکە بەردەم

[97] The Eruh attack was recreated based on descriptions in Celik, Agri, 90– 92, and Ozcan, PKK, 95–96, and an interview with Celik, one of the people responsible

پایگا سەربازییەکەیان گرت تا رێلە هەردزە هێرشێك بگرن، گروپێکی دیکەیان لە نێوشارێداو لەبڵندگۆی مزگەوتەوە هاواریان کردو بوونی خۆیان بۆ خەڵکی شارۆچکەکە نومایانکرد.

هەندێکیشیان لەسەر شەقامە سەرەکییەکانی شارۆچکەکە دەستیان کرد بە دابەشکردنی نامیلکەو بڵاوکراوەکانی پەکەکەو لەبەردەم چاخانەو کۆگا بازرگانییەکاندا بۆخەڵکیان رووندەکردەوە کە ئەمە دەستپێکی شەرو خەباتی رزگاریخوازیی کوردستانە. کاتێکیش ئەوە روونبووەوە کە هیچ هەرەشەیەکی کتوپرو دژە هێرشێك لە گۆرێدا نییەو سەربازەکان هیچ ئامادەکارییەکییان بۆ کارێکی لەم جۆرە نەبوو، هیچ کام لەوان سەربازخانەکەیان چۆڵنەکردو شۆرشگێرانیش لەپێناو جبەخانەکاندا سەربازگەکەیان دایە بەر دەسترێژی گوللەو توانییان ئەو جبەخانەو چەكو چۆڵەی کە لەسەربازخانەکان هەبوو دەستیان بەسەردا بگرنو لە شارۆچکەکە بیانبەنەدەرێ.

لە سێمیدێنلیش دوو سەعات پاش ئەوە، هێرشی دووەمی گروپە چەکدارییەکانی پەکەکە دەستی پێکرد. ئەم شارۆچکەیەیش لەنێوەندیی چیاکانی نێوچەکەدایە، لەوێش هەمان تاکتیکی ئەروح گیرایە بەر لە هێرشەکانداو هەشت گەریلا لە کۆی هەژدە گەریلا کە لە نەخشەکەدا ئامادەبوونو توانیان شوێنێك لە دەرەوەی سەربازخانەکانی شارو یانە فەرمییەکان دیارییبکەن. ئەوانی دیکە شۆربوونەوە بۆ نێوەندی شار تا دڵنیابن کەسێك دژەهێرش ناکات. هاوکات یەکێك لە یەکەکان پاسەوانی رێگەکەبوون نەکا پۆلیسی شێوە سەربازیی دێهاتییەکان سەربازگەکە جێبهێڵنو رووبکەنە نێو شارۆچکەکە.

وەڵێ سەربازەکان نەیاندەتوانی کارێکی لەوجۆرە بکەن، چوون بۆیان نەلوا پێگەکانیان چۆڵبکەن. لەنێوندی شاریشدا گەریلاکان کە باران لەنێو ئەواندا بوو بەدەنگی بەرز بەیانی ئامادەکراوی پەکەکەیان خوێندەوە، کە بەناوی هێزی رزگاری

کوردستانەوەبوو، باسی لە پێکهێنانی هێزی رزگاری کوردستان دەکرد، ئەمەیش لەژێر کاریگەریی شۆڕشگێرانی ڤێتنامی باکووردا بوو کە جەنگی رزگاریی نەتەوەییان دژ بە ئەمریکا کردبوو. ئەوانەی لەو نێوەندەدا کۆببونەوە زێدەتر مەردی بەتاسەو تینو تاوبوون تاوەکو کەسی ترساو و لەرزۆك.

باران باسی دەکرد: " خەڵکی دۆشدامابوون، ئەوان گەرەکیان بوو بزانن کە خەریکە چی روودەدات. ئەوان گوێیان لەتەق و تۆق بوو، بۆیە دەکرا پێیان بێژین کە خەباتی چەکداری دەستی پێکرد، ئەوەیش نەك لێرە بەڵکو لە شوێنەکانی دیکەیش بەهەمان شێوەبوو". کورد لە باشوری رۆژهەلاتی تورکییەو تەنانەت لە ئێرانو ئێراقدا ئاشنابوون بە خەباتی چەکداریی، بۆئەوان رۆشنبوو کەهەموو ئەو راپەرینانە دوواجار مایەپوچو شکست ئامێزن. بۆ رووبەروو بوونەوەی ئەم رەوشەیش، پەکەکە پێویستبوو پرۆژەیەك بخاتە پێشچاو لە ئازایەتیو هێزوو خەباتی درێژماوە دژ بە رژێمی سەربازیی تورکیا. ئامانجەکە لێرەدا کوشتنو برینی سەربازگەلی تورك نەبوو. بەڵکو ئامانج لە چالاکییەکە پساندنی پێوەندی نێوان خەڵكو سەربازانبوو.

لەلایەکی تریشەوە راگەیاندنی یەکە سەربازییەکانی پەکەکە ئامانجێکی دیکە بوو. لەم بارەیەوە باران رونیدەکاتەوە کە ئامانج لە هێرشەکاندا دروستکردنی متمانەبوو لە نێوخەڵکدا. شۆڕشگێڕێکی پێشوو وەختێك لەبارەی رەوشەکەوە دەدوا، خۆی لەبان کورسییەکەیدا هاوردە پێشەوەو بە تاسەوە دەیپرسیی، ئایا سەرکەوتووبووینو توانیمان ئامانجەکانمان وەچنگ خەین، ئەو ئامانجانەی کە دارای بووینو باوەڕمان پێیان هەبوو؟. لەپاش هێرشەکان گەریلاکان دەکشانەوە بۆ پێگە نهێنییەکانیان لە چیاکان تا نەتوانن شوێنپێیان هەڵبگرن.

باران ئاماژە بەو رەوشە دەیوت:" ئەرتەشی تورکیا دەستیان دایە کێومالو گەڕان بەدوواماندا، وەلێ هیچیان بۆ نەکرا، ئیدی بەهەورازو نشێوەکاندا پاشەکشەمانکرد بۆ سیمیندەلی". هەروەها دەیوت:" لە راستیدا ئێمە هەرێمەکە

فره بەباشی شارەزابووین. لەلایەکی ترەوە شۆڕشوانەکان نیگەرانی ئەوە بوون کە ئاواییە دوورەدەستەکانی نێو چیاکان رەنگە هەواڵی هێرشەکانیان بەرگوێ نەکەوتبێت یاخۆ رادیۆی میریی بەجۆرێك رونکردنەوەی لەبارە داوە کە لەبەرژەوەندیی پەکەکەدا نەبووە. هەربۆیە گەریلاکان خۆیان دەگەیاندە دوورترین‌و گچکەترین ئاواییەکان‌و هەواڵی جەگەکانیان بڵاودەکردەوە. لەگەڵ هەمووان دیدارمان دەکردوو گرد دەبووینەوە، هەموانمان تێدەگەیاند کە رێگەیەکی تر جگە لە جەنگی گەریلایی لە خەباتەکەدا شك نابرێت.

بۆنموونە لەمەیدانی سیمیندلیدا لەمانگی شەشدا چەندین هاوڵاتیی بەتاسەوە گردببوونەوەو گوێیان راگرتبوو، هاوکات نیگەرانی‌و دڵخوتخوتەیشیان لێدەخوێنرایەوە. ئەوان دەیانپرسیی ئایا تەنها لێرەی نێوچە سنوورییەکاندا دەستتان داوەتە چەك یاخۆ جەنگەکانتان برەو پێدەدەن بۆ شوێنەکانی دیی، یاخۆ دەیانپرسیی هێزی ئێوە لە چیدایەو چییە؟ شتگەلێکی دیکە هەبوو کە دێهاتییەکان خوازیاربوون بیزانن، ئەویش ئەوە بوو ئایا میریی کاردانەوەی چی دەبێت.

جارێکی تر لەمانگی ئۆکتۆبەردا گەریلاکان گورزێکی دیکەیان وەشاند، لەو هەڵمەتەدا سێ لە سەربازانی تورك کوژران، هێرشەکە لەکاتێکدا بوو کە سەرۆك کەنعان عەفرین هاتبووە نێوچەکە بۆ دەربڕینی هێزو پێزی دەوڵەت‌و بەرزکردنەوەی وورەی سەربازانی دەوڵەت. لەم کاتەدا رۆژنامەی تورکیی دەربڕینێکی سەرۆکی بڵاوکردەوە کە لەئەوپەڕیی تورەیدا رایگەیاندبوو:" مار دەبێت بکوژرێت، ئەگەر چی سەریشی بچوك بێت"[98]. چەند رۆژێك دووای ئەوە. دیسان گەریلاکان هەشت لە سەربازانی تورکیایان لە جوروکای نێزیك لە سنووری ئێراق لەنێوبرد.

دوواتریش کاپتنێکی سەربازیی بۆسەی بۆدانراو کوژرا. ئەم هێرشە سەربازییانە وەك شۆکێك وەهابوو بۆ سەر ئەرتەشی تورکیاو کاریگەریی ئەوتۆی لەنێو خەڵکیدا

---

[98] Cumhuriyet, October 5, 1984

بەجێهێشت. هاوکات جەنگی پڕوپاگەندەی پەکەکە مژوڵی کاری خۆی بوو. ئەم نەزمی نانەوەی پشێویو هێرشانە کاریگەریی خۆیان لەنێوخەڵکدا چاندو متمانەیان دروستکرد. باران کە زۆربەی مەتەرێزو بۆسەکانی لەنێوچەی سیمیندلی دادەناو کاری پارتیزانی دەکرد ئەو ڕوانینەی لا گەڵاڵەببوو کە خەڵکی بڕوایان بە خەباتەکە هەیە. ئەوە لەکاتێکدا بوو کە هەزاران سەرباز لەنێوچەکەدا دامەزرابوون، وەلێ نەیاندەتوانیو بۆیان نەدەلوا هیچ زیانێك بە گەریلاکان بگەیەنن. باران دەیوت:" هێرشەکانمان هانی چەندین لاوی دابوو تا پێوەندی بەریزەکانمانەوە بکەنو ببنە پارتیزان".

هەروەها دەیوت :"لەهەوەڵ هێرشماندا لە سیمیندلی تەنها لە تیمەکەی مندا ١٨ ئەندام دەبووین، وەلێ لە کۆتایی ١٩٨٤دا ببوینە پەنجا ئەندام، لەراستیدا یەکەیەکی گەورەترمان هەبوو ، بەڵام هەندێك لەوانە نێردران بۆ باکووری ئێراقو هەندێکیشیان وەك پارتیزانێك یاخۆ ئەندامێك لە نێوخەڵکداو لە هەرێمەکاندا هێڵرابوونەوە. لە ئۆکتۆبەری ١٩٨٤ دا چیلیك کەمپی میڤرۆزی بەجێهێشتو چووە تارانو لەوێشەوە بەفرۆکە چووە دیمەشق تاچاوی بە ئۆجەلان بکەوێت. چیلیك لەم بارەیەوە دەیوت:" چاوم کەوت بە ئۆجەلان کە لەرەوشێکی ئێجگار باشدا بوو، ئەو بەتەواوی چوبووە خەیاڵی واقعیی خۆیەوە". ئۆجەلان تۆمارێکی دەنگیی شەش کاتژمێری سپاردە چیلیك تا بیباتەوە بۆ گەریلاکان لە شاخێدا. تۆمارە دەنگییەکەی ئۆجەلان لە چەند وتارێکدا وتبووی پێویستە گەریلاکان لەساڵی ئایندەدا چی بکەنو چ رابپەڕێنن[٩٩].

سەرکەوتنەکانی پەکەکە ئۆجەلانیان والێکرد کە پاش توانەوەی بەفرو نەمانی دژواریی زستان لەچەند مانگێکی کەمدا بازنەی هێرشەکانیان بەرینتربکەن تا زیاتر

---

[99] Some details taken from Imset, the PKK, 41–42, 130–131, Birand, Apo ve PKK, 135

بتوانن شۆڕبینەوە بۆنێو خەڵكو نێوخۆی توركیا. هاوكات كۆمیتەی نێوەندیی بەرەی رزگاریخوازیی نەتەوەیی كوردستانی پێكهانی. ئەندامانی ئەم بەرەیە هەوڵیاندا لە بەهاری ١٩٨٥ بەتەواوی بچنە نێو توركیاوە.

ئۆجەلان پێشبینی كردبوو بەكاریگەریی ئەم بەرەیە دەتوانرێت لە هاوینی هەمان ساڵدا راپەرین دژ بە دەوڵەت بێتە گۆڕێ. بەڵام بەهاتنی ساڵی نوێ، رەوشی ناوخۆی توركیاو پەكەكە بەجۆرێك شكایەوە كە ئۆجەلانیان لە خەمو خولیای هێرشەوە گەڕاندەوە بۆ خەمو خولیای بەرگریی‌و خۆپاراستن.

## توركیا سەرسوڕمان دایدەگرێت

لە ئاكامی هێرشە لەناكاوەكانی ئەروحو سەمیندەلیدا توركیا رووبەڕووی هەژانو سەرسوڕمان بوویەوە. ئەوە لەكاتێكدا بوو تەنها هەشت مانگ تێپەڕی بوو بەسەر گواستنەوەی حكومەت لە دەسەڵاتی سەربازی‌و هێزەوە بۆ حكومەتێكی مەدەنی‌و دێموكراتیكی هەڵبژێردراو[100].

ئەودەم وڵات لە كۆدەتای ١٩٨٠وە لە نێو حوكمی عورفیدا تێدەپەڕیی، وردە وردە یاسای عورفی‌و سەربازی لە هەڵگیراندا بوون. هەرچەند دەبوو دەوڵەت ئاگاداری بەرنامەو پلانی پەكەكە و ئۆجەلان بوونایە. رۆژنامەی سەربەخۆیی كە لە ئەڵمان دەردەچوێنرا هەموو مانگێك تواناو تینی پەكەكەی بۆ هەڵایسانی جەنگ و هەرەشەی هێرش وەشاندەكرد. بەڵام ئەم ئەنجامگیرییەی دەوڵەت یەكێك بوو لە بڕیارە هەڵەكانی دەوڵەت لەسەر هێوربوونەوەی رەوشی باشوری رۆژهەڵات. لەراستیدا ٣ ساڵ دووای ئەو رووداوانە جەنەراڵ یازگان قایا دانی بەوەدا نا كە هەموو ئەو رووداوانە پێشبینی نەكراو بوون. ناوبراو لەسەرو بەندی هێرشەكاندا بەرپرس بووە لە یەكەی حەوتەمی ئەرتەشی توركیا لە باشوری رۆژهەڵاتدا.

[100] This section relies on the following: Ahmad, Modern Turkey, 181–190

جەنەراڵ کایا وتبووی:" ئۆجەلان تا ئەوکات نەدەزانرا کێیە، ناوی ئەو ئاشنابوو، وەلێ شوێنکەوتووەکانی وەك ڕێگرو گروپێکی دز ناسێنرابوون". جەنەراڵ گازاندەی ئەوەی دەگرت کە تەنانەت پاش هێرشەکانیش دەوڵەتی تازە دەستبەکاربووی مەدەنیو هەڵبژێردراو، هیچ ڕێوشوێنێکی ئەوتۆو تەواوی بەرامبەر بەو هێرشانە نەگرتەبەر کە شیاوی کاریگەرییەکان بێت. سیاسییەکانیش لە ئەنکەرەدا پێیان وانەبوو ئەو هێرشانە ئاماژەیەکی سەرەتایین بۆ دەستپێکی گەورەتر. ئەوان تاوتوێی ڕەوشەکەیان بەوە دەخەملاند کە هێرشەکان پاشماوەی ڕووداوەکانی کۆدەتای سەربازی ١٩٨٠[101] بە چاوخشاندنەوە بە رابردوویشدا ئەوە ڕوونە کە هیچ جێگەی رامانو سەرسوڕمان نییە کە بێئاگایی دامەزراوەی سیاسییو سەربازیی لە ئاست هەوەڵ لێدانی پەکەکەدا لە گۆڕێدا بووە. فەرمانرەوایانی سەربازی لە ١٩٨٠ -١٩٨٣دا بەتەواوی سەختگیرو بێبەزەیی بوونو بەزەبرو زەنگ ڕێبازو ئامانجەکانیان لەپێشچاوگرتبوو، بەلاّم توانیان سەرکەوتن بەدەستبهێنن.

ئیدی توندوتیژیی سیاسیی ٩٠٪ دای لەکەمیو ئابووری ولاّت جێگیربوو، جەنەراڵەکانیش پەیوەستبوون بەو بەڵێنانەی کەدابوویان بۆ ئەوەی لێگەڕێن لە دەسەلاّت بۆ سیاسییەکان. ڕەنگە ئەمە هۆکارێکی گچکە بێت بۆ سەرلەنوێ بیرکردنەوە لە هەلاّیسانی توندوتیژی سیاسیی لە ولاّتدا. جەنەراڵەکان تەنها بەرۆکی ئەوانەیان نەدەگرت کە بە پشێوییەکانو نائارامییەکانی کۆتایی حەفتاکان سزایاندابوون، بەڵکو پێیان وابوو گۆڕانی یاساکان دیسانەوە پشکی مەزنیان هەبوو لە کردنەوەی بوارگەلێك بۆ ڕوودانی پشێوی لە ولاّتدا ، هەر بۆئەم مەبەستەبوو ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی تورکیا لە پاش کۆدەتا سەرلەنوێ سیستەمی ئایدیۆلۆژیو سیاسیو یاسایی تورکیای داڕشتەوە. هاوکات دەستووری بنچینەیی

[101] Birand, Apo ve PKK, 126

وڵات سەرلەنوێ نوسرایەوە بۆ ئەوەی بەتەواوی ئازدی دەربڕینو بزووتنەوەو کۆمەڵەو تەنانەت لێکۆڵینەوە زانستییەکان سنووردار بکات.

هەموو ئەمانە بەشێوەیەکی گشتی کە خۆیان لە سنووردارکردنی چالاکییەکاندا دەدییەوە لەپێناو پاراستنو پەنادانی ئاسایشو یەکێتی خاکی تورکیادا بوو. ئەم دوو وشەیە پاراستنی ئاسایشو یەکێتی وڵات واتای نادیاریان هەبوو، هەربۆیە بەخواستی دەوڵەت راڤەیان بۆدەکراو لە سۆنگەیانەوە ئامانجەکانی میریی دەپێکرا.

کەنعان عفرین لە یاداشتەکانیدا نوسیویەتی:" پێویستبوو بە بڕێك لە مافیی شەخسیمان قوربانی بدەین تا بتوانین ئاسایشی کۆمەڵگە جەمو جۆر بکەین". جەنەراڵەکان هەمیشە گازاندەی ئەوەیان هەبوو کە پارتە سیاسییەکانو سیاسەتی پارتەکان نەتەوان بوو لە ئاست رووداوەکانداو نەیانتوانیوە پێکەوە پەرلەمانی مەنگو مۆلەق بخەنە گەڕ. ئیدی بەشیوەیەکی سیستەماتیکی کاریانکرد بۆ تێکشکاندنو بەربەستدانان لەبەردەم پارتەکۆنەکانو دوورخستنەوەی سیاسییە کۆنەکان. رێبەری پارتەکان بۆ ۱۰ ساڵ لە کاری سیاسی دووردەخرایەوەو پەرلەمان تارە کۆنەکانیان بۆ ماوەی ٥ ساڵ لە رەوشی سیاسی دووردەخستەوە و بۆیان نەبوو لە دامەزراوەی میریدا یاخۆ پارتی سیاسی نوێ دامەزرێنن. بەمجۆرە هەموو ئەو پارتانەی کە لە پێش کۆدەتادا لە گۆرەپانی سیاسیدا هەبوون هەڵوەشێنرانەوە.

لە دەستووری بنچینەییدا و لە نێو یاسا نوێیەکاندا هاتبوو کە پارتە نوێیەکان قەدەغەیە لقی تایبەت بە لاوانو ژنانیان هەبێت یاخۆ لە ئاواییەکاندا بنکەو بارەگا بکەنەوە[١٠٢]. بۆ هەموو قوتابیو پرۆفیسۆرو فەرمانبەرانی میریی نەبوو لە دامەزراوە مەدەنییەکاندا، پەیوەندی بکەن بە پارتە سیاسییەکانەوە. ئامانج لەم کۆتو بەندانەدا خۆ لادان بوو لە دووبارە بوونەوەی ئەو رەوشە توندو ناهەموارەی بەرۆکی

[102] Quoted in Pope and Pope, Turkey, 148

ولاّتی له کۆتایی حەفتاکاندا گرتبوو ، ئیدی بەم بەندو کۆتانە لاوان نەیاندەتوانی خۆیان لەناو گروپو ڕێکخراوو کۆمەڵەکاندا ڕێکبخەنەوە.

هەوڵی جەنەراڵەکان لە بووتیادنانەوەی کۆمەڵگەی نوێی تورکیدا بە یاسا نوێیەکانو ڕێکخستنە نوێیەکانەوە نەوەستا. لە سەروەختی هەڵبژاردنی نەتەوەیی بۆ ئەوەی دەوڵەت لە نەزمێکی سەربازییەوە بەرن بەرەو دەوڵەتێکی مەدەنی. ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئەو مافەی پێدرا بوو کە هەر پارتێکی سیاسی یان کەسایەتییەك بداتە دوواوە، بەتایبەت لەنێو ئەوانەدا کە لەئامادەسازیدا بوون بۆ پەرلەمانی داهاتوو.

بەمجۆرە نێزیکەی حەوسەد کاندید کە خۆیان پالأوتبوو بۆ پەرلەمان، لەلایەن ئەنجومەنەوە درانە دوواوەو هاوکات لە کۆی پانزە پارتی سیاسییدا تەنها دوو پارت ڕێگەیان پێدرا کە بەشدارییکەن لە هەڵبژاردنەکاندا. لەو سێ پارتەیشدا تەنها یەکێکیان سەر بە ڕەوتی سەربازیو ئایدیۆلۆژیاو سیاسەتی سەربازەکان نەبوو. بەم جۆرە لەنێو ئەو ڕەوشە پڕ لە بەندو باوەی دەسەلأتدارییەتی سەربازیدا بۆ دووبارە پێکهێنانەوەی کۆمەڵگەی تورکسالار، پارتی نیشتمانیی سەربەخۆ بەڕێبەرایەتی تورکوت ئۆزاڵ، کە تەکنۆکراتێکی ئابووریناس بوو، توانی لە هەڵبژاردنەکاندا سەرکەوتن بەدەستبهێنێت. جەنەراڵەکان لەم ڕەوشەدا چەند هەنگاوێکیان گرتە بەر بۆ ئەوەی دڵنیابن لەو ڕەوشەی کەلەپاش گەڕانەوەی حوکمی ولأت بۆ دەسەلأتی مەدەنی بەر گوێیان دەکەوێت. ئیدی دەستووری بنچینەیی تەواوی تواناو دەسەلأتی بەخشییە کەنعان عفرینی سەرۆك بۆ ماوەی حەوت ساڵ، ئەو تا ئەوکاتەی پۆستەکەی جێدەهێڵێت هەموو هێزێکی پێدرابوو. هاوکات ئەنجومەنەی ئاسایشی نەتەوەیی ٤ ئەندامی مەدەنی زیادکرد، ئەمە لەپاش گواستنەوەی دەسەلأتەوە هات بۆ دەسەلأتێکی مەدەنی، ئەمانە لەلایەن پێنجەم ئەندامەوە کۆنترۆڵکرابوون کە کەنعان عفرینی سەرۆکی کۆدەتا بوو. لە ڕاستیدا ئەم ئەنجومەنە

دووباره رێکخستنەوەی وەك ئەنجومەنێکی راوێژکاری بوو، بەڵام خۆی لەخۆیدا دیسانەوە ئەرکی پاراستنی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی لەپێشچاوان بوو. هەروەها لەدەستووری بنچینەیدا هەموو راگەیەنراوەکانی پێویستبوو پێگەی هەوەڵیان هەبێت لە لایەن وەزارەتەکانەوە. لە تورکیای دیموکراسی سەرلەنوێ دامەزراودا، چالاکوانانی کورد ئیدی لە مەنفا یاخۆ لە زیندان یان ئەوانەی لەتورکیادا ئازاد بوون، لەو باوەرەدا نەبوون، کە تەنها ژورێك هەبێت بۆ چالاکیو کاری ئەوان.

هاوکات بەڵگەیەکیان شکنەدەبرد کە بتوانن بەهۆیەوە مافەسەرەتاییەکانی نەتەوەی کوردی تیادا ببیننەوە. لە دەستووری بنچینەیی نوێدا کە لەژێر فەرمانرەوایانی سەربازیدا لەدایك بوو، راگەیەنرابوو کە هەموو هاووڵاتیانی تورکیا تورکنو تورکیی زمانی فەرمیی دەوڵەتە، لەلایەکی تردا ئاماژەدرابوو کە ئەو بەندانە قابیلی گۆرانکاریی نین. هاوکات پارتە سیاسییەکان لەژێر ئەو بەندو یاسایانەدا بۆیان نەبوو بانگەشەی بوونی کەمایەتی نەتەوەیی بکەنو بۆشیان نەبوو دەم بدەن لەو پرسانەی کەباس لە فەرهەنگو کلتوورو گرفتی نەتەوەیی دەکەن لەتورکیادا[١٠٣].

هاوکات زمانی کوردی لەژێر بەندی تایبەتی ٢٩٣٢دا بۆی نەبوو بەکاربهێنرێت یاخۆ بخوێنرێت. بەم جۆرە بەبێ ئەوەی ئاماژەش بە وشەی کوردی کرابێت ، هەموو بوارێك لەبەردەم زمانو ئەدەبیاتو بوونی کوردیدا قەدەغەکرابوو. هەموو ئەم رێگریانە نوێ نەبوون، تەنها شتێك کە نوێ بوو ئەوە بوو کە تەنانەت دەربرینێك کە بۆنو بەرامەی نەتەوەی تری دەدا بەدەستوور رێ لەبەردەم هەناسەیدا گیرابوو.

کاتێك هێرشەکانی پەکەکە روویاندا، بەتەواوی جێگەی تێرامانو سەرسورمان بوو، چونکە بەفەرمی لەتورکیاداو بەدەستوور شتێك بەناوی کوردەوە بوونی نەبوو. بەڵام لە شەستو هەفتاکاندا گەر کارێکی وەهاش بوایە ئەوا پارتو رێکخراو و

---

[103] Political Parties Law No. 2820, section 81

بلآوکراوەی نیمچەکوردی و هەڵبژاردنی شارەوانییەکان بوونیان هەبوو، هەموو ئەو دەستکەوتانە لە کۆدەتای ۱۹۸۰دا لە گۆڕنران. لەتورکیای وێدا هەموو بۆنو بەرامەیەکی کوردی بەیاسا ریشەکێشکرا.تەنانەت سەرەتاییترین بوونی کورد، ناوی منداڵو شوێنو تەعبیرە کوردییەکان بوون، هەموو ئەوانە بەتەواوی لە دامەزراوەکانی تورکیادا قەدەغەکرانو هەردەستەواڵەیەکی لەو جۆرە تێکرا بەکاری جوداخوزای نێودەبرا. تەنانەت بەچەند رۆژێك پاش هێرشەکانی پەکەکە کاتێك رۆژنامەنووسێکی تورك سەردانی ناوچەکەی کردبوو نوسیبووی:" لەوێندەر تورکگەلێك هەن کە فرە بە سەختی بەتورکی قسان دەکەن". تا ئەو رادەیە نەتوانرا بوو بوترێت بە زمانێکی جیاواز دەدوێن کە زمانی کوردییە[١٠٤].

[104] Cumhuriyet, October 18, 1984.

دوو ساڵ پێش دەستپێکی خەباتی چەکداریی پەکەکە. چەتین غونغور ئەندامی باڵای کۆمیتەی ئەورووپای گروپەکە، دەستیدابوویە وتوێژ بۆ ریفۆرمێکی نێوخۆیی. ئەو بەهەموو رێگەیەکی زیرەکیو کاریی سەختگیرو ورییانە هۆشداری دایە گروپەکە کە بەنەزمێکی زۆر رەهاو تاکرەوانە مامەڵە لەگەڵ ئەندامانی پەکەکەدا دەکرێت[١٠٥].

نیگەرانی چەتین بەتەواوی تاوی سەندبوو، ئەویش زێدەتر لەوکاتەوە بوو کە بۆماوەی ساڵێك لەتەك گروپەکەدا لە ئەورووپا کاری کرد. ئەو ساڵی ١٩٨١ نێردرابوویە ئەوێ تا بتوانێت تۆرێکی پشتیوانی لەنێو کوردانی ئاوارەی ئەورووپادا چێبکات.

چەتین خوازیاربوو برەو بدرێت بە مشومرە نێوخۆییەکان لە کۆنگرەی دووەمی پەکەکەدا کە بریاربوو ساڵی ١٩٨٢ ببەسترێت. چەتین لە ئەڵمانیاوە بەمەبەستی بەشداری لەو کۆنگرەدا گەرایەوەو کۆنگرەکەیش لە ئۆردوگای راگوێزراوی فەلەستینییەکان لە نێوان سنوری ئەردەنو سوریا گرێدرا. ئەو شوێنە گەلێ دوور نەبوو. ئۆجەلان لەم کۆنگرەیەدا بەزمانێکی تەنز ئامێزەوە لەبەرامبەر چەتینو نەزمی ئەورووپاو هەرجۆرەمشتومرو گفتوگۆیەك وەستایەوەو هەموو دەنگێکی جوداوازی سەرکوتکرد.

بەمجۆرە ئەندامانی دیکەی کۆنگرە بایەخێکی ئێجگار کەمیان دایە ئەو باسو خواسەی کە لە نیازو نوارینی چەتین غونغوردا هەبوو. ئێس کە ئەندامێکی پێشووی پەکەکەو سەرکردەیەکی بەرچاو بوو دەگێرێتەوە:" ئێمە تەنها هۆشمان لەلای

---

١٠٥. تەواوی ئەم بەشە بریتییە لە زنجیرە دیدارێکی ضروێر لەطەڵ بەرترسە ئێشووتکانی ئەکەکەدا.
A vari- ety of unpublished sources were critical to this section, including the open let- ters of Cetin Gungor to the PKK, dated April 15, 1983, May 10, 1983, Oct. 19, 1983, March 18, 1984, and August 16, 1984, and an unsigned, undated eulogy for Enver Ata in 1984. Also used was a pamphlet from Die Gruenen/GAL, "Politische Mord in Europa," 25/6/87.

دەستپێکی خەباتی چەکداری بوو، ئیدی نەماندەپەرژا بیربکەینەوە بۆچی ئەو بەرەو بالأیی دەڕوات، پێمان وابوو هەموو ئەو شتانە شتانێکی لابەلاو لاوەکین".

ناوبراو لە ئەڵمانیادا ژیانێکی سەرکەوتووانەو باڵەخانەیەکی دڵگیری پێکەوەنابوو. لەراستیدا ئۆجەلان وادیاربوو بەشێك لە خولیا نەتەوەییەکانی لەدەستدابوو. هەربۆیە غونغور کە ناوی نهێنییەکەی بە سەمیر ناسراو بوو. بەهیچ جۆرێك ئامادە نەبوو دەستبەرداری دڵخوتخوتەو نیگەرانییەکانی بێت. هەربۆیە پاش ئەوەی لە کۆنگرەی دووەم گەڕایەوە ئەڵمانیا، ئیدی بەجدی دەستی دایە مشتومڕ بۆ چاکسازی و گۆڕانکاریی. چەتین بەدەر لە نیگەرانییەکانی لەمەڕ پێکهاتەی ناڕۆشنو ستەمگەرای پەکەکە. خوازیاری ئەوە بوو جارێکی دیکە چاو بە رێکخستنەکانی ئەورووپا بخشێنرێتەوە، بەتایبەتی لەوکاتەدا ئاراستەکرابوون تا پوڵو پیاو بۆ جەنگیی چەکداریی نەخشەبۆدارێژراوی پەکەکە گردبکەنەوە. چەتین لەوباوەڕەدابوو لەجیاتی چالاکییەکانی پەکەکە لە ئەورووپا پێویستە رووبکرێتە نێوچەکوردییەکانو هانبدرێنو رۆشنبیربکرێنو یاریدەیان بدرێتو لەگەڵ ئازارەکانی میللەتدا بژین.

هاوکات چەتین لەو باوەڕەدابوو پەکەکە تابازنەی پەیوەندییەکانی لەدەرەوەی گروپە چەپە لاوازو لاوەکییەکاندا فراواننەکات ناتوانێت چالاکتر دەرکەوێت. پەکەکە پێویستە لەگەڵ رێخراوەناحکومییەکانو پارتە سیاسییە سەرەکییەکاندا بازنەی پەیوەندییەکانی بەرینبکات، هاوکات پێویستە کۆمیتەیەکی تۆکمە لە رێکخستنەکانی ئەورووپادا دیاریبکاتو ئازادی بۆچوونو رافەی رووداوەکانیان هەبێت. لەراستیدا نەویستراوە ئەوراستییە بوترێت یاخۆ تێبینی نەکراوە، ئەگەرنا دەسەلأتی ئۆجەلان لە چالاکییەکانی ئەورووپادا دیاریکراو بووە. سەرلمان ئەرسەلان کە خەباتگێڕێکی پێشووی پەکەکەو کەسێکی نێزیك لە سەمیر بوو لە ئەورووپا لەم بارەیەوە روونکردنەوە دەداتو دەڵێت:" سەمیر مرۆڤێکی دۆگما نەبوو، ئەو پێی وابوو هەمووشتێك دەکرێت مشتومڕی لەبارەوە بکرێت، پێویستیش نییە هەمیشە

بڕیارەکان لەسەرەوە بۆ خوارەوە دابەزن. خەڵکی پێویستە سوود لە ئەزمونی خۆیان ببینن‌و سەربەخۆبن لە بڕیارو خودموختاربن لە بڕیارداندا".

ئۆجەلانیش هەمیشە نیگەرانی ئەو کاردانانەوە بوو کە لەهەمبەر دەسەڵاتیدا قوتدەبنەوەو هەمیشە لەخەمی لێکترازانی ریزەکانی پەکەکەدا بوو، بۆ ئەم مەبەستەیش سەمیری بە تەگەرەو کۆسپ دەزانی. هەربۆیە لەسەرەتادا هەوڵی دا کاریگەریی‌و هێزی سەمیر لەنێو کۆمیتەی ئەورووپای پەکەکەدا کەمبکاتەوە. ئەوەبوو هەڵمەتێك بۆنابوتکردنی تواناکانی سەمیر لە دیمەشقەوە سەرچاوەی گرت، لەوێندەر نزیکەکانی ئۆجەلان گەلێ پرس‌و جۆیان لەسەر تواناکانی سەمیر ورووژاندو هاتنە ئەورووپا. ئەوان بەئاماژەدان بە خوێنساردی سەمیر لەپابەندبوون بەبنەما شۆڕشگێرییەکانەوەو رەخنەو گازاندە لە رەوشی کاروبارە ناوخۆییەکانی پەکەکەو زیادکردنی نەزمی لادان لە رێکخستنەکاندا رووبەڕووکرایەوە. ئەرسەلان دەڵێ:" ئیدی یەك بەیەك هەموانیان دوواندو ئەوەیان تێگەیاندن یاخۆ هەوڵیاندا ملیانپێبدەن کە سەمیر خەریکە کارێکی هەڵە ئەنجامدەدات‌و ئەنجومەنی ئەورووپای پەکەکە نەیتوانیوە ئامانجەکانی بهێنێتەدی". هەروەها دەیوت:" ئەورۆ کە ئاوڕدەدەمەوە دەبینم هەموو پلانەکان لەدەوروخولی ئەوەدا بوون کە خۆیان لە سەمیر قوتاربکەن". سەمیر کەسێك بوو لەدەوروبەری ١٩٧٥دا وازی لەپلانەکانی هێنا تا ببێتە مامۆستاو پەیوەندی کرد بە ئۆجەلانەوە، ئەو دارای بڕوایەك بوو کە پەکەکە بۆ سەربەخۆیی کوردستان دەستەبەری دەکات. سەمیر کەسێکی وردو وریاو فزوڵ بوو، ئەو ملە جیڕەی لەهەر شتێکدا دەکرد کەدەهاتە پێشەوە. هەربۆیە سەرەڕای ئەوەی نێردراوانی ئۆجەلان فشارو فووی زۆریانکرد بە زڕاندنی نێوی سەمیرداو هەوڵیاندا پاشگەزی بکەنەوە لە باوەڕەکانی، ئەو بەپێچەوانەوە سوربوو لەسەر کارەکەی‌و دوپاتیکردەوە کە پەکەکە وەك پارتێکی پێکهاتە لینینی پێویستی بەراستکردنەوەی ناوخۆییە. سەمیر هێند وریابوو تا لەپرس‌وجۆکانی ئۆجەلان وەك

ڕێبەرێك خۆی دەربازبكات، وەلێ هەمیشە ئەوەی خواستبوو، ئایا ئۆجەلان پێویستە لەهەموو كێشەو چارەسەری گرفتێكدا پشتی پێببەسترێت؟ ئەو هەمیشە دەیپرسی چالاكییەكانی پارتی بەتەنهایی لەگەلّ ئەركی جێبەجێبكرێن‌و ئەركی شەخسی‌و تایبەتدا ناتوانرێت سەركەوتووبن.

لەنامەیەكدا كە ئاڕاستەی ئۆجەلانكرابو ئاماژەیان بەوەدابوو كە پێویستە لەو ژیانە خەیالّییەدا بەئاگابێتەوە[106]. سەمیر بۆ ماوەی ٣ سالّ بوو لە ئەوروپادا ژیا بوو، لەوێ فێری گفتوگۆی ئازادو نەزمی دیموكراتی‌و دیموكراسییەتی ڕاستەقینە ببوو. هاوكات لەتەك هاوپەیمانە چەپە توركەكانی پەكەكە لەوانە دیڤ یۆل دا لە نێزیكەوە پێوەندی هەبوو. ئەوانیش دەستیان دابوویە چاوخشاندنەوە بە هەلّوێستە لینینگەراكانیان‌و پێیان وابوو دیموكراسی دواجار دەبێت شۆڕش لە هەگبەیدا هەلّگیرابێت.

ئیدی كۆی هەموو ئەم هۆكارانە بوونە داینەمۆی باوەڕی سەمیرو ئەو هەستەی لا گەلاّلە بوو كە پەكەكە ئاتاجی بە گۆڕانكارییە. لە ڕاستیدا ژیانی ئۆجەلانیش لەگەلّ شوێنی جیاوازی جیهاندا بوو، بنكەی مانەوەی ئەو لە دیمەشقدا بوو كە دیكتاتۆریەت هێشتبوویەوە، ولاّتانی دیكەی دەرێی سنوورەكانی سوریایش هەر دیكتاتۆرو دیموكراسییەكی مەنگۆل‌و ناتەواو بوون. لەهەموو ئەو ولاّتانەدا كە ئۆجەلانی لێبوو گفتوگۆی ئازاد نەبوو نەشیان دەویست ڕەوشێكی لەو جۆرە سەرهەلّبدات. ئۆجەلان كەتەماشای پێوەندییەكانیشی لەگەلّ دەڤ یۆل دەكرد تێدەگەیشت كە خالّی هاوبەشیان لەنێواندا لاواز بووە. ئەو تاوانی هەموو ئەوانەی خستبووە ئەستۆی سەمیر، پێیشی وابوو سەمیر لە نێو دنیای خەون‌و خەیالّدا دەژی. ئۆجەلان لەوتارەكانیدا جەختی لەوە دەكردەوە كە لەناو پەكەكەدا هەمیشە

---

[106] Semir, open letter to the European committee, April 15, 1983.

لایەنی لاوازو بەهێز سەرکەوتن‌و شکست باسکراوەو وەستان لەسەر پێشهاتەکان کراوەو گیانی رەخنە زیندوو بووە ئەوەیش کە سەمیر با سی لێوە دەکات نارەوایەو ئەو رەخنەکانی زادەی نێو کۆنگرەنین‌و لە ئەورووپاوە دەدوێ. هەر بۆیە نیازی سەمیر نیازێکی شەرخوازانەو غایەلەی سەمیر غایەلەیەکی خراوە. هەروەها ئەوەیشی دوپاتدەکردەوە کە سەمیر هیچ کارێکی نەکردووە تا پەکەکە بەهێزبکات[١٠٧].

لەراستیدا تائەوکات سەمیر خۆی بەبەرپرس لە ئەنجومەنی پەکەکە دەزانی لە ئەورووپا، وەلێ نێردراوانی ئۆجەلان ئەویان لەو بەرپرسایەتییە دوورخستەوەو پێیان راگەیاند کە پێویستت بەکات هەیە تا بە هەڵوێستەکانتدا بچیتەوە. لەبەرامبەردا سەمیر ئەوەی درکاند کە بەڵی لە ئێستادا دۆگماتیزمی نێوخۆیی حزب زۆر لە بیرکردنەوەو ئیرادەی من بەهێزترە. هەربۆیە بە پێویستی دەزانم کە ریزەکانی ئەو حزبە چۆڵبکەم. سەمیر لە نامەیەکی کراوەیشدا بۆ هاو رێبازانی نووسیی:" ئەستەمە بتوانن لە ئێستادا لە ئاستێکدا بن کە لەمن تێبگەن، رەنگە کاتێك بێت ئەوە روویدات".

لەراستیدا ئاسان نەبوو بۆ سەمیر کەواز لەپەکەکە بهێنێت. ئەو جیا لە رەخنە ئایدیۆلۆژییەکان لە ئۆجەلان‌و چالاکییەکانی پەکەکە بەهەموو واتایەك پشگیرو پشتیوانی پەکەکە بوو، ئەو نێزیکەی حەوت ساڵ لەتەمەنی تەرخانکردبوو بۆ پەکەکە. هەربۆیە چەند مانگێك پاش وازهێنانەکەی رازی بوو لەیەکێك لە بەشەکانی کۆلێژدا لە ئاڵمان لەگەڵ چالاکوانانی پەکەکە بەمەبەستی پێکهاتنەوە دانیشتن‌و دیداربکات. دوواجار سەمیر لەتەك چالاکوانەکان کۆبوویەوە، هەرچەند بیروڕاکانی سەمیر گۆرانیان بەسەردا هاتبوو، تەنانەت لێدوانەکانی زۆر پۆزەتیڤ بوون، ئەمە

---

107 Ocalan, PKK'ye Dayatilan, 47.

وای کرد کە گومان لەپەیوەندی سەمیرو شاهین دۆنمز بکەن کە بەکرێگیراوی میتی تورکیو ئەندامی پێشووی پەکەکە بوو.

لەبەرئەوە چالاکوانەکان بە سەمیریان وت، ئەو ناتوانێت شوێنی کۆبوونەوەکە جێبهێڵێت تاوەکو لەو بارەیەوە لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکرێت.

دواجار سەمیر لەو پلانەدا توانی هەڵبێت، وەڵێ پاسەوانەکان دەیگرنەوەوە و لە شەوێکدا توندی شوقەیەکی دەکەن، ئیدی سەمیریان ئەو شەوە هێشتەوەو لەلایەن چوار پاسەوانەوە هەموو پارەو پوڵو شوناسنامەیەکیان لێزەوتکرد. سەمیر لە نامەیەکدا کە لە ١٩-١٠-١٩٨٣ نوسیویەتی زۆر بە تورەییو قەڵسییەوە باس لەوە دەکات کە نە پێشبینی کارێکی لەو جۆرەی کردبوو نەیش توانای ئەوەی هەیە هەڵسەنگاندن بۆ هەڵوێستێکی لەوجۆرەبکات. لەراستیدا هێشتنەوەی سەمیر بەدەستبەسەریی وایکرد لەهاوەڵەکانی بەدوویدا بگەڕێن، پاسەوانەکانی سەمیریش ئاگاداریان کردەوە گەر رووداوی رفاندنەکەی باس بکات لەناو شۆڕشگێراندا ئەوا ژیانی دەکەوێتە مەترسیەوە. هەرچۆنێك بێت سەمیر توانی بۆ دووەمجار لەچنگ چالاکوانەکان قوتاربێت.

لەپاش هەڵهاتنی لە دەستبەسەرییەکە، لەونامە کراوەدا کەنوسیبووی ئەوەی خستبووە روو کە هەموو پێوەندییەکی لەگەڵ پەکەکەدا پچراندووە، دوپاتیشی کردبوویەوە کە بەڵێ دژ بە هەموو پرەنسیپەکانی پەکەکەیەو لەروویان دەوەستێتەوەو وەك هێزێکی ئایدیۆلۆژیی مەترسیداریش لێیان دەڕوانێت. لەو بارەوە نوسیبووی:"ئێستا دەزانم ئەم هێزە چەند ترسناك بوو، چەندیش لەسەر هەقو رەوابووم کە دژی ئەم رەوتە نەفرەتییە وەستابوومەوە". سەمیر بەمجۆرە لە گازاندەو گلەیی لەپەکەکە بەردەوام بوو. پێشی وابوو لەپێناو شۆڕشی کورد دا ناتوانێت دەستبەرداری خەباتو چالاکی بێت، وەڵێ ناتوانێت لەسەر نەهجی پەکەکە بڕوات. ئەو هۆشداریشی دا کە بایکۆتکردنی ئەو هەڵەیە. ئەوە هیچ سوودێك

بەپەکەکە ناگەیەنێت کە بمکەنە دوژمنی خۆیان. ئەم راگەیانراوەی سەمیر بۆ بەردەوامبوونی لەکارەکەی دروست وەك هەڕەشەو گوڕەشەیەك بۆسەر ژیانی شەخسی ئۆجەلان و وەك تەحەدایەکی راستەوخۆ بۆ سەر پەکەکە لێکدرایەوە. پەکەکە هیچ کات لەئاست دابەشبوونەکاندا بێدەنگ نەبووەو نەرمی نەنواندووە.هەر لەساڵی ١٩٧٧دا پەکەکە دووان لەچالاکوانەکانی خۆی لە غازی عەینتابدا کوشت، ئەوەیش پاش ئەوە روویدا کە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد لە گروپەکەیان جودا بوونەتەوە. هەر بۆیە سەمیریش خۆی وەك رکابەری پەکەکە راگەیاندبوو، بۆیە لە دەستپێکی ١٩٨٤ دا لە رۆژنامەی سەربەخۆیی کە رۆژنامەیەکی نێوخۆیی پەکەکە بوو سەمیر وەك غەیان بە شۆڕش لەقەڵەم درا. ئەوەیش لە ئەدەبیاتی پەکەکەدا ئاماژەیەکی روونو رەوان بوو کە پێویستە خۆی بۆ مردن ئامادە بکات. لە راستیدا ئەوە بۆ پەکەکە گرنگ نەبوو کە سەمیر رۆشنبیرێکی ورياو وردە، نەبوونی ئەو هیچ لەمپەرێکی لەبەردەم هەیمەنەو هێزی گەشەکردووی پەکەکەدا دروست نەدەکرد. لەنێو پەکەکەیشدا زۆرینەی هاورێکانیو پێوەندییەکانی لەتەك ویدا پچڕابوون. بەمەیش دەرفەتی کارکردنی لەنێو گروپێکی دیکەدا سنووردارکرابوو. هاوکات بانگەشەی سەمیر بۆ زەمینە سازکردن بۆ ئازادی بیروڕاو دێموکراسی نێوخۆیی هاوتانەبوو لەتەك میتۆدی هیچ کام لەپارتو گروپەکانی دیکەدا.

نوسینەکانی لەبواری چەپڕەویدا و تۆمەتبارکردنی ئۆجەلان بەوەی کە کەسێکە گرفتی دەروونی هەیە، هۆیەك بوو تا گروپە فاشیستەکان کەڵك لە زرموکوتی نێوان خودی چەپەکان وەربگرن. تەنانەت هەندێك لە چالاکوانانی پەکەکە ئەوانەی وابیریان کردبوویەوە کە ئۆجەلان بۆ پاڵپشتنی پێگەی سەرۆکایەتی خۆی ئەو هەرا هوریایەی لە سەمیر بەرزکردووەتەوە، ئەوان بە هێرشو هۆشدارییەکانی سەمیر نا ئارام بوون. لەم بارەیەوە ئەرسەلان دەیوت:" لەراستیدا پێم وانەبوو سەمیر بەکرێگیراو بێت، هاوکات پێشم وانەبوو ئەوەی ئەو دەیکات کارێکی باش بێت بۆ

پەکەکە"یان " ئەوەی من دەمبینی تەنها دیویك بوو، ئەویش ئەوەبوو کە ئەم ڕێکخراوە لەخەباتو ململانێدایە لەپێناو کوردو دەوڵەتی کوردیدا، پێشمان وابوو کەسێك دژ بەم ڕێکخراوە دەنگ بەرز بکاتەوە، بەهیچ جۆرێك خزمەتو خەمی خەباتی ڕزگاریخوازیی کوردی پێ نییە".

سەمیر پشتی بەستبووە هاوڕێکانی لەنێو چەپی تورکیدا تاوەکو سەلامەتی گیانی بپارێزن. بەلام هەڵسوڕاوانی پەکەکە بەشوێن ئەوەوەبوونو بەدوویدا دەگەڕان. ئێس کە هاوڕێیەکی چەپی سەمیربوو لە هامبورگ وتبووی :"ئەوان لەوەدەگەران شوێنێك بدۆزێتەوە بۆ مانەوەو پاشان هەڵبکوتنە سەری‌و لەنێوی بەرن". لەکۆتایی ١٩٨٤ دا بوو یاخۆ لەسەرتای ١٩٨٥ سەمیر داواکاریی پێشکەشکردو مافی پەنابەرێتی سیاسیی لەوڵاتی سوید وەرگرت. هەندێکی دیکە لە بەرهەڵستکارو نەیاری پەکەکە لەوێندەر دەژیان. مەسعود ئاکیۆڵ لەم بارەیەوە دەڵێ:" سەمیر لەسەرەتادا بڕیاری نەدا دەستوەربداتە کاری سیاسیی لەتەکیان، وەلێ هەولّی دا چەندین بلاّوکراوەو نوسراو بنوسێت تا برەو بە هزرو بۆچوونەکانی بدات بۆ پێشخستنی دیدی دیموکراسی لەنێو پەکەکەدا".

مەسعود سەرکردەی پێشوی دەڤ یۆل بوو، ئەوبوو سەمیری پەنادا پاش ئەوەی توانی لە دەستبەسەرییەکەی پەکەکە لە شاری کۆلن قوتاربێت. هەر بەگوێرەی گێرانەوەکانی مەسعود، سەمیر پاش ئەو قۆناغە بڕیاری دا بێتە ناو کایەی گشتییەوە، دیارە ئەمەیش ئەو ڕۆژەبوو کە واژۆی لەنێوبردنی بوو بە ئەمری واقیع. ناوبراو هەڵوێستەکانی سەمیر بەمجۆرە دەگێڕێتەوە:" لە ئێستادا ئێمە تەمەنمان هەڵکشاوەو شتەکان جیاوازتر دێنە پێشچاومان، وەلێ لەو کاتەداو لە تەمەنی سەمیرداو لەقۆناغێکی وەهادا، سەمیر هێند باوەڕی بەهزرە دیموکراسییەکەی هەبوو، ئامادەبوو لەپێناویدا ژیانی خۆی بخاتە مەترسییەوە".

له ئێوارەیەکی مانگی نۆڤەمبەری ١٩٨٥دا سەمیرو دووان له ئەندامانی پێشووی پەکەکە بەشداریانکرد له گردبوونەوەیەکی چالاکوانە کوردەکان له شاری ستۆکۆلمدا. ئیدی ئەمە هەوەڵ دەرکەوتنی سەمیر بوو له شوێنە گشتییەکاندا. هەر لەو ئێوارەیەدا یەکێك لەپشت سەمیرەوە بەچەند فیشەکێك کۆتایی بەژیانی هێناو هەڵهات. هاورێکانی سەمیر تێنەدەگەشتن بۆچی دەبێت پەکەکە سەمیر بکوژێت.

پەکەکە بۆ خۆیشی له بلاوکراوەیەکدا بکوژی سەمیری به قارەمانو نیشتمانپەروەر نێوبرد. ئۆجەلان سەبارەت بەم رووداوە گوتبووی:" ئەو بەکرێگیراوە لەلایەن گەلەکەمانەوە گەیەنرا به راستیو یەکسانی"[١٠٨]. لەم وتانەدا دیاربوو کە ئۆجەلان له بەرپرسایەتی شەخسی کوشتنەکە خۆی دەپەرێنێتەوە، وەلێ دوواتر بەئاشکرا درکاندی کە سانێك کە ئەندامی پەکەکە بوونو بەئاشکراو بێ پێچو پەنا دەبنە گرفتو تۆوی جیاوازی دەچێنن، پێویستە پێشبینی ئەوە بکەین کە بێدەنگ دەکرێن. ئۆجەلان لەشوێنێکی تردا وتبووی:" سەمیر له هەرشوێنێکدا بێت، دەکوژرێت"[١٠٩]. بەمجۆرە کوشتنی سەمیر بووە هەوەڵ ئاماژەی سەرکەوتنی ئۆجەلان بەسەر نەیارانی دەسەلاتدارییەتەکەیدا.

بەلام سەمیر یەکەم قوربانی نەبوو له جولانەوەکەی ئۆجەلاندا، سەرکەشییەکەی ئۆجەلان لەبەرامبەر نەیارانی خۆیو یەکێتی گروپەکەیدا قوربانیگەلێکی دیکەی لێکەوتەوە. تەنها لەماوەی سالانی نێوان ١٩٨٣ بۆ ١٩٨٥ ئۆجەلان فەرمانی دەرکردو هانی دا تا بەلایەنی کەمەوە ١١ ئەندامی بالای پێشوو و ئەوکاتی پەکەکە لەنێوبەرن، کە سەمیر تەنها یەکێك بوو لەو یازە ئەندامە. هەندێك لەو یازدە

[108] From the German-language translation of a November 1985 brochure issued by the PKK in Europe: "PKK-Vertretung in Europa," November 1985
[109] Birand, Apo ve PKK, 163.

سەرکردەی پەکەکە توانیان هەڵبێن و خۆیان بشارنەوە، وەلێ زۆرینەیان لە ئۆردوگای دۆڵی لۆلانی پەکەکە لەباکوری ئێراق یاخود لە ئورووپادا گوللەبارانکران[110].

بەمجۆرە نێزیکەی هەموو ئەوانەی کاریان لەتەك سەمیردا کردبوو لەنێو چالاکییە پەرەگرتووەکانی ئەورووپای گروپەکەدا، تەنانەت ئەوانەیش کە قسەیەکیان لەبەرژەوەندی سەمیردا نەکردبوو، تەنها پەیوەندییەك بەسبوو بۆ ئەوەی سەرکۆنەبکرێن. ئەوانی دیکەیش فرەبەسانایی ئەوە دەخوێنرایەوە لێیان کە بەئەندازەی پێویست ئەمەکدارنەبوون بۆ رێبەرایەتی ئۆجەلان. ئۆجەلانیش بۆخۆی قەد فەرمانی بەکوشتن نەدەکرد، وەلێ ژینگەیەکی رەخساندبوو کە تێیدا غەیانەکان پێویستبوو لەنێوببرێن.

یەکێك لە خەباتکارەکانی پەکەکە دەڵێ:" ئەو کەسەی پرسیاری لەسەر کوشتنی کەسێك بکردایە، ئەوا بەخائین ناو زەد دەکرا". ئۆج ئالان و ئیبراهیم ئایدن یەکەمجار لە ساڵی ١٩٧٢ دا لە نێو زینداندا ئاشنا بوون بە یەکتریی. ناوبراو لە مشتومڕەکانیدا لەتەك سەمیردا پاڵپشتی ئۆج ئالانی دەکرد. ئەوەیش پاش ئەوە هات کە لە وڵاتی ئاڵمان گەڕابوویەوەو لە سوریادا مژوڵی کارو باری پەکەکە بوو. لەکۆتایی ١٩٨٤ یشدا نێردرا بۆ کەمپی لۆلانی پەکەکە لە باکووری ئێراق. ئیبراهیم یەکلایکرابوویەوە بۆ خەباتی پەکەکەو رازیببوو بە هەموو فەرمانەکان بەبێ هیچ پرس و لام و جیمییەك. لەگەڵ ئەوەیشدا برایم بۆخۆی تێبینی ئەوەی کردبوو کەلەلایەن ئەوانی دیکەوە بە شێوەیەکی گوماناوییەوە مامەڵەی لەتەکدا دەکرێت. لە دەوروخولی مانگی ئازاری ١٩٨٥دا ئیبراهیم هەستی بە بوونی مشتومڕێککرد کە

---

[110] This figure is my own. Hatice Yasar, writing in the magazine Sterka Rizgari, No. 21, 2002 (Istanbul), 89fn12, names many of the same people; Birand, in his Apo ve PKK, 121, came up with a figure of 10, but did not specify names

لەبارەی ئەوەوە سازکرابوو، ئیتر تێگەیشت کە ژیانی لەمەترسیدایەو وەختە بە ناپاك نێو دەبرێتو پلانێك لە گۆڕێدایە بۆ لەنێوبردنی.

هەربۆیە بۆ ڕۆژی دووایی ئیبراهیم بە بیانووی گردکردنەوەی چیلکەو دار بۆ سوتاندن توانی خۆی قوتاربکاتو پەنا بەرێتە بەر هێزە کوردییەکانی ژێر سەرکردایەتی مەسعودبارزانی کە ئەوکات لەنێو سنوورەکانی ئێراندا ستاریانگرتبوو. دوواتر ئیبراهیم لە دیدارێکی تایبەتداو لەدرەنگانێکی شەودا وەختێك لە ئۆتاقێکی خواردنی پیتزادا بوو لە سوید، ئەوەی راگەیاند کە دووایین بڕیاری داوەو هەرگیز ناچێتەبەرەی دوژمنەکەیەوە لەتورکیاو نایهەوێت واز لە خۆی بهێنێتو لێناگەڕێت تابەدەستی پەکەکەیش بکوژرێت. ئیدی لەوێ لە تاراوگەدا بە گۆشەگیریی ژیانی دەگوزەران.

یەکێك لە خاتوونەکانی ناو پەکەکەیش لە ئەوروپا بەناوی نهێنی ئەڤین لەگەڵ سەمیردا مژوڵی کاری رێکخستن بوو، وەلێ لە مشتومڕو بگرەو بەردە سیاسیو هزرییەکاندا تەرەفداریی لە ئۆج ئالان دەکرد. لەراستیدا ئایدیایەکی ساکاربوو بۆ ئەوەی تەڤگەرەکە داماڵرێت لە هەر کەسێك کە بەهەر جۆرێك بەشداریکردبوو. ئەوە وتەی یەکێك لە خانمە خەباتکارەکانی پەکەکەبوو کە لەو دەمەدا لە لوبنان بەکارەکانی هەڵدەستا. سامیە ئاسکین پاش ئەوەی لەسەر خواستی ئۆجەلان لە ساڵی ١٩٨٣ دا لە ئەڵمانیاوە هاتە دیمەشق، ناوبراو لەتەواوی ناکۆکییە ناوخۆییەکاندا پاڵپشتی لەسەمیر دەکرد، هەربۆیە بەگورجی لەکۆڵکرایەوەو لەنێوبرا. سەرەتا ئۆجەلان فەمانی کردبوو بە سامیە ئاسکین تا بچێتە کەمپی لۆلان لە باکووری ئێراق. بەوتەی یەکێك لە خەباتکارەکان کە سامیەی لە کەمپی لۆلان دیبوو:" ئەو لە جۆرە ژنانە بوو کە مشتومڕیان دەکردو لەسەر بابەتەکان رادەوەستان". هەربۆیە لە روانینینی هەمواندا چارەنوسێکی مەترسیدار بۆ ئەو خانمە دەبینرا. دوواجار لە کۆتاییەکانی ١٩٨٤ یان نیوەی هەوەڵی ١٩٨٥ دابوو

لەلایەن پەکەکەوە لە سێدارە درا. هەروەها سوفی قەرەقوس کە ناوەنهێنییەکەی شۆڕش بوو دیسان یەکێك بوو لە هامکارەکانی سەمیر، ئەو لەسەر فەرمانی ئۆجەلان نێردرابوو بۆ شیوی لۆلان لەباکوری ئێراقو لە کۆتایی ١٩٨٤ یشدا هەر لەوێ لەنێوبرا. بەلایەنی کەمەوە سیان لە ئەندامانی پەکەکەیش کە لەتەك سەمیر لە ئەوروپا کاریان دەکرد پاش ئەوەی سەمیر لەنێوبرا، دوای ساڵێك هەموو ئەوانە لە ١٩٨٤ دا بەشێوازی جۆراو جۆر کوژران. ئەوانیش ئەنوەر عەتاو زوڵفو گوك و موراد بایرەکیلی بوون[111].

پور موراد کە یەکێك بوو لە خەباتکارەکانی پەکەکە دەڵێ:" لە راستیدا هۆیەك نەبوو بۆ کوشتنی سەمیر، وەڵێ کێ دەزانێت، رەنگە ئۆجەلان بەجۆرێك لە جۆرەکان هەرەشەیەکی بەدی کردبێت" ئەما سەبارەت بە عەتا هەرچەند کە لەلایەن برێك لە ئەندامانی پەکەکەوە وەك پاڵەوان تەماشا دەکرا، ناوبراو پەیوەندی کردبوو بەسەمیرەوە، هەربۆیە بەهەرەشەیەکی جددی دەبینرا یان بۆ سەر ئۆجەلان یاخۆ بۆ سەر تەڤگەری پەکەکە. ئەنوەرش هەرگیز قسەیەکی نەکردبوو. خانمێك کە لە جگەرە کێشانەکەیدا قوڵبوونەوەی لێدەبینرا، وەختی خۆی لەنێو تەڤگەری دەڤ یۆل دا بوو، ئەو ئەنوەری دەناسی. پرسی لە ئەنوەر بۆچی پەکەکە سەمیری کوشت، من نازانم. جۆك یش ئەستەم بوو بتوانیت ئاماژەیەك بدۆزیتەوە بۆ سەرپێچی لە نەزمی پەکەکە بوونیدا. بەم جۆرە ئۆجەلان کاری دەکرد بۆ لەناو بردنی هەرکەسو کارێك کە مایەی دروستکردنی پشێویو جوداخوازیو رەخنە بێت لەمیتۆدو پلانی پەکەکە دا.

بەخوێندنەوەی بچوکترین ئاماژەی ناکۆکیو سەرپێچی لەهەریەکێکدا راستەوخۆ لەنێو دەبرا. رەسوڵ داود ئەلسینۆکی کۆمیتەی ناوەندی پەکەکە لەلایەن

---

[111] The men arrested for the attacks on Ata and Gok had worked in the PKK's Serxwebun newspaper according to the Gruene/GAL report, "Politische Mord in Europa," 14.

پارتەکەیەوە لە ١٩٨٢ دەستبەسەرکرابوو، دواتر گوازرایەوە بۆ شیوی لۆلان لە باکووری ئێراق و لە کۆتایی ١٩٨٤یشدا لە سێدارە درا. ئەو کەسەی کە فەرمانی کوشتنەکەی پێگەیشتبوو بەمجۆرە روونکردنەوەی دا:" فەرمانی لەسێدارەدانەکە راستەوخۆ لە ئۆجەلانەوە دەرکرا". دەیگێڕایەوە کە ئۆجەلان رایگەیاندبوو:" هۆکەلێکی فرە لەبەردەستدا نییە بۆ ئەوەی لە ژیاندا بهێڵرێتەوە". جەمیلە قەیتان فرە خۆشبەخت بوو، ئەو نازناوە نهێنییەکەی بەسەحەر رۆیشتبوو. ئەویش لە ساڵی ١٩٨٣ دا وازی هێنا لە گروپەکەو بەشدار بوو لە ناجۆرییەکانی سەمیردا لەگەڵ پەکەکە، هەمیشە دەیپرسی کاروبارەکان چلۆن دەگوزەرێن. ناوبرا ئەو شەوەی سەمیر لە هۆڵەکەیدا کە بەکرێی گرتبوو کوژرا، لەگەڵ سەمیردا بوو. وەلێ ئەو توانی خۆی حەشاربداتو لە ئەوروپادا ژیانێکی نوێ بۆخۆی بەدەستبهێنێت. ئەندامێکی دیکەی کۆمیتەی ناوەندی پێشووی پەکەکە فرە بەسەختی توانی خۆی قوتاربکات. ئەویش لەساڵی ١٩٨٢ دا دەستبەسەرکرابوو، دوواتر نێردرا بۆ شیوی لۆلان. وەلێ بەهۆی بێ ئاگایی پاسەوانەکانییەوە توانی خۆی دەرباز بکات. دوواتریش پاسەوانەکەی توانی خۆی قوتاربکات.

ئیدی لە سوید کارێر توانی مافی پەنابەرییەتی بەدەستبهێنێتو پەیوەندیش بکات بە گروپەکەی سەمیرەوە بۆ شەرمەزارکردنی پراکتیکی پەکەکەو رێبەرەکەی. کاتێك سەمیر کوژرا، کارێریش دروست لە هەمان هۆڵدا بوو. کارێر بەماوەیەکی کەم پاش کوشتنی سەمیر لە لێدوانێکیدا بۆ رۆژنامەیەکی تورکی رایگەیاند:" هەست بە پەشیمانیی دەکەم کە لە رێکخراوێکی خوێناوی لەو جۆرەدا بەشداربوومە، هەموو ئەو ساڵانە وەك پەڵەیەکی رەش لە ژیانمدا دەمێننەوە".

هەروەها گوتی:" هەموو ئەو تاوانی کوشتنانە ئەوە دیاری دەکات کە لەداهاتووی چەند ساڵێکی کەمدا چ دەگوزەرێتو چی دێتە پێشەوە. بەمجۆرە پەکەکە لە جەنگەکەیدا بۆ خۆدامەزراندن لە نێوخۆی تورکیادا، بەردەوام بوو لە

پاکتاوی ڕەخنەگرو سەرپێچیکارانی ناوخۆی ڕێکخراوەکەی. لەلای ئۆجەلان پەرتبوونو ناکۆکی وەك مەترسیی بۆ سەر دەسەلاتو پارتەکەی لێکدەدرایەوە. زۆرێك لە ئەندامانی پەکەکەیش بەسانایی دەیانڕوانییە جوداخوازانو بە مەترسیان دەزانین بۆ سەر ڕەوشو ڕەونەقی گروپەکە. بیرکردنەوە لەنێو پەکەکەدا بەو جۆرە بوو کە ئەوەی پەکەکە ئەنجامی دەدا ئەرکێکی پیرۆزو بێ هەڵەو پەڵەیە. یەکێك لە ئەندامانی پێشووی پەکەکە رایدەگەیاند:" لە ژینگەیەکی وەهادا کەس نەیدەتوانی رەخنەو گازاندەکانی بکات، زۆرێك لەو تاوانی کوشتنانە کە ئەنجامدەدرا خودی ئۆجەلان بزوێنەری پشت ڕووداوەکان بوو، زۆرێك لە ئەندامانی پەکەکەیش ڕازی بوون بە هەر بڕیارو بەندێك کە لەلایەن ئۆجەلانەوە دەردەکراو ئەنجامدەدرا". هەروەها دەیگوت:" ئۆجەلان ڕێگەکەی دانابوو، ئەوانی دیکەیش لە ئێمە شوێنی کەوتبووین"[١١٢]. لە ڕاستیدا ئەم دیدگا توندو بێ باکەی پەکەکە لەبەرامبەر نەیارانو جوداخوازانی ناو گروپەکەی یاریدەی پەکەکەی دا تا لە لاوازییو ڕەوشی کارەساتئامێزی ڕێکخراوەکوردییەکانی دیکە ڕزگاریبێت کە بەهۆی پەرتەوازەییەوە ڕووبەڕووی ببوونەوە. لەهەمانکاتدا ئەم ڕەوشەی ناو پەکەکە بووە هۆیەك تا زێدەتر هێزی تاکڕەوی ئۆجەلان بەهێزبێت. ئیدی ئۆجەلانو سەردارانی دیکەی پەکەکە ڕاهاتن لەسەر ئەوەی کە بەسانایی هەموو ئەوانە لە کۆڵبکەنەوە کە گەرەکیانە دژبن لەگەڵ پرەنسیپە سەرەکییەکانی ئاپۆدا.

یاخود بەسانایی دەیانتوانی ئەوانە لەناو بەرن کە جێگەی باوەڕنین یا لەمەیدانەکانی جەنگدا کەڵکیان نییەو مایەی سەر ئێشەن بۆ گروپەکە. ئەندامگەلێکی پیشووی پەکەکە کە لەنێوەراستی هەشتاکاندا لە باکووری ئێراقدا جێگیرکرابوون. ئەوان دەڵێن نێزیکەی شەش یان هەشت و زیاد لەو ڕێژەیە لە ئەندامانی بە ئەزموونی پەکەکە لەوێندەر لەنێوان ساڵانی ١٩٨٤ بۆ ١٩٨٥

---

[112] Cumhuriyet newspaper, Nov. 12, 1985.

لەنێوبران‌و کەسیش نەیدەزانی چۆن‌و لەکوێ، تەنها لەبەر ئەوەی وەك هەڕەشەیەك دەبینران بۆ سەر پرەنسیپەکانی گروپەکە.

بۆنموونە یەکێك لەو خاتوونانەی کە لەژێر ئازارو ئەشکەنجەی زیندانەکانی تورکیادا باری دەروونی تێکچوبوو، پاش ئەوەی لە زیندان ئازاد کرابوو، جارێکی دیکە پەیوەندی کردبوویەوە بەریزەکانی پەکەکەوە. بەڵام نازانرێت ئایا بۆ ئەوەی کە وەك بەکرێگیراو سەیریان دەکرد یاخۆ نەیاندەزانی لەگەڵ بارە دەروونییە ناتەواوەکەیدا چی بکەن گوللە بارانیانکرد[١١٣].

بەمجۆرە تا بیستساڵی دوایی تەواوی ناوی کوژراوان‌و رووداوەکان کە لە نێوچە شاخاوییە دوورە دەستەکانی باکوری ئێراق قەومابوون بە نهێنی مابوونەوەو کرابوون بە ژێر گڵەوە، ئیتر لەترسا بووبێت یان بەهۆی دڵسۆزانی پەکەکەوە . هەندێك لە رەخنەگرانی پەکەکە پێیان وایە ئەو کوشتارە ناوخۆییەی پەکەکە مانای لاوازیی پەکەکە بووە، وەلێ راستییەکە پێچەوانەی ئەو بۆچوونانەیە، چونکە پەکەکە کاتێك ئەو فەرمانانەی دەرکرد کە هەوەڵ دەستپێکی خەباتی چەکداری بەسەرکەوتوویی دژ بەتورکیا لە مانگی هەشتی ١٩٨٤ راگەیاندبوو. یەکێك لە خەباتکارە چالاکەکانی پەکەکە دەیووت:" هەموو ئەوانە پاش راگەیاندنی چەنگ بوو".

## گەڕانەوە بۆ تورکیا

سەلاحەدین چیلیك پاش سازدانی دیدارێك لەتەك ئۆج ئالان لە کۆتایی ١٩٨٤ دا گەڕایەوە باکووری ئێراق‌و پلانی دانا تا لە دەستپێکی ساڵی نوێدا بخزێتە نێو

[113] In his letter dated August 16, 1984, Semir identifies her as Ayten Yildirim, a name I also was given

توركیاوە، وەلێ ئەم پلانە ئەگەرێکی دووربوو[١١٤]. ئەو زستانە ئێجگار سەخت بوو ، ئەستەم بوو بتوانرێت ئەو بەفرە ببڕیت کە چیا سنوورییەکانی داپۆشیبوو. چەندین لە ئەندامانی پەکەکە کە بەئەستەم لە خاڵە سنوورییەکانی تورکیاو ئێراق پەڕیبوونەوە لەلایەن ئێشکگرە سنووریەکانی تورکەوە درابوونە بەر دەستڕێژی گوللەو کوژرابوون.

چیلیکو ئەندامانی پێشکەوتووی دیکەی پەکەکە لە ئامادەکارییاندا بۆ قۆناغی داهاتووی نەبەردییەکەیان، ئەم زەوشەیان لەپێشچاو نەگرتبوو. دوواتر چیلیك لە ئەڵمانیاوەو بەتەلەفۆن پێی ڕاگەیاندم کە :" گروپێکمان ناردنە نێو تورکیا، وەلێ هەرزوو دەستگیرکران". هەروەها پێی ڕاگەیاندم :" لەنێوەندی زستانێکی پڕ کرێوەی تردا ، گروپو خەڵکی دیکەمان ناردن، ئەوانیش یان کوژران یاخۆ دەستگیرکران. هەروەها هەشت کەسی دیکە پاش ئەوەی نێردرانە نێوخۆی تورکیا لە پێکدادانێکدا کوژران.

سەربازانی تورك فرە بەباشی لە خاڵە سنوورییەکاندا جێگیرکرابوون". بۆیە جەنەراڵەکانی تورك سەریان لە هێرشە هەوەڵینەکانی پەکەکە سەر سوڕمابوو. ئەوان چەندین مانگیان لە بونیادنانی ستراتیژێکی تۆکمەدا بۆ پرسی پەکەکە بەهەدەردابوو. لەو دەمەدا پێنج دەورییەی تایبەت گوازرابوونەوە بۆ باشوری ڕۆژهەڵاتی تورکیاو ژمارەی پۆلیسی دێهاتەکان زیادکرابوون، ئەوان فەرمانیان پێکرابوو کاراتر بەشوێن ئامانجەکانیانەوە بنو یاخی بووان سەرکوتبکەن. لەگەڵ ئەوەشدا پایگا سەربازییەکان لەنێزیك دێهاتو گوندە شاخاوییەکاندا دامەزرابوونو بەرپرسە ئەمنییەکان بە ڕێژەیەکی زۆر بڵاوەیانپێکرابوو.

---

[114] . This section utilizes especially the firsthand experiences in the region of Baran, Celik, and former PKK militant S. The main published sources were Birand, Apo ve PKK, 134–143, and Imset, the PKK, 41–44, 107

بەتایبەتی لەو شوێنانەدا کە پەکەکە ئاتاجی بەخواردن و زانیاریی و هێزی مرۆیی هەبوو بۆ پشتیوانیکردنیان"[115]. جەنەراڵ موستەفا نەجدەت کە لێپرسراوی هێزە وشکانییەکان و سەرکردەیەکی دیاری ئەرتەشی تورك بوو لە لێدوانێکیدا بۆ رۆژنامەنووس موحەمەد عەلی بیراند وتبووی:"لە ساڵی ١٩٨٥ بۆ هەوەڵجار لە هەرێمەکەدا خۆمان دامەزراندو دەستبەکاربووین و سەربازەکانمان لە هەرێمەکەدا گردکردبوویەوەو فرە بە وریاییەوە شەن و کەوی نێوچەکەمان دەکرد". هەروەها وتبووی:" نێزیکەی ٢٠٠ لە یاخیبووانی کورد لە نێو تورکیادا هەبوون، فرە کتوپڕ تێبینی گۆڕانێکمان دەکرد لە ناوچەکەدا. یەکە چەکدارییەکانی پەکەکە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە کە لە ژێر چاودێری سەربازانی تورك بوو بەنهێنی هاموشۆیان دەکرد".

لە راستیدا چەکدارەکان بە رۆژدا دادەبارینە شوێنە ئامانجارەکان و بەشەویشدا پاشەکشەیان دەکرد. زۆرجار سەربازانی تورك بۆ ماوەی رۆژێك دەمانەوەو دەجەنگان. زۆرجاریش سەرچاوەکانی ئاوو خواردنیان لە پەکەکە دەگرتەوەو پشتیان دەبەست بەرەوانەکردنی سەربازگەلی زیاتر بۆ نێوچەکانی جەنگ. باران لەم بارەوە وتی:" بەمجۆرە هەموو کاتێك سەربازەکان زیانگەلێکی فرەیان رووبەرووبوویەوە". هەروەها دەیگووت:" ئێمە توانامان سنوردار بوو بۆ ئەوەی بچینە نێو ئاوایییەکانەوە. ئێمە ئاسان نەبوو بۆمان و نەماندەتوانی پروپاگەندە بکەین بۆخۆمان، چون هەرکارێکمان لە ئاواییەکاندا زیانی دەگەیاند بەپەیوەندییەکانمان لەتەك خەڵکداو میریی رووبەرووی ئاواییەکان دەبوویەوە.

هاوکات بڕی خواردن و خۆراك فرە لەبەردەست نەبوو بۆمان، زۆرجار تەنها بایی دوو رۆژ خواردنمان هەبوو، لەسەرەی سێهەم رۆژدا شتێکمان شك نەدەبرد بۆ خواردن". بەهاتنی نیمەی ساڵ خەباتکارانی پەکەکە رووبەرووی مەترسییەکی نوێ

[115] Birand, Apo ve PKK, 136.

بوونەوە. لەوکاتەدا ئاوایيە کووردییەکان چەکداردەکران و پولّو پارەیان پێدەدرا بۆ ئەوەی جەنگی گەریلاکانیان پێبکەن. لەراستیدا دەوڵەتی تورك لەدەستپێکی دامەزراندنی کۆماردا میلیشیا کوردییەکانی چەکدارکردبوو تا سنووورە نوێیەکانی کۆمار بپارێزن. وەلێ لەشەستەکاندا وادانرا ئەم یاسایە نادێموکرات و نەسازە، هەربۆیە پوچەڵکرایەوەو ئیدی کاری پێنەکرا. دووا بەدووای هێرشەکەی پەکەکە لە مانگی هەشتی ١٩٨٤ دا ، ئیدی ئەم جۆرە پەلامارو هێرشانە دووبارەو چەند بارە کرانەوە.

دووا بەدووای ئەوە سەرۆکی تورکی تیشکی خستە سەر ئەوەی کە هەمو ئەو ناوچە نیشتەنییە دوورانەی ولآت کە بەدەست هەژاری و خراپی رێگەوبان و کارەباوە دەنالێنن، ئیدی هۆیەك نییە بۆ ئەوەی بتوانیین ئاسایش و ئارامییان بپارێزین. لەو شوێنانەدا پاسەوانی دێهاتەکان مانگانە موچەیەیان لەمیریی وەردەگرت کە نێزیکەی ٣٥ هەزار لیرەی تورکی دەبوو کە دەیکردە ٧٠ دۆلاری ئەمەریکی. ئەوەیش بڕێکی بەس بوو بۆ ئەوەی بتوانن بژێوی خۆیان و خێزانیان دابین بکەن، هەربۆیە لە کۆتایی ١٩٨٥دا نێزیکەی ١٢ هەزار پیاو بەنێوی پاسەوانی ئاواییەکان نێویان تۆمارکرا.

ئەمانە تەنها هەرەشەیەکی نوێ نەبوون بۆ سەر پەکەکە، بەڵکو هۆیەك بوو تا یاخی بووەکان دووچاری نائارامی و دڵەڕاوکێ بکات. ئەندامێکی پێشووی پەکەکە کە لە ساڵی ١٩٨٤ وە لە نێوچەی هەکاری دەستی دابوویە چەك، بەناوی خوازراوی ئێس. دەیوت:" من ناتوانم دژ بە پاسەوانانی دێهاتەکان بجەنگم، ئاخر ئەوانیش کوردن، هەر بۆیە توشی ئیفلیج بوونێك هاتبووم بەرامبەریان". هێشتا ساڵێك بەسەر خەباتی چەکداری پەکەکەدا تێنەپەڕی بوو، وادیاربوو دەوڵەت لەو سیاسەتەیدا قازانجی فرەی کردبوو. هەروەها بەهۆی دەرکردنی یاسای لێخۆشبوونەوە هەندێك لە شۆڕشگێران وازیان هێنا لە شۆڕش و بوونە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ زانیاریی

لەسەر گروپەکە لەلایەن میرییەوە. چیلیك وتی:" شتەکان بەکامی ئێمە هەڵنەدەسوڕانو هەر هەواڵێك کە لەتورکیاوە بەدەستم دەگەیشت، هەواڵێکی پۆزەتیڤ نەدەبوونو خەڵکی خەریکبوون خیانەتیان لێدەکردین، خەڵکەکەمان وازیان لەخەبات دەهێناو لەسەر شاشەی تیڤییەکاندا دەردەکەوتنو باسیان لەو تاوانو کوشتنانەدەکرد کە لەنێو گروپەکەدا تێوە گلابوون".

بەوتەی چیلیك تەنها لە رووبەڕووبوونەوەیەکدا لەتەك ئەرتەشی تورك نێزیکەی ٩٠ گەریلا کوژرابوون. تا ئەوکاتیش ژمارەی ئەوانەی کە پێوەندیان بە پەکەکەوە دەکرد رووله زیاد بوون بوون. چونکە بەوتەی کادیرێکی پێشووی پەکەکە لە هەر کاتێکدا جەنگێك روویبدایەوە لە هەرشوێنێك فیشەکێك بتەقایە، ئەوا دەبووە هۆی ئەوەی ژمارەیەکی نوێ بێنە نێو ریزەکانی پەکەکەوە"[116].

هەروەها باران دەیگوت: "هاوکات رۆحی بەرگریو بەردەوامی لەناو شۆڕشواناندا هەبوو، ئەگەریش لە شوێنێکی دیاریکراودا جەنگەکەیان بدۆڕاندایە، هەر بەردەوام دەبوون. میریی نەیدەتوانی ئێمە وەدەرنێت، خەڵکی ئەوەیان بەچاوی خۆیان دەدی، هەر بۆیە ئەوە کاردانەوەیەکی باشی لەناو خەڵکدا هەبوو بۆ ئێمە، هەربۆیە دەوڵەت نەیتوانی بەردەوام بێتو سەرکەوتوو بێت، چونکە ئێمە لەهەموو ئەو ناوچانەدا کە لێی بووین توانیمان خۆمان رابگرین".

## هاوڕێکانی پەکەکە

هەمیشە ئەوە ئەزموونکراوە کە هەریەك لە ئێران، ئێراق، تورکیاو سوریا توانیویانە گروپە کوردییەکانی یەکتر بەکاربهێنن وەك کرێگرتەیەك دژ بە گروپەکوردییە نەیارەکانی خۆیان. گروپە کوردیی تورکیا لەو دەمەدا فرە بەبەهێزی دەرکەوتبوون. هەوەڵجار سوریا توانی ئەم هەلە بقۆزێتەوەو بۆ قازانجی خۆی

[116] Birand, Apo ve PKK, 138

بەکاریانبهێنێت. ئێراق شکستی هێنا لەبەکارهێنانی کوردی تورکیەو ئێرانیش لە کۆتایی هەشتاکاندا توانی برەو بەپەیوەندییەکانی بدات لەگەڵ کوردی تورکییەدا.

هەمیشە سووریا نێزیکترین پێوەندیی لەگەڵ پەکەکەدا هەبووە، لە دەوروبەری ١٩٨٥ پێوەندی هەردوولا برەوی زێدەتری پێدرا[117]. پەکەکە شانبەشانی گروپە فەلەستینییەکانی دیکە لە شیوی بیقاع توانی شوێنی خۆی بکاتەوەو گەریلاکانی فێری مەشقی سەربازی بکات. سوریا پشتی دەبەست بە دەزگا هەواڵگیرییەکانی بۆ چێکردنی پەیوەندی لەگەڵ گروپە بیانییەکاندا.

هاوکات جەمیل ئەسەدی برا بچووکی حافز ئەسەد بەتایبەتی بایەخی دەدا بە پەکەکەو سەردانی کەمپی حیلوەی دەکرد. جگە لە کورسی ئەنجومەنی گەل جەمیل ئەسەد دارای پۆستێکی دیکە نەبوو لە دەوڵەتدا. وەڵێ لە بنچینەدا کۆنترۆڵی تەواوی بەندەری لازقییەی لە دەستدا بوو. هاوکات پەکەکەیش لەو باوەڕەدا بوون کە ئەو بەرپرسی ڕێکخستنە عەرەبییەکانی نێو هەرێمی هاتای تورکیی بوو. ئەو پارێزگا پێشووەی سوریا کە تاوەکو ئێستایش سوریا بانگەشەی گەڕانەوەی دەکات.

سوریا بە چێکردنی پێوەندی لەگەڵ پەکەکەدا دەیخواست فشارێکی زێدەتر لە سەر تورکیا دروستبکات لەبەرامبەر ئەو کێشمەکێشە بێ پایانەی کە لە پێوەندییە ئاڵۆزەکانی نێوانیاندا دەگوزەرا.

لە ساڵی ١٩٨٧ ئەوە دەخوێنرایەوە کەسورییە هەر بەردەوامە لە نیازی پەیوەندییەکانیدا. سەرۆك وەزیرانی تورکییە تورکوت ئۆزاڵ لەسەردانێکی

[117] Sources for this section included Syrian Kurds, Ely Carmon, an Israeli expert on Syria and the PKK, and former PKK members active in the Bekaa. Some details relied on Makovsky, "Defusing the Turkish-Syrian Crisis"; Seale, Asad, 427; and David Barchard, "Ozal Signs Security Agreement with Syria," Financial Times, July 18, 1987.

دەگمەنیدا بۆ دیمەشق کاریکرد تا فشاری زێدەتر دروستبکات بۆدەستدانە پرۆتۆکۆڵی هاوکاری نێوانیان.

هەرچەند کە سوریا بەفەرمی پێی لێنەدەنا کە ئۆجەلان لە سوریا بێت. بەڵام هەردوو لا رێککەوتن کە چیدی هیچ هێرشێك لەسوریاوە نەکرێتە سەر قەڵەمڕەوی تورکیاو هاوکات زانیاریی هەواڵگیریی‌و ئاسایشی لەنێوان یەکدیدا ئاڵوگۆڕبکەن . لەبەرامبەردا ئۆزاڵ هەوڵ دا کە چارەسەری ئەو تەنگژەیە بکەن کە لەمەڕ پرۆژەی زنجیرە بەنداوەکانی سەر رووباری دیجلەو فورات هاتوونەتە گۆڕێ.

هاوکات بەڵێنی دا هیچ کەلێنێك لە بڕی ئاوی رۆیشتوو بۆ سوریا لە ئایندەدا دروست نەبێت. بەمجۆرە سوریا توانی پەکەکە وەك چەکێکی ستراتیژیی بەکاربهێنێت لەپێناو بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیدا بۆ فشار خستنە سەر سوریا. بەمجۆرە لەسەر بنەمای پرۆتۆکۆڵە نوێیەکە سوریا هۆشداری دایە پەکەکە تا لە خاکەکەیەوە سنورەکانی تورکیا نەبەزێنن. وەلێ ڕوون نەبوو ئەو پرۆتۆکۆڵە نوێیە تاچەند کاریگەریی دەبێت لەسەر فشار خستنە سەر پەکەکە.

لەو قۆناغەدا پەکەکە پلانێکی دیکەیان گرتە بەر بۆ ئەوەی رووبکەنە تاران یاخود لە سنوورەکانی نێوان ئێراق‌و تورکیادا جێگیربن. هاوکات سوریا ئیدی کاری نەکرد بۆ راهێنانی گروپە چەکدارییەکانی پەکەکەو رێکخستن‌و گردکردنەوەیان‌و هیچ بەدەمەوەچونێکیشی بەرجەستەنەکرد لە چالاکییەکانی ئۆجەلاندا.

لە هەوەڵدیداریی رۆژنامەنوسێکی تورك بەناوی موحەمەد عەلی بیراند لەگەڵ ئۆجەلاندا ئەم پرسیارەکرا:" ئەگەر سوریا بیویستایە یاخۆ بیتوانایە ئێوەی دەوەستاند؟"، ئۆجەلانیش لەوەڵامدا وتی بەڵێ بەدڵنیاییەوە، خۆ ئەوان بە فەرمانێکی دیاریکراو ئێمەیان لە سوریا وەستاند"[١١٨].

---

[118] Birand, Apo ve PKK, 177

سوریا هەمیشە هۆشی لەلای کەمینە کوردییەکەی خۆی بوو، بەردەوام ئەوەی دەخستە ڕوو کە پەکەکە ناتوانێت لەجیاتی کوردانی سورییە بێتە گۆو بیانوروژێنێت. هاوکات دیمەشق کاریکرد تا پەکەکە لەنێوکوردانی سورییەدا هێزی مرۆیی خۆی تۆکمە بکاتو ئەندامگەلی تر بهێنێتە نێو ریزەکانییەوە. سورییە ئەم هەوڵەی بە ئومێدی ئەوە بوو تا ئاڕاستەی کوردەکانی لە جەنگو جیدالی ناوخۆی سوریاوە بگوازێتەوە بۆ دژایەتی تورکیا. لە راستیدا پەکەکە پێشتر لەنێو کوردانی سورییەدا ناوو شۆرەتیان فرە بوو. لەسالآنی هەوەڵدا ئۆجەلان وتارەکانی ئاراستەی کوردی سوریا دەکردو گەریلاکانیش پێرەکانیان بەنێو ئاواییەکانی کوردی سورییەدا دەگەڕانو پروپاگەندەیان بۆ کوردایەتیو خۆیاندەکردو یارمەتیو پوڵو پارەیان گرد دەکردەوە.

کوردانی سوریەش گەرموگوڕبوون لەگەڵ پەکەکەدا، بەتایبەتی قوتابیانی زانکۆکان زۆر پەرۆشی ئەو دروشمانەبوون کە پەکەکە تێیاندا ئامازەو ئامانجی دەوڵەتی کوردیی دەدا بەدەستەوە، تەنانەت گەر باسیشیان لە دەوڵەتی کوردو تورك پێکەوە بکردایە.

پارتە کوردییەکانی سوریا تەنها نوزەیەکیان تێدامابوو، ئەوان بندەستو گیرۆدەی ململانێی ناوخۆییو فشاری میریی بوون. ئەوان لەم رەوشەدا دارای چانسێکی ئێجگار کەم بوون تا پێکەوە بەرنامەیەك دابنێنو بکەونە خۆیان. لەکاتێکدا پەکەکە بە راستی لە جەنگو جیدالدا بوو دژ بەنەیارەکانی.

عاکیف حەسەن کە موویەکی رەشو نەرمی هەبوو، بە ئینگلیزییەکی رێكو رەوانیش دەدووا وتی:" خەڵکی لە گروپە کوردییەکانی سورییە پڕ ببوون، ئەوان تا ئەوکات هیچیان بۆ کورد نەکردبوو، ئەوەی هەیانبوو تەنها قسەو قسەلۆك بوو". پەکەکە لە گروپە کوردییەکانی سوریە فرە جیاواز بوو، وادەردەکەوت پەکەکە هێزێکی زیاد هزریو دیسپلینو سۆشیالیستی بێت. پەکەکە لە هیوای کوردانی

سوریادا وەك تیشكی خۆر وابوو، هیچ كام لەوان دژو نەیاری پارتێكی كوردی توركیا نەبوون‌و پشتیوانیان دەكرد. كوردانی سوریا دارای هاموشۆو خزمایەتی بوون لەگەڵ دیووی توركیاو قاچاخچییەتی‌و بازرگانی لەنێوانیاندا هەبوو. هەروەها هیچ رێگرییەكیشیان لە چێبوونی لینكێكی سیاسی نەبوو لەنێوانیاندا.

كامەران حاجۆ كە چالاكوانێكی كوردی سوریە بوو، ئەو لە هەوەڵەوە هۆگری پەكەكە ببوو ، لە دیدارەكەیدا گوتی:" كوردستانی توركیا وەك بەرینترین بەشی كوردستان هەمیشە لە هۆش‌و هیوامانداا زیندوو بووە". هەروەها گوتی:" ئێمە لە غایەلەی ئەوەدا بووین كە پێویستبوو پشگیری كوردستانی توركیا بكەین، چونكە لە كوردستانی ئێراقدا شكسمان هێنا لەوەی كە ببینە دەوڵەت". لەگەڵ ئەوەیشدا بەرنامەی پەكەكە وێنای هەر چوارپارچەی كوردستانی دەكردو ئامانجی یەكبوون‌و یەكێتی نێوانیان بوو.

لەبەرنامەی پەكەكەدا سەرەتا پێویستبوو كوردستانی توركیا ئازادبكرێت پاشان دەیانپەرژایە سەر پارچەكانی دیكە. هەروەها حەسەن دەیگووت:" ئێمەی قوتابی ئەو هەستەمان لەلاگەلاڵە ببوو كە شتێك خەریكە روودەدات". كاتێك حەسەن پێوەندی كرد بە پەكەكەوە لە ساڵی ١٩٨٥دا تەنها چەند كوردێكی كەمی سوریی لە نێو ریزەكانی پەكەكە دا بوون. وەڵێ لەو ساڵەدا ژمارەیان گەیشتە ٤٥ گەریلاو بۆ ساڵی ئایندە ئەم ژمارەیە سێ جار زیادی كردوو بوونە ١٣٠ . ئەو ژمارەیە تەنها ئەوانە بوون كە لە ریزەكانی پەكەكە لە حیلوە مژوڵی راهێنانی سەربازی بوون، گەر نا بە درێژایی سنووری سوریەو توركیە كوردی سوریە هەبوون‌و یاریدەو دەستگرۆییان لە بواری خۆراك‌و پوڵ‌و پەناگادا كردووە بۆ گەریلاكانی پەكەكە.

## دۆستە عێراقییەکانی پەکەکە

هەریەك لە ئێراقو سورییە بێ ئاگا نەبوون لەپەکەکە، بەردەوام دەزگای هەواڵگریی ئێراق سەوداسەری چێکردنی پێوەندیی بوون لەگەڵ کوردانی باخی بووی تورکیا. لەو دەمەدا بەغدا نەیدەویست پەکەکە دژ بەتورکیا بەکاربهێنێت. چونکە لەو دەمەدا ئێراق برێك لەنەوتی خاوی خۆی لە ڕێی بۆرییە نەوتییەکاندا بەنێو تورکیادا دەناردە دەرێ. لەبری وی ئێراق دەیهەویست پەکەکە سازبدات بۆ جەنگ لە دژی پێشمەرگەکانی مەسعود بارزانی کەنەیاری ولاتەکەی بوون. ئەودەم ئێراق لە ساڵی ۱۹۸۰وە لە جەنگێکی دژواردا بوو لەگەڵ کۆماری ئیسلامی ئێران. هەرچەند کە ئەمەریکا ئێراقی لەوە دڵنیاکردبوویەوە کە ئێران ناتوانێت جەنگەکە بەرێتەوە، وەلێ سەدام حسێنی سەرۆکی ئێراق لەبەرامبەر رەوشی کوردانی باکووری ولاتەکەی هەر نیگەرانو دڵ خوتخوتەی بوو.

نیگەرانی گەورەی سەدام بریتی بوو لە مەسعود بارزانی. بارزانی لەلایەن ئێرانەوە توانی بووی دەستی بگات بەچەكو چۆڵو پشتیوانی مادی لێدەکرا. هەر بۆیە زۆرجار شانبەشانی هێزە ئێرانییەکان دژ بە ئەرتەشی ئێراقی دەجەنگان. هێزەکانی پەکەکە کەوتبوونە نێوچەیەك کە لەژێر قەڵەمرەوی هێزی پێشمەرگەی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێراقدا بوون. هەر بۆیە چەند جارێکیش تێکگیران لەنێوان پەکەکەو پارتیدا روویدابوو. لە راستیدا دوو هۆکار هەبوون کە ئەگەری بایەخدانی بەغدای بۆ پەکەکە هێنابوویە گۆڕێ[۱۱۹].

سەلمان ئەرسەلان ئەندامی پەکەکە ساڵی ۱۹۸۵ لە ئەورووپاوە گەڕابوویەوە دیمەشق. ناوبراو لەوێشەوە روویکردبوویە باکووری ئێراق، وەلێ لە دەورووبەری ۱۹۸٦ لەلایەن سەربازانی ئێراقییەوە لەسەر سنووری نێوان تورکیاو ئێراق قۆڵبەستکرابوو.

---

[119] Information on Iraq and Iraqi Kurds relies mainly on McDowall, Modern History, 347–352.

پاش لێپرسینەوەیەکی سەرەتایی ئەرسەلان بە قۆڵبەستکراویی گوێزرابوویەوە بۆ باشووری بەغداد. ناوبراو بەچاوی بەستراو ڕەوانەی ئەوێ کرابوو، ئەو شوێنەی ئەوی تێدابوو، نێوەندی زیندانێکی سەربازی بوو، ڕەنگە بەشێك بووبێت لە زیندانی بەد ناوی ئەبوو غرێب.

لەراستیدا زیندانییەکانی ئێراق بەهۆکاری سیاسیی دەئاخرانە کونجی بەندیخانە. ئیدی هەڵهاتن‌و ڕزگاربوون لەو زیندانەدا ئەستەم بوو، وەلێ ئەرسەلان شەنسی هێنابووی بۆ ئەوەی بەزیندووی بمێنێتەوە، یاخۆ وادیار بوو دەزگای هەواڵگریی ڕژێم دەیهەویست لەڕێی ئەم مەردەوە پێوەندی لەگەڵ پەکەکەدا چێبکات. ئەوان ئیدی دەیانتوانی لە ڕێی ئەمەوە پێوەندی ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئۆجەلان دروستبکەن‌و بەمەیش جارێکی دیکە هەلی ژیان بۆ ئەرسەلان دەگەڕایەوە.

ئەرسەلان کە ئێستەکانی لە ئەڵمانیا دەژی دەیگوت:" دەمتوانی گوێم لە هاوارو ناڵەی ئەوانی دی بێت، دیاربوو ئەوان لەژێر ئەشکەنجەدا بوون". هەروەها دەیگوت:" شەوێك کەسێکیان هێنایە خانەکەی منەوە، ئەو خەڵکی سوریا بوو، پێی وتم ئێرە شوێنێکی زۆر ناخۆشە، لەپێشدا دانم نەدەنا بەوەدا کە لەگەڵ پەکەکەدا بووم، جارێك تا دوجار لێیاندام‌و تەزووی کارەبایان خستە سەرم، وەلێ ئەوانی دیکە هیچیان لێنەدەکردن". پاش چەند هەفتەیەکی کەم ئەرسەلان بەچڕو پڕی پرسیاری لەبارەی پەکەکەوە لێ کرا. بەگوێرەی بۆچوونی ئەرسەلان، ئەوان نەیانویستووە پەکەکە دژ بە تورکیا بجوڵێنەوە. هاوکات داواشیان نەکردووە ئایا پەکەکە لەگەڵ گروپەکەی تاڵەبانی دەجەنگێ یان نا؟ وەلێ ئەوان بەتێرو تەسەلی لەمەڕ پەیوەندییەکانی پەکەکەو پارتەکەی مەسعود بارزانی کۆڵینەوەیانکردووە. ئەرسەلان دەڵێ:" ئەوان دەیانەویست بزانن ئایا پەکەکە نیازی هەیە لەگەڵ پارتیدا بجەنگێت، بەڵام پێم وتن وابیرناکەمەوە نیازێکی لەم جۆرە لە ئەجێندای پەکەکەدا هەبێت، وەلێ ئەگەر بخوازرێت پێم وانییە پەکەکە خۆی لە شەڕکردن لەگەڵ پارتیدا لابدات".

هەروەها بەگوێرەی گێڕانەوەکەی ئەرسەلان ، ئێراقییەکان وتوویانە گەر چەکو چۆڵ بۆ پەکەکە دابین بکەین، ئایا ئەوان پەسەندی دەکەن یان نا؟ ئایا دوواتر داوابکەین لەگەڵ پارتیدا دەجەگن یان نا؟ . ئەرسەلان لەوەڵامی ئەو پرسیارانەدا وتی:" گەر پەکەکە چانسی پێبدرێت، بەڵێ دەخوازێت لەگەڵ بەغدادا پێوەندی درووستبکات". پاش تێپەڕبوونی چەند مانگ ئەرسەلان فشاری دەروونی تینی بۆ هانی بوو، ئیدی داوای لە کاربەدەستانی زیندان کرد ئازادبکرێت. بەرپرسانی زیندان نەیاندەزانی چی لە ئەرسەلان بکەن، نەشیان دەویست رادەستی تورکیای بکەنەوە.

ئەرسەلان پێی وابوو هۆی مانەوەی ئەو لە زینداندا ئەوە بوو ، لەلایەکەوە گەرەکیان بوو پەیامی دەزگا هەواڵگرییەکان بە ئۆجەلان بگەیەنێت، لەلایەکی تریشەوە دڵنیا نەبوون کە ئایا ئەو کارەدەکات یان نا؟ پاش تێپەڕبوونی نۆ مانگ بەسەر دەستگیرکردنی ئەرسەلاندا، وادیاربوو دەزگای هەواڵگریی ئێراقی وازی لەو بۆچوونە هێنابوو، هەربۆیە پاسپۆرتێکی ساختەیان دایە ئەرسەلانو سواری فرۆکەیانکرد بەرەو بەلەگراد. ناوبراو دیپلۆماتێکی ئێراقی لەگەڵیدا بوو. پاش ئەوەی خاڵی پشکنینو کۆنترۆڵ تەواو بوو دیپلۆماتە ئێراقییەکە پاسپۆرتەکەی لە ئەرسەلان وەرگرتەوە. ئیدی ئەو بەبێ پوڵو پارەو بەبێ هیچ شوناسنامەیەك لە بەلەگراد بەرەڵاکرا، هەربۆیە بەزوویی لەلایەن دەسەڵاتدارانی یوگسلافیاوە ئەرسەلان دەستگیرکرایەوە. بەڵام جارێکی تر ئەرسەلان ئازاد کراو دیسان پێوەندی کردەوە بە پەکەکەوە.

ئێراق لەو دەمەدا دەستی دابوویە هێرشو تەمبێ کردنی هێزە دیموکراتو نەیارە کوردییەکانو لەوپێناوەشدا ئاتاجی بە هیچ هێزێکی دەرەکی نەبوو. پەکەکە گومانی لە دیارنەمانی ئەو ماوە درێژە هەبوو کە ئەرسەلانی تێکەوتبوو، دووابەدووای لێپێچینەوە لێی، گومان دەکرا بەکرێگیراوی یەکێك لە تورکیا یان ئەڵمان یاخود پارتەکەی بارزانی بێت. بۆیە تاکۆتایی هەشتاکان ئەو بۆی نەبوو هیچ نامەو پەیامێك هەڵبگرێت. پاش ئەوەی هێزە ئێراقییەکان دەستیانگرتەوە بەسەر بەشێك لەخاڵەسنووریەکاندا لەگەڵ تورکیا، ئیدی پێوەندی راستەوخۆیان لەگەڵ پەکەکە دا

چێکرد. هاریکارییەکان قەتیس مابوو لە چوارچێوەی بەرپرسە سەربازییە نێوچەییەکاندا. بەرپرسە سەربازییەکانی ئێراق چاوپۆشیان دەکرد گەریلاکان لەبەرامبەر ئاڵوگۆڕی زانیاریی لەسەر پارتەکەی بارزانی[120].

ئەزمان کادیری پێشووی پەکەکە کە لەکۆتایی هەشتاکاندا لەناوچەکەدا مژوڵی چالاکی بوو، دەیوت:" بەگشتی رژێمی بەغدادا چاوی لە ئاستماندا داخستبوو، یارمەتییەك لەگۆڕێدا نەبوو، لەبەر ئەوە نەبوو کە پەکەکە یارمەتی نەدەویست، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە سەدام یارمەتی نەدەداین". لەراستیدا جۆرێك لە پەیوەندی نافەرمی تا جەنگی کەنداوی ١٩٩١ هەبوو، وەڵێ پاش ئەوەی هێزەکانی ئێراق پاشەکشەیان لە باکووری ئێراق پێکرا، ئیدی بەشێوەیەکی دراماتیکی هاوسەنگی هێزەکان گۆڕانکاری بەسەردا هات.

## کوردانی ئێراق

جارێکیان مەسعود بارزانی بە میوانێکی کوردی تورکییەی وتبوو، کە ئۆجەلان کوردی تورکییە رزگار دەکات. وەڵێ پاش دەستپێکردنی شەڕە گەریلاییەکەی پەکەکە، روانینێکی جوداتر بۆ مەسعود بارزانی دروستبوو[121]. ئەنکەرە ئاگاداری جێگیربوونی کەمپی سەربازیی پەکەکە بوو لە سنوورەکانی نێوان تورکیاو ئێراق.

---

[120] . They also were reported to be providing information on Turkish troops movement: See McDowall, Modern History, 426.

[121] . This section utilizes interviews with former PKK militants active in Iraq and the Bekaa during this period; and also non-PKK sources familiar with events at the time, including Mesut Akyol and Paris-based Kurdish Insti- tute chairman Kendal Nezan. Published sources: Celik, Agri, 119–120; Dagli, Birakuji, 29–47; McDowall, Modern History, 347, 350–351; and Chubin and Tripp, Iran and Iraq, 142. Barzani's comment on the PKK, probably half in jest, was made in 1982 to Nejdet Buldan, who had crossed into Iran to avoid an un- related jail sentence in Turkey.

هەربۆیە بارزانی قایلکرد تا چەکدارەکانی پەکەکە لەژێر کۆنترۆڵی خۆیدا بکاتە دەرێ.

ئەوەی بارزانی نیگەران کردبوو، ئەوە بوو کە هێزو هێرشی تورکو تۆڵەسەندنەوەی تورك لە ساڵی ١٩٨٣ دا ئەگەری ئەوەی هەبوو لەبری خاپوورکردنی بنکەو بارەگاکانی پەکەکە، پێگەو پایگاکانی وان لەتەك خۆیدا راماڵێت. هەربۆیە ئیدریس بارزانی برای مەسعود بارزانی داوای کرد لە سەرانی پەکەکە کە پێویستە بنکەو بارەگاکانیان راگوێزن‌و لە نێزیك سنوورەکانیاندا هێرش‌و هەڵمەتەکانیان بۆ سەر تورکیا ئەنجام نەدەن. سەلاحەدین چیلیك کە ساڵی ١٩٨٤ لە کۆبوونەوەیەکی بارەگای پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە دۆڵی ڕاژان ئامادەبوو رایگەیاند:" ئیدریس بارزانی ئاشکرای کرد، کە ئەوان لەلایەن تورکیاوە قەناعەتیان پێکراوە". بەڵام پەکەکە خواستەکەی بارزانیان دایە دوواوەو رایانگەیاند کە ئەوان ئاتاجیان بە سنوورەکانە تا لەوێوە تێپەڕنە نێو سنووەرەکانی تورکیا. وەلێ هێدی هێدی گۆڕانەکانیان لە دەرفەتی هێرشەکانیاندا کەمکردەوە، نەکا تورکیا تۆڵە لە ئاواییەکانی سنوورو پێشمەرگەکانی کوردستانی ئێراق بکاتەوە. گۆڕانکارییە هونەری‌و رووکەشییەکانی پەکەکە بۆ تورکیا جێگەی بایەخ‌و گرنگی نەبوون. لە ئۆکتۆبەری ١٩٨٤دا وەزیری دەرەوەی تورکیا هاوڕێ لەگەڵ ژمارەیەك بەرپرسی سەربازی تورکیا سەردانی بەغدادیان کرد بۆ مشتومڕکردن سەبارەت بە بارودۆخەکە[١٢٢].

هەریەك لە تورکیاو ئێراق نەیاری سەربەخۆیی کورد بوون لە هەرپارچەیەکی کوردستاندا، لەم پێناوەدا تورکیا تاڕادەیەك بە سەختی توانی دانوستان‌و رێککەوتنێك ئەنجامبدات تا هەڵبکوتێتە سەر بنکەو بارەگاکانی پەکەکە لە باکووری

---

122 . See Birand, Apo ve PKK, 130–133

ئێراق. لەراستیدا دوو هۆکار هەبوون بۆ ئەوەی ئێراق رازی بێت تورکیا کێومالّی نێوچە سنوورییەکانی باکووری ولاّتەکەی بکات.

ئەوە لەکاتێکدا بوو ئێراق هەمیشە نیگەرانی خواستو خولیای تورکیابوو بۆ کۆنترۆلّکردنەوەی نێوچە ناعەرەبییەکانی باکووری ئێراق، ئەو ناوچانەی زەنگین بەنەوتو بیرەنەوتەکان بوون‌و لە رابردوودا لەژێر دەستی وسمانییەکاندا بوون. هۆکاری یەکەم، ئێراق دەیەویست پێوەندییەکی تۆکمە لەتەك تورکیادا زیندوو رابگرێت، چونکە نەوتی خاوی ئێراق لە رێگەی تورکیاوە رەوانەی دەرێ دەکرا، هاوکات پێوەندییە بازرگانییەکانی دیش لەو رێگەیەوە دەستەبەر دەکرا. دووەم هۆکار خۆی دەبینییەوە لە تەمبێ کردنی هێزە کوردییەکانی نەیاری رژێم، چونکە هەر ئۆپەراسیۆنێکی تورکیا بەدرێژایی پێنج کیلۆمەتر بۆ راوەدوونانی هێزەکانی پەکەکە، کاریگەریی دەکردە سەر شێواندنی ئەو بنکەو بارەگایانەی پارتەکەی مەسعود بارزانی.

لەگەلّ ئەوەیشدا ئێراق بەئەندازەی پێویست بەوریایی مابوویەوە لەبەرامبەر هەر زێدەرەوییەکی زیاتر لە ٥کم بۆنێو قولاّیی خاکی ئێراق. نیگەرانییەکانی تورکیایش لەوەوە سەرچاوەیانگرتبوو کە رژێمی ئێراقیش بۆخۆی دەسەلاّتی نەدەشکا بەسەر نێوچە سنوورییەکانی خۆیدا. هەریەك لە تالّەبانی‌و بارزانی پەشێوبوون بەو رێکەوتننامەیەی نێوان ئێراق‌و تورکیا. بارزانی هەموو ئەو ناوچانە تاسنوورەکانی تورکیا لەژێر کێفیدا بوون. هەربۆیە تارادەیەك پەشێویی بارزانی لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە لەهەر ئۆپەراسیۆنێکدا ئەوان دووچاری گرفتدەبوونەوە. هاوکات پێوەندییەکانی رێبەری کوردەکانی ئێراق لەگەلّ ئۆجەلاندا زێدەتر بەرەو خراپی دەچوون. ترسی بارزانی لەوەدابوو کە لەگەلّ هەر سنوربەزاندنێکی تورکیادا، ئەوانیش بەئامانج بگیرێن.

له دووەم ساڵوەگەڕی دەستپێکی خەباتی گەریلایی پەکەکەدا دژ بە تورکیا له ١٥ی هەشتی ١٩٨٦دا هێزه ئاسمانییەکانی تورکیا تۆپبارانی نێوچه سنوورییەکانی باکوری ئێراقیانکرد. لەئاکامدا نێزیگەی ١٠٠ کەس له هاوڵاتی کوردی سیڤیلو پێشمەرگەی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێراق کوژران. لەساڵی ئایندەیشدا هێزەکانی تورك ئۆپەراسیۆنێکی گچکەتریان بۆ نێوچەکه دەستپێکرد.

له مانگی ئازاری ١٩٨٧ دا دیسان ئۆپەراسیۆنێکی گەورەی سنوربەزاندنو تۆپباران دەستپێکرد، له ئاکامدا چەندین کەس برینداربوونو دەیان خانووی ئاواییه کوردنشینەکان خاپوورکران[١٢٣]. دوو مانگ دوواتر بارزانی بەشێوەیەکی فەرمی ئەو پرۆتۆکۆڵەی لەگەڵ پەکەکەدا واژۆی کردبوو هەڵیوەشاندەوە. رەنگه هۆشیاری بارزانی لەمەڕ زیادبوونی جەماوەری پەکەکەوه بوبێت، ئەو هەستەیان لەلای بارزانی چاند که پەکەکه وەك دوژمن نەبینێت. لەم بارەیەوە بارزانی رایگەیاند:" ئێمه لەبارەی هێرشەکانی پەکەکەوه بۆ سەر تورکیا، هیچ شتێکمان نییه بۆ وتن، بەڵام پاش ئەوەی ئەو هەموو رووداوانه روویانداوه، ئیدی ئەستەمه بۆ پەکەکه بتوانێت له نێوچەکانی ژێر کۆنترۆڵمان بمێنێتەوە"[١٢٤].

کاتێك بارزانی داوای کرد پەکەکه نێوچه سنوورییەکان جێبهێڵن. پەکەکه لەرووی داواکەی بارزانی نەوەستانەوە. دیاره کۆتایی هاوپەیمانییەتی نێوان پەکەکەو پارتی کەمێك کاریگەریی لەسەر پەکەکەو چالاکییەکانی پەکەکه هەبوو لەنێوچەکەدا. چونکه هاوپەیمانییەکه رێگەی دابوو بە پەکەکه بنکەو بارەگاکانی خۆیان له باکووری ئێراقدا دامەزرێنن. لەو ماوەیەدا گەریلاکانی پەکەکه بەتەوای بارەگاو سەنگەرەکانی خۆیان لەناوچەکەدا دامەزراندبوو، ئیدی ئەستەمبوو لەو نێوچانەدا هەڵبکەندرێن بەبێ بەکارهێنانی هێزی سەربازیی توند. ئۆجەلانیش دەمێکبوو بایەخی هاوپەیمانییەتەکەی لەلا بێ بایەخ ببوو.

---

[123] Attacks cited in Dagli, Birakuji, 44–45
[124] Quoted in Yeni Gundem, 27 Sept.–3 Oct. 1987, 14

هەربۆیە لەو ماوەی پێشوودا دەستیدابوویە زنجیرەیەك رەخنەوەو گازاندە لەبارزانیو پێی وابوو خەباتی بارزانی خەباتێکی سەرەتاییە لەبەرئەوەی ئامانجەکانی لە پێناو ئۆتۆنۆمیدایەو ئامانجی ئەم سەربەخۆییە. ئێس کە نازناوی کادیرێکی پەکەکەبوو لە هەرێمەکەداو مژوڵی چالاکی بوو دەیوت:" چەندینجار مەسعود بارزانی نارەزایەتی دژ بەو زمانە دەربڕیوە و پێی وابوو زمانێکی شەرمهێنەرە"، هەروەها لەشوێنێکی دیکەدا دەیوت:" بارودۆخی ئێمە وەك بارودۆخی کورد نییە لەتورکیا، خواستی سەربەخۆیی لە ئێستادا خواستێکی سەختە". لەهەمانکاتدا مەسعود بارزانی فرە سەغڵەتو تورەبوو لەو دەستدرێژیانەی پەکەکە کە دەیکردە سەر گروپو رێکخراوە کوردییەکانی دی لەناوچەکەدا. بۆ نموونە لەبەهاری ١٩٨٥دا چەکدارانی پەکەکە هەڵیان کوتایە سەر بارەگاکانی حزبی کۆمۆنیست. دیارە ئەوەش بەپاساوی ئەوە بوو کە پشتگیری گروپە کوردییەکانی تورکیایان کردووە وەختێك کە لە شوێنەکانی دیدا لەگەڵ پەکەکەدا لە جەنگدا بوون. بارزانی ئەم هێرشەی پەکەکەی بۆ سەر کۆمۆنیستەکان بەو جۆرە لێکدایەوە کە هێرشە بۆسەر پارتی، چونکە پارتی لەو کاتەدا لەگەڵ کۆمۆنیستەکاندا لە یەك هاوپەیمانیدا بوون.

لەراستیدا هێرشکردنە سەر کۆمۆنیستەکانو تورەیی بارزانی لەو هێرشە رەنگدانەوەی ململانێی باڵادەستی نێوان بارزانیو رێبازی سەرۆکایەتی ئۆجەلان بوو. ئۆجەلان لەو دەمەدا چەپێکی توندرەو بوو، ئەو بۆخۆی ببووە رێبەری پەکەکە، بارزانیش رێبەرێکی هۆزگەرای ترادیشناڵ بوو، ئەو سەرۆکایەتییەکەی بەشێوەی بۆماوەیی لەباببیەوە بۆمابوویەوە، پاش ئەوەی بابی مرد، ئیدی ئەو بووە رێبەری بزووتنەوەکەی. بارزانی دەکرا توندوتیژبێت لەبەرامبەر نەیارەکانی، لەوانە پارتە کوردییەکانی دی، ئەوانەی چاویان بڕیبووە دەسەڵاتەکەی، وەڵێ لەبەرامبەر ناوخۆی پارتەکەیدا خەیاڵی تەخت بوو. بەڵام ئۆجەلان وانەبوو. بارزانی نەزمی لەسێدارەدانی بۆ نەیارانی ناوپارتەکەی بەکارنەدەهێنا، ئەو نەزمەی لەناو تەڤگەرە چەپە توندرەوەکاندا فرە باو بوو. هێرشو هەڵکوتانە سەر پارتی کۆمۆنیستو نواندنی

توندوتیژیی لەبەرامبەریان، هاوکات هێرشی زارەکی پەکەکە بۆ سەربارزانی دەنگدانەوەی بەرینی هەبوو، بەتایبەتی لەنێوان هەردوو گروپە ئێراقییەکە کە پەنای چەکدارانی پەکەکەیان دابوو وەختێ کە هەڵهاتبوون بۆ نێوچەکانیان.

بارزانی بەتەواوی لە هەڵچوونو پشێوییەکانی ئۆجەلان تێنەگەیشتبوو، ئۆجەلان دڵگرمێ بوو لە بەرامبەر زۆرێك لە ئەندامانی گروپەکە، بەتایبەتی ئەوانەی وازیان لە پەکەکە هێنا بوو. تەنانەت جارێکیان بارزانی هەوڵی دا تا بەسەلامەتی یەکێك لە ئەندامانی پەکەکە بگەڕێنێتەوە بۆ ناویان، ئەو ئەندامە ترسی ئەوەی هەبوو لەسێدارەی بدەن. ئیبراهیم ئایدن پاش ئەوەی لە پەکەکە هەڵدێت، لەسەر سنووری ئێران سوپای پازداران قۆڵبەستی دەکەنو پاشان پێشمەرگەکانی پارتی پەنای دەدەن. ئەو دەیوت:" مەسعود بارزانی هەواڵی نارد بۆ جەمیل بایك، پاشان مەسعود بارزانی پێی راگەیاندم کە دەتگەڕێنمەوە بۆنێو پەکەکە". هەروەها وتی:" من داواکەی بارزانیم دایە دواوە، ئەو نەیدەزانی بەگەڕانەوەم دەمکوژن".

لەراستیدا بۆ ئۆجەلان کێشە نەبوو چەند سەرکردەی کورد رقیان لێی دەبێتەوە یاخود بەڵێنەکانی ناباتە سەر، بەلآم بەهیچ جۆرێك نەدەبوو ئەندامێکی پەکەکە واز لەپەکەکە بهێنێت. جەلال تالەبانی لەکۆتایی هەشتاکاندا وتی:" پەکەکە بەهێز نەبوو، بەلآم لەهەموو گروپە کوردییەکانی دی جەماوەریی تر بوون". هەروەها وتی:" بۆ ئەوەی بەهێز بیت، پێویستە رێکخستنێکی بەهێزو سەرکردەیەکی بەهێزو جەنگاوەرێکی سەرکەشت هەبن، ئەوانەش لەپەکەکەدا نەدەبینران، ئەوان ئەوەی هەیانبوو پشگیرییەکی جەماوەریی بوو"[١٢٥].

[125] Birand, Apo ve PKK, 197.

لەکۆتایدا سەلاحەدین چیلیك لە نێوەندی ١٩٨٥ دا گەڕایەوە بۆ نێو تورکیا. ئەو دەبوو لە چیاکانی باکووری ئێراقەوە بۆ نێوچەی شرناخی باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا دەربازبێت. بۆخۆی دەیگێڕایەوە:" ئێمە ٣٠ تا ٥٠ کەسێك دەبووین، دەبوو بەهێواشی تێپەڕبووینایە، هەرچەند کە سەربازەکانی تورك دەسەڵاتیان بەتەواوی بەسەر زنجیرە شاخەکانی سنووردا نەدەشکا".

چیلیك لەدەستپێکی هێرشەکانەوە بۆسەر تورکیا جارێکی دی توانی بە باب‌و براکەی لە ئاواییە کۆنەکەیاندا شاد بێتەوە[١٢٦]. وەلێ ئیدی ئەستەم بوو بتوانێت بەسانایی بمێنێتەوە لەتەکیان. سوپای تورکیا ئەزموونی باشی لە یەکە گەریلاییە بێ ئەزموونەکان دیتبوو. ئەستەم بوو بۆ گەریلاکانی پەکەکە بەنێوچەکاندا گوزەربکەن‌و هاوکات رووبەڕووی جەنگی دژوارو یەك لەدووی یەك ببنەوە. مەحسوم قرقماز لە مانگی نۆدا یەکێك لە هێرشەکانی بۆسەرتورکیا رێکخست، وەلێ تورکیا فرە بەسەختی تۆڵەیانکردەوەو دوو کەسیان لێ بریندارکرا. چیلیك دەیوت:" من شەنسم هێنابووی کە دووچاری شەڕ نەبوومەوە".

کۆتایی ئەو ساڵە چیلیك گەڕایەوە باکووری ئێراق‌و لەسنوورەوە دەربازی ئێرانبوو، لەوێشەوە چووە تاران. ئیدی لەوێ لەرێگەی پاسپۆرتە ساختە تورکییەکەیەوە سواری فرۆکە بوو بەرەو دیمەشق. ناوبراو پێش ئەوەی بچێتە کەمپی حلووە چاوی بە ئۆجەلان کەوت. چیلیك دەیوت:"ئۆجەلان سەرقاڵی گلەو گازاندەبوو لە خەڵکی، وەلێ من هیچ سەنجی رانەکێشام". هەروەها دەیوت:" من تەنها مژوڵی ئەوە بووم چی پێویستە بکەین لەپێناو جەنگە گەریلاییەکەماندا". لەو دەممەدا پەکەکە لە ئامادەسازیدا بوو بۆ کۆنگرەی سێهەم. کۆنگرە لە کۆتایی

[126] Description of the 3rd Congress draws mainly on Celik's recollections, along with information provided by PKK members who later received information about the proceedings. Published sources include Birand, Apo ve PKK, 141; and Yuce, Bildirgesi, 233–234

١٩٨٦دا بەرنامەرێژی بۆ کرابوو. لە کەمپی حیلوەدا سەرقاڵییەکی جدی هەبوو بۆ شیکاری بابەتەکانو بەرزکردنەوەی راپۆرت بۆ قۆناغی جەنگی داهاتوو. چیلیك پەیوەستبوو بە گروپێکی چالاکەوەو مەزنترین شیکاریان هەنجامدا لەسەر رووبەڕووبوونەوەکانو بەهای جەنگەکان.

دواتر پاش سێ مانگ کاری جدیو هەڵسەنگاندن، چیلیك لەلایەن خودی پەکەکەوە قۆڵبەستکرا. چیلیك تارادەیەك بە نیگەرانییەوە دەیگێرایەوە:" لە ئێوارەیەکدا قۆڵبەستکرام، ئەو دەم هاوینبوو، کەشو هەوای حیلوە خۆشبوو. کەسێك کە بەباشی دەمناسی، بەناوی خەلیل کایا هاتە نێو ژورەکەم، ناوبراو گوتی پێویستە بتخەینە زیندان تا راپۆرتەکە دەنوسرێت. ئیدی ناوبراو چەکەکەی هەلگرتم، من هەمیشە پیستۆڵم پێبوو، پاشان بردمیە ژورێكو تەنها هێشتمیەوە. زیندانی پەکەکە کەوتبوە یەکێك لە نهۆمەکانی بیناکانی پەکەکەوە لە کەمپەکەدا.

نهۆمی یەکەم هەمیشە بەکاردەهێرانرا بۆ ئەوانەی کە تۆمەتباربوون بە کرێگرتەییو کاری تێکدەرانە. نهۆمی ژێرەوەیش بەکاردەهێنرا بۆ ئەو ئەندامانەی پەکەکە کە خراپ ئەرکەکانیان بەڕێوەدەبردو کاریان دەکرد بۆ تەگەرە خستنە بەردەم خەباتی گروپەکە. چیلیك کە بەنائارامییەوە لەسەر کورسییەکەی جموجوڵی دەکرد وتی:" بۆ چەند مانگێکی کەم لەو زیندانەدا مامەوە، لەوێدا بەتەواوی پەراوێزنەخرابووم، دەمتوانی بە پیادەڕەوی بچمە دەوروبەر، سەردانی کتێبخانەم دەکرد، هەرچەند پاسەوانێکم بۆدانرابوو، وەلێ پێویستی بەپاسەوان نەدەکرد، ئاخر تۆ چیت پێدەکرێت لە زینداندا، پاسەوان تەنها بۆ هەڕەشەکردن بوو لەتۆ".

لە راستیدا ئۆجەلان نیگەران بوو لەوەی کە ئامانجە سەربازییەکانی نەگەیشتوونەتە جێ، هێشتا گەریلاکانی پەکەکە لە نێوخۆی تورکیادا مژووڵی خۆ سەلماندن بوون وەك جەنگاوەرێك. هاوکات تورکیا توانیبووی ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی پەکەکە لەنێوبەرێت، لەنێو ئەواندا سەرکردەی ئەفسانەیی پەکەکە قرقماز

له مانگی ئازاری ١٩٨٦دا کوژرابوو. لەراستیدا ئەنجامدان ئەو جەنگانەی کە لەلایەن گەریلاکانەوە بەڕێوەدەبران، وادیاربوو بەشێك بوون لەو تێروانینە ناڕاستانەو ئەوپێشبینیە هەلآنەی کە ئۆجەلان بۆ تواناو هێزو قەبارەی پارتەکەی کردبووی لە رووبەڕووبوونەوەکاندا.

هەرچەند لەبەرامبەر چالاکییەکانداو لەسەر زانیارییەکانی ئۆجەلان گلەو گازاندە بەرزبوویەوە، وەلێ ئۆجەلان لە وتاری کۆنگرەدا وەك هەورە برووسکە هاواری دەکرد:" ئایا رێگرییەکانی پێش ئێمە چ بوون، ئەدی بۆ کەس لێنەنەوی، ئایا من هەڵەبووم، بێگومان هەرگیز".[127]

لەراستیدا فەرماندە سەربازییە بالآکان هەڵەگەڵکیان لە جەنگەکاندا ئەنجام دابوو. لە بڕیارەکانی سەرەتادا بۆ چێکردنی گرووپێکی چەکدار سێ تا پێنج کەسێك راسپێردرابوون، هەر ئەوانە بوونە هۆی ئەنجامدانی گەلێ گێروگرفت بۆ گەریلاکان. هاوکات ئەو گروپانە گەلێ گچکە بوون تا بوەستنەوە لەرووی هەر هێرشێکی تورکیدا، لەهەمانکاتدا بۆ تورکەکان ئاسان بوو تا ئەوان کێومالبکەنو لەنێویان بەرن.

ئەم رەوشە رووینەدا تا چیلیكو سەرکردە سەربازییەکانی دی یەکەکانیان رێکخستو هێزی گەریلای گونجاویان دروستکرد لە نێوەراستی ١٩٨٥دا. ژمارەی کەمو بێ ئەزموونیان هەڵەگەلێکی ئێجگار دژواری لێکەوتەوە. ئۆجەلان ملی نەدەدا بۆ بەرپرسایەتیی هەر هەڵەیەکی ستراتیژیو تاکتیکی. ئۆجەلان هەمیشە بە باوەرێکی چەسپاوو بەهێزەوە بۆچوونەکانی دەربڕیوە لەمەڕ توانای پەکەکە بۆ سەرکەوتنو باوەڕی وابووە کارێزما بوونی پێگەیەکی دیاری کردووەو گەریلاکانیشی لەنێوتەڤگەری کورددا نەیاریان کەمە، ئەوەیش کاتێك رەنگی دابوویەوە کە پشتیوانی نوێ دەهاتنە ناو ریزەکانیانەوە.

---

[127] Ocalan

لەراستیدا هەڵە سەربازییەکانی پەکەکە دەرهاویشتەی بۆچوونەکانی ئۆجەلان بوون‌و بوونە مایەی بەخششێکیش بۆ ئۆجەلان. چون ئۆجەلان دەیبینی هەلێك رەخساوە بۆ بەرەبەرە لەنێوچوونی سەرکردەکانی پەکەکە، ئیدی ئەوانەی کە تەحەدای پێگەو کورسی ئۆجەلانیان دەکرد ون‌و گومەساربوون. موحەمەد خان یوجی رێبەری بەندکراوی پێشووی پەکەکە سالێك دوواتر نوسیبووی:" ئۆجەلان لە کۆنگرەی سێهەمدا کۆدەتای کردو هەموو دەسەلاتەکانی پەکەکەی گرتە دەست".

ئۆجەلان راهاتبوو بە گرتنەبەری رێوشوێنی سادە، وەلێ بەتەدابیرو نەخشەی کاریگەر. لەکۆنگرەدا دروست وەك چیلیك چەند سەرکردەیەکی تری دەستبەسەرکردن‌و چەکیکردن‌و ناچاری کردن بەتۆپزی بەیان‌و پەیامی زەبوونی‌و زەلیلی بدەن.

بەمجۆرە لاوازی دەنگە نەیارەکان هۆکارێك بوو تا ئۆجەلان بەرواڵەت پێگەو پەنای بەهێزو تۆکمە بکات. چیلیك بە هێواشی‌و بەدەنگێکی خەمناکەوە دەیگێرایەوە:"ئەوانەی لە شاخ بووین تێنەدەگەیشتین لە نیازو نەریتی سیاسی‌و ئەو ماجەرایانەی سیاسییەکان ، ئەوە بۆ ئێمە روونەدا تا بتوانین دەستبگرین بەسەر رێکخراوەکەداو لەچنگی ئەو تاکرەویە قوتاری بکەین. لە راستیدا ئێمە لەچیادا سەرگەرمی کاری خۆمان بووین، وەلێ ئۆجەلان لەخەمی شتێکی دیکەدابوو، ئەو جودا بیری دەکردەوە نەیدەویست هیچ شتێك بەسەریدا تێپەرێت‌و هەموو هەلێکی دەقۆستەوە بۆ جێگیرکردنی دەسەلاتەکەی"[128].

دیارە کۆنگرە لە ٢٥ مانگی ئۆداب ۆماوەی پێنج رۆژ دەرگاکانی والابوو، لەرووی تیۆرییەوە دەبوو کۆنگرە مەیدانێکبێت تا ئەندامان ئازادانە مشتومرو ململانێ لەسەر پرس‌و جۆکان بکەن، وەلێ بەکردارەکی ئەم نەزمی بەرێوەچوونی کۆنگرەیە نەبینرا. دیارە کە کۆنگرەی دامەزراندنی پەکەکە لەساڵی ١٩٧٨دا لەناوخۆی تورکیا

---

[128] Kongre, 378. Yuce, Bildirgesi, 219

بەسترا، ئەو کۆنگرەیە پێویستییەکی بەپەلە بوو. دووەم کۆنگرەی پەکەکە لە سوریاو لە ١٩٨٢دا بەسترا. لەم کۆنگرەیەدا هەوڵەکانی چەتین سەمیر بۆ لێپرسینەوە لە ئاپۆ، لەلایەن خودی ئاپۆوە بێ بایەخ پیشاندراو دوواتر لەدەرەوەی پەکەکەدا لەنێوبرا. لە کۆنگرەی سێهەمیشدا ئەوە روونبوو کە رێگەی گفتوگۆی واقعی بەکەس نەدراو و پانتاییەکانی ئازادی تەواو بەرتەسکبوون و هەموو شیکارەکان پێویستبوو داکۆکی لە بۆچوونەکانی ئۆجەلان و جیهانبینی ئەو بکەنەوە، بۆ ئەمەیش بۆخۆی هەموو راپۆرتەکانی نوسیبوونەوەو نومایانی کردبوون.

چیلیک لە کۆتایی کۆنگرەدا دێتە سەرشانۆی کۆنگرە، باشیەکەی لەوەدا بوو ئاپۆ لەوێ نەبوو. چیلیک بەسانایی دەیپرسیی ئێمە یەکتریمان لەنێوبردووە، لەکۆنگرەکەدا ٨٠ کەسێك روویان لە چیلیك بوون ئەوان لەسەر کورسییە دارینەکان دانیشتبوون، چیلیك بەدەم قسەکانەوە هەستایە سەرپێ. گوتی ئەوان ئێوە تۆمەتباردەکەن بەبەکرێگیراوی بۆ دوژمن و بابتان بە بەکرێگیراو نێودەبەن و تۆمەتبارت دەکەن بەوەی کەسانی دی ژەهراوی دەکەن. ئەوان دەڵێن شوێن فەرمانی ئاپۆ ناکەون، پاشان وەستاو جگەرەیەکی داگیرساند. ئەوە زۆر سەخت بوو بۆمن، ئەوە یەکەمجارم بوو لەژیاندا دووچارو رووبەرووی تۆمەتگەلی لەو شێوە بکرێمەوە، ئەوە بەراستی سەختە بۆمن، ئەوان ویستیان کەسایەتی من تێکبشکێنن، ئەوان تەنانەت هیچ فرسەتێك نادەن بەتۆ تا قسان بکەیت. ئەوە مانای وایە کەتۆ دژی حزبەکەی".

چیلیك سەرێکی راوەشاندو گوتی: من پێویستبوو لەشتانێك دڵنیابم، راپۆرتێکم نوسی و لە رۆژنامەی پەکەکەدا وەشانکرا. وام دانابوو ئێوە دەکرێت بڵێن ئۆجەلان بردییەوە. بەهەمان شێوە ئۆجەلان چەند بەرپرسێك کە گەیشتبوونە پلەی بەرپرسایەتی و رێز بوونە جێ ئامانجی.

لەپاش دەستپێکی خەباتی چەکداری لە ئۆگەستی ١٩٨٤ دا تەقریبەن هەموو کەسێکی دیار لەنێو پەکەکەدا بووە جێ ئامانجی ئۆجەلان. دوران باڵکان(عەباس) کە لەدووای کۆنگرەی دووەم بەرپرسی سیاسیی تێکڕای هێرشی سەر سەمیندیلی بوو، ئەو دیاری کرابوو بە جێگری عەبدوڵا ئۆجەلان، یەکێك بوو لەوانەی کە قۆڵبەستکرا. هەروەها عەلی (تێرزی جەمال) ئۆمورکان فەرماندەی هەڵکوتانە سەر کەتاك بوو لە ئۆگۆستی ١٩٨٤ دا دروست لەپاش کۆنگرەی دووەمدا ئەویش دەستگیرکرا. هەوەها کەسیرە یەڵدرم(فاتیمە)ی هاوسەری ئۆجەلان، کە بەشداربوو لە دووایین بڕیاری دەستپێکی خەباتی چەکداریدا، ئەویش بەبڕیاری ئۆجەلان دەستگیرکرا. کەسیرە خانمێکی زمان پاراو بوو، ئەو لەسەر هێڵێکی سەربەخۆ دەڕۆی لەناو پارتەکەدا، دوواجار لەگەڵ ئۆجەلان دووهۆکار بوونە هۆی پێکدادان لەنێوانیاندا، پڕوپاگەندەگەلێك ئەو باوەڕەیان لاچاندبوو کە ئۆجەلان لەگەڵ خانمێکی دیکەدا دەستی تێکەڵکردووە. لە راستیدا ئەوانەی کە لە ترسو تووڕەیی ئۆجەلانیش هەڵهاتبوون یان لەنێوبران وەك کۆرك مەزی فەرماندەی هەڵکوتانە سەر ئەروح لە ئۆگەستی ١٩٨٤و عەبدوڵا ئاکینجی فەرماندەی هەڵکوتانە سەر سەمیندلی لەهەمان ساڵدا یاخود نەیانتوانی هیچ شتێك ئەنجامبدەن لە دووەم کۆنگرەی پارتەکەدا سەرکوتکران. یەکێك لەگەریلاکانی پێشووی نێو ئەو پارتە بە خەندەیەکەوە گوتی تەنها چارەی ئۆجەلان بۆئەوەی ئیدی نەچێت بەدووی ئەو کەسانەی کەلەناو پارتەکەدا نێودەردەکەن، ئەوەیە کە خەڵکانێك تەرخانبکات بۆ هێشتنەوەی ئەوانە لەپێگەو مەکانی خۆیان و کاریان بچوککردنەوەیان بێت.

ئۆجەلان گەر زەبوونکردنو قۆڵبەستکردنی ئەنجامبدایە، هاوکات بۆ هاوسەنگکردنەوەی ئەو رەوشەو بۆ پاراستنی دەسەڵاتی تاکڕەوانەی لێبووردنی گشتیشی دەدا تا زیاتر خەڵکی پەیوەستبن پێوەیەو توندتر سەرۆکایەتییەکەی

راپەڕێنێت. لەدووای کۆنگرەی دووەم چەکدارە زەبوونکراوو ئابڕووچووەکان، ئیسان پێگەی نوێو بەرپرسایەتی دیکەیان پێسپێردرا.

لەراستید یەك دوانێك کارو ئەرکە نوێیەکەیان دایە دوواوە، ئیدی ئەوانی دی تێکڕا رازی بوون بە بەرپرسایەتییە نوێیەکەیان. بۆنمونە کەسیرە یەڵدرم نێردرا بۆ ئەسینا بۆ رێکخستنی پەکەکەو چیلیکیش چووە وڵاتی ئەڵمانیا بۆ هەمان مەبەست. بەم پێیەش ئۆجەلان توانی ئەوە بسەلمێنێت نەك هەر کەس ناتوانێت جگە لەخۆی پێگەی کەسێك لەنێو پەکەکەدا هەڵبکەنێت، بەڵکو کەسێکیشە دەتوانێت کەسانێك بگەڕێنێتەوەو ئەرکو ئامانجی نوێی حزبەکەیان پێدەستەبەربکات. چیلیك دەیوت:" لەمردن نەدەترساین، بەڵام لەوە زەندەقمان چووبوو، گەر پێیان بوتینایە غەیانو ناپاك". هەروەها وتی:" بۆخۆشمان ئاسان نەبوو گروپێکی شەڕکەر بەجێبهێڵین کە ئامانجی دەوڵەتی کوردیێ بوو، تەنانەت ئەگەر ئەو گروپە شۆڕەتو ناوی لەنێو هاوەڵەکانماندا لەکەداربکردایە، نەدەکرا دژی شتێك بین کە بەنێوی پەکەکەوە رووبەڕوومان دەکرایەوە. لەراستیدا پەکەکە رێکخراوێکی باشو گرنگبوو، تەنانەت بە خەیاڵیش نەماندەتوانی چەوتو چەوێڵییەکانی ببینین". ئەوانەی کە لە هەفتاکانەوە پێوەندیانکردبوو بە گروپەکەوە، جۆرێك لە بێسەرەو بەرەیی‌و ئازادانە هەڵسوکەوتیان دەبینی، ئەویێ دەم دەسەڵاتی ئۆجەلان بەشێوەیەکی هەڕەمەکی هەڵدەسوڕا، وەلێ لەئێستادا دەیاندی کە چۆن ئۆجەلان بەهێزو سەنگین بووە لەناو پەکەکەدا. لەراستیدا ئەوان یان نەیاندەتوانی چاودێر ئۆجەلان بکەن یاخۆ هیچ دەرفەتێکیان نەبوو بۆ رووبەڕووبونەوەی ئۆجەلان.

هەرچەند ئەوانەی کەدواتر پێوەندیان کرد بە گروپەکەوە ئیدی پێویست نەبوو ببینن چی روودەداو چی روونادات. ئەوانە زیاتر لە ئەورووپاوە هاتبوونە نێو ریزەکانی پەکەکەوە، لەلای ئەوان بوونی ئۆجەلانو هێزو توانای شیاوی هیچ لێپێچنەوەو راڕاییەك نەبوو. بەمجۆرە لە قۆناغی کۆنگرەی سێهەمدا ئیدی ئۆجەلان

بەتەواوی کۆنترۆڵی هەموو بوارەکانی کرد لەنێو پەکەکەدا. ئۆجەلان تەنها یەکلانەبوویەوە بۆ کۆنترۆڵی پارتەکەی، بەڵکو دەسەڵاتیشی دەشکا بەسەر دانە بەدانەی ئەندامانی گروپەکەدا.

هاوکات هەوڵیشی دەدا دەسەڵاتی بەسەر هاوڵاتیانی مەدەنی کورد لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا بشکێنێت. لەسەر خواستی ئۆجەلان کۆنگرەی سێهەم پێداگریکرد لەسەر چەند بڕیارێکی گرنگو جێ مشتومڕ. لەوانە سەرکردایەتی بڕیاری بەسەربازکردنی دا بەشێوەی تۆپزیی، ئەو جەوانو مەردانە کە تەمەنیان گەیشتبووە ئاستی پێویست دەبوو بێنە نێو ریزەکانی پەکەکەوە یاخود دووچاری مەترسی رفاندن دەبوونەوە. هەموو ئەوانەی لە کۆنگرەدا بوون رازی بوون بەیاسای سەندنی باج بەسەر هاوڵاتیانی هەرێمەکەدا. هەردوو یاساکە لە نیازی پەکەکەدا بۆ جێگیرکردنو شوێنکردنەوەی پەکەکە بوو لەنێوچەکەدا، وەڵێ بەپێچەوانەوە بوونە هۆی رەوینەوەی چەندین هاوڵاتی لەپەکەکە، دژی پەکەکەیش لەنێو میلیشیا کوردییەکاندا کەلەلایەن میرییەوە سپۆنسەردەکران دەستیان دایە چەك.

## پەکەکە لەنێو زینداندا

کوردەکان لە تورکیادا راپێچی بەندیخانە دەکران، ئەوان زیاتر دەبرانە زیندانی سەربازیی دیاربەکرد، لەساڵی ١٩٨٠وە ئیدی ئەو زیندانە بەتەواوی لەژێر کۆنترۆڵی سەربازییدا بوو[١٢٩]. ئەو شوێنەی زیندانەکەی لێبوو پێکهاتبوو لە کۆمەڵە ساختمانێکی تەنراو بە تەلی دڕکاوی، و تاوەری پاسەوانیی، ئەوێ شوێنێك بوو لە دەرێی دیاربەکردا، زیاتر شوێنی ئەو دێهاتیانەبوو کە بەدووی کارو کەسابەتدا

٤ .Information on Diyarbakir prison relies on interviews with former prisoners. Published sources include Zana, Bekle Diyarbakir, 336–346 and Prison No 5, 3–36; Yuce, Zindan Direnisi; and Helsinki Watch, Destroying Ethnic Identity (1988).

گەڕابوون‌و یاخۆ لەجەنگەکان هەڵهاتبوون، ئیدی گەشەی ماڵەکان بەجۆرێك بوو کە بە تەواوی دەوری دیواری زیندانەکانیان تەنی بوو.

بەشێوەیەکی گشتی زیندانی دیاربەکر نێزیکەی ۲۰۰۰ کەسێکی تێدابوون زۆربەی زۆریان بە تاوانی پاڵپشتی‌و تێوەگلان لەگەڵ پەکەکەدا دەستگیرکرابوون، لەوانە پێڕێکی سەرەکی هەبوون کە چەند سەد کەسێك دەبوون، ئەوان چەند مانگێك پێشتر یاخو دروست پاش کۆدەتای ۱۹۸۰ قۆڵبەستکرابوون.

ئەو بەندییانە هەندێکیان لە دڵسۆزترین خەباتکارانی پەکەکە بوون، زۆربەیان لەبەر چالاکی‌و جموجوڵەکانیان رووبەڕووی سزای مەرگ‌و لەداردان ببوونەوە. هەرچەند هیچ لەو زیندانیانە پێوەندیان لەتەك ئەو گەریلایانە نەبوو کە دزەیانکردبووە نێو تورکیاو ئۆجەلان لەدیمەشقەوە هیچ سەرەداوێکی لەگەڵیان نەبوو. وەلێ ئەوان هەوڵیاندەدا ، بوونی پەکەکەو ئامادەیی رێکخستنەکە لە زینداندا بسەلمێنن. زیندانی دیاربەکر بەناوبانگبوو بە ئەشکەنجەو ئازاری دڕندانەی زیندانیان‌و رەوشی ناهەمواریان.

ساڵی ۱۹۸٤ هەلومەرجی زیندان هێوربوویەوە، بەرادەیەکی زۆر هێوربوونەوەکە پێوەندی بە گەڕانەوە رژێمی وڵاتەوە هەبوو بۆ رژێمێکی دیموکراتی‌و فشاری سەرلەنوێی ئەورووپییەکان لەسەر رەوشی مافی مرۆڤ لە تورکیا.

لە مانگی یەکی ۱۹۸٤ لە ئاکامی ناڕەزایەتییەکدا دووان لە زیندانییەکان مردن‌و دوانیش خۆیان کوشتەوەو یەکێکی دیش لێیاندا تا بەمەرگیان گەیاند[۱۳۰]. پاش ئەوە لەزۆربەی زیندانەکاندا رەوشی زیندان بەرەو باشبوون چوو، زیندانییەکان ئەشکەنجەنەدەدران‌و بۆ هەوەڵجار دەستیان رادەگەیشت بە کتێبوو رۆژنامەو دەیانتوانی بێنە حەوشەی زیندان‌و هەوای پاك هەڵمژن‌و وەرزشبکەن. پارێزەرێکی

[130] Details are given in Yuce, Zindan Direnisi, 191–220 and Zana, Prison No 5, 28–35.

زیندانی دیاربەکرد دەیوت:" کاتێك ڕەوشی زیندان هێور بوویەوە، زیندانییەکان هەستیاندەکرد لە بەهەشتدان".[131]

بەمجۆرە وەك زۆربەی زیندانەکانی تورکیا، ئیدی خانەکانی بەند کردن گەورەکرانو شوێنی خەوتنو مانەوەی زیندانییەکان گۆڕانی بەسەردا هات. زیندانییەکان ترنجێنرابوونە ژوورگەلێکەوە کە هەریەکەیان ٤٠ بۆ ١٠٠ کەسی لەخۆ دەگرت، لەوێدا قەرەوێڵەی دوو یا سێ قات هەبوون بۆ خەوتنو خواردن دەهێنرایە نێو ژووری زیندانییەکانەوە. ئەم گردکردنەوەیەی زیندانیانی پەکەکە لە ژوورەکاندا وەك هەلێکی زێڕین وابوو بۆ ئەندامانی پەکەکە، ئەوان لەوێ خۆیان ڕێکخستو کادێرگەلێکی باشیان دەستەبەرکردو دواجار بنەمای ڕێکخراوەیی خۆیان پاراست. ڕەجەب مارسیلی ئەندامی گروپی ڕزگاریی کە نێزیکەی تەواوی هەشتاکان لە کونجی زینداندا بوو دەیگوت:" بەندکراوەکانی پەکەکە زۆر چالاكو وردو وریابوون".

ئەندامانی پەکەکە بەهەمان نەفەسو نیازی پێش دەستگیرکردنیانەوە لەنێو زیندانیشدا چالاك بوون. ئەوان کۆمیتەیەکی ناوەندییان پێکەوەنا بۆ ڕێکخستنی کاروبارەکانی تایبەت بەخۆیانو هەر خانەیەکی زیندانیش کۆمیتەیەکی تایبەتی هەبوو کە کاری ڕۆژانەیانی تاوتوێ دەکرد. هەروەها زیندانییەکان خولی خوێندنی بەکۆمەڵو گردبوونەوەی ڕێکخراوییان پێکەوە ئەنجامدەدا. ڕەفیق کە ناوێکی خوازراوی قوتابیەکی کوردی بەشی یاسابوو، ببووە ئەندامێکی چالاکی پەکەکەو لە دەوروبەری کۆدەتای ١٩٨٠دا قۆڵبەستکرابوو، ئەو دەیوت:" هەموو ڕۆژێك بەتایبەتی لە ئێواراندا، کەسێك مێژووی پەکەکەی دەوتەوە، ئەندامانی پەکەکە دابەش ببوون بەسەر گروپەکان نێو زینداندا، ئەوان وتوێژیان لەبارەی مێژووی کوردو پەکەکەو سیاسەتی نێودەوڵەتیو ململانێی دەسەڵاتەکان دەکرد.

---

[131] Helsinki Watch, Destroying Ethnic Identity (March 1988), 15.

راگەیاندنی خەباتی چەکداری پەکەکە لەدەرێ، ورەی زیندانیانی بەرزکردەوە. هەروەها رەفیق دەیگوت:" ئەو ئەندامانەی پەکەکە کە لە هێرشەکاندا بەشدارییان کردبوو، پاشان دەستگیرکرابوون، ئەوان روونکردنەوەیان لەبارەی رووداوەکان بۆ زیندانیان دەداو باسیان دەکرد کە لەدەرێ چی دەگوزەرێت". هەروەها دەیگوت:" ئەو دێهاتیانەی کە یارمەتیدانی پەکەکە تۆمەتبارکرابوون‌و راپێچی زیندانکرابوون، بۆ ئێمەیان دەگێرایەوە رەوشەکە چۆنەو ئەندامانی پەکەکە چۆن دەهاتنە ناو گوندەکانەوەو چۆن مژوڵی رێکخستنەکان بوون.

بەمجۆرە جەنگ هاورا لەگەڵ بەرخودانی ناو زیندانن بەتەواوی بوونە هۆی بەرزبوونەوەی شۆرەت‌و پێگەی پەکەکە لەناو کۆمەڵگەی کورددیا. هاوکات ئەو زیندانیانەی پەکەکە کاریانکردە سەر هاو بەندییەکانیان، بەتایبەت کاتێك ئەوانیان دی بەبڕوای نەلەخشیوەوە دەستیانداوەتە رێبازەکەیان، هاوکات هێزەکانی ئاسایش پاش ئەوەی لەپاش جەنگە چەکدارییەکە دەستیان دایە راوەدوونان‌و گرتنی هەڕەمەکی خەڵکی، ئیدی بوونی ئەو خەڵکە لەزینداندا هۆیەك بوو تا پەیامی زیندانیانی پەکەکە زووتر بڵاو بێتەوە. مارسیلی دەیگوت:" پەکەکە دەیتوانی سوود لە دێهاتییانە وەربگرێت کە بەتۆمەتی هاوکاریکردنی پەکەکە بەچەك‌و خۆراك دەستگیرکرابوون‌و لەوێ لەخانەکانداو لەکاتی وەرزشدا پەیامی پەکەکەیان پێدەگەیشت". زیندانیانی پەکەکە لە دووی دۆزینەوەی رێگەیەك بوون تا پەیوەندی لەگەڵ پەکەکەدا لەدەرێ دروستبکەن.

موحەمەد خان یوجی ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی زیندانیانی پەکەکە دەیگوت:" دەبوو بزانین لەدەرێ پەکەکە مژوڵی چییەو بیر لەچی دەکاتەوە". بەڵام دژواربوو بتوانن پەیوەندی چێبکەن، چونکە قسەکردنی زیندانیانی پەکەکە لەتەك ئەوانەی لەدەرێی زیندان بوون سنووردارکرابوو.

تا کۆتایی هەشتاکانیش نامەو نامەکاری سنووردارکرابوو، بەتوندی لەژێرچاودێریدا بوون، تەنها بۆ خزمو خوێشی نێزیکی زیندانیان هەبوو سەردان بکەن، ئەوانیش بەتوندی چاودێری دەکران. هەندێك جار لەبۆنەو پشووەکاندا زیندانییەکان بەئازادی زیارەتکارانیان دەیانتوانی تێکەڵیانبن‌و قسانبکەن. پەکەکە هەرچۆنێك بوو توانی کەناڵێك بدۆزێتەوە بۆ ئاڵوگۆڕی نامەو نامەکاری لەنێوان پارتەکەو زیندانیاندا، تەنانەتە رێگەی جۆراو جۆر دەگێرانە بەر، ئەوان نامەکانیان دەخستە ناو زاریانەوەو لەکاتی ماچکردنی یەکتریدا دەیانگواستەوە بۆ ئەوانی دی، بەتایبەت لەناوهاوسەرانی یەکتریدا ئەم نەزمە روویدەدا. هاوکات زیندانییەکان توانیان تێبگەن لە رەوش‌و رووی پەکەکە لەدەرەوەوە، بەتایبەت ئاگاداری کۆنگرەی سێیەم بوون‌و زانییان ناپاکەکان لەداردراون، تەنانەت هەستیان بە لێکترازانی ریزەکاندەکردو باسوخواسی چەپەکانی دییان پێگەیشتبوو.

## ئامانجگیریی

لە ئێوارەیەکی سەرەتای مانگی شەشی ۱۹۸۷دا چەکدارەکانی پەکەکە گەمارۆی ئاوایییەکی بچوکی سەر بەپارێزگای مێردینیاندا کە تەنها نێزیکەی شەست کەسێك ئاوایییەکەیان پێکدەهێنا[132]. لە ئاوایی پینارچیك هەشت لە ئەندامانی پاسەوانانی گوندی سەربە میریی دروست لەپاش نانی ئێوارە لەشوێنی تایبەتی خۆیاندا مژوڵی پاسەوانی بوون. یەکێك لەپاسەوانەکان هەستی بەوەکردبوو، کە چەکدارەکانی پەکەکە دابەزیونەتە نێو ئاوایی و تەقە دەکەن، وەلێ بۆ پاسەوانەکان زۆر جێگەی بایەخ نەبوو، چوونکە چەکدارەکان فرەجار هاتبوونە نێو ئاواییەوە. ئاوایییەکە

[132] Description of Pinarcik attack taken from reports in Milliyet and Cumhuriyet newspapers; other information uses Birand, Apo ve PKK, 141–145; Oz- can, PKK, 99–100; Imset, the PKK, 49–78; Helsinki Watch, Destroying Ethnic Identity (March 1988).

لەنێوان دوو گردۆڵکەو نێزیکەی دەمیل لەنێوەندی رێگەی سەرەکی نێوان مێردینو ئۆمێرلی هەڵکەوتبوو. وەلێ لەم جارەدا ژمارەی گەریلاکان زیاتر بوون، بەشێوەی چوار بەرامبەر بەیەك لە پاسەوانەکانی سنوور، لەراستیدا جەنگ روویدا. یەکێك لەپاسەوانەکان گلەیی لەوە دەکرد کە ئەوان رێژەیان کەمبوو، هەروەها تفاقی جەنگو شەریشیان بەپێی پێویست نەبوو. گەریلاکان ٣٠ چەکدار دەبوون، ئەوان دابەزینە نێو ئاواییەکەو جەنگ لەگەڵ پاسەوانەکانی سەر بەمیریی دەرێژەی کێشا تا دوو کاتژمێر.[133] لەکۆتایدا شازدەمنداڵو شەش ژن هامڕا لەگەڵ هەشت پیاو بوونە قوربانی.

موحەمەد عەلی بیراندی وتارنووس کە خۆی یەکلاکردبوویەوە بۆ نووسین سەبارەت بەکێشەی کوردی وڵاتەکەی. لەکاردانەوەی رووداوەکەدا ئەوەی خستەڕوو کە ئەو کشتوبڕە تاوانێکی مێژووییە. دەنگدانەوەی کشتوبڕی پینارچیك لەمیدیاکانی تورکیادا وەك دڕندەترین هێرشی پەکەکە هەژمارکرا لەوکاتەوەی کە پەکە چەکدارییەکان وەك پاسەوانی سنوور دامەزرابوون. ئامانجی گەریلاکان لەم هێرشەدا چاوترساندنی کوردە دێهاتییەکان بوو تا واز لە کرێگرتەیی‌و وابەستەیی بێنن بۆ میریی.

پەکەکە وایدانابوو ئەو خەڵکانە نەك هەر یارمەتی گەریلاکان لە هەردە سەختو دژوارەکانی نێوچەکەدا نادەن، بەڵکو زۆرجار هاوکارو هەماهەنگیی لەتەك سەربازەکاندا دەکەن.

رۆژنامەی سەربەخۆبوونی پەکەکە بەئاشکرا ئەوەی خستە روو، کە ئەوە هەوڵێکە بۆ بەهێزکردنی بوونی پەکەکە لەبەرامبەر بەکرێگیراوانداو هاوکات هۆشداری ئەوەیشی دا کە پێویستە هەموو ئەوانە لەنێوببرێن. ئەوان کوردێك کە دەستی لەتەك میریدا تێکەڵکردبێت دروست بە غەیانو ناپاکیان دەزانی. لە راستیدا

---

[133] Milliyet, June 24, 1987.

بوونی پاسەوانەکانی سنوور نەك هەر رێگربوون لە بوونی پەکەکە لەنێوچەکەدا، بەڵکوو هەوڵێکیشبوون بۆ لاوازکردنی بانگەشەو بەرنامەی پەکەکە لە سنوورەکەدا.[١٣٤]

لەراستیدا پاسەوانەکانی سنووریش وەك گروپە نەیارو رکابەرە کوردییەکانی دی، وادانرابوون کە ناپاكو غەیانن بە پرسی پەکەکەو دۆزی کورد. پەکەکە زۆرجار ئەوانی بەدار هەڵدەواسیو دەمیانی پڕدەکرد لە پوڵو درهەم. وەلێ هەڵکووتانە سەر پاسەوانانی سنوور بە هەڕەمەکی بوو، خۆیان لە کوشتنی ژنو زارۆ نەدەبووارد. زۆرجاران وەك لەو ئاواییەدا ئەنجامیاندا پەکەکە ئەو راستیەیان سەلماند کە نیازی کوشتن هێندەی بیانهەوێت دەتوانن، ئیدی ئەوانە ژنو زارۆین یاخۆ چەکدارو سەربازبن. گەریلاکان نەزمی هێرشەکەیان ئەوەی لێدەخوێنرایەوە کە دەستناپارێزن لە کوشتنی هاوڵاتیانی سیڤیلو تەقەدەکەن لەو ئامبولآسانەیش کە خەڵکیان دەگواستەوەو پەیوەندیان بە میلیشیا چەکدارەکانی پاسەوانی سنوورەوە هەبوو.

لەدوو مانگی هەوەڵی ١٩٨٧دا گەریلاکان ٣٥ هاوڵاتی کوردی دێهاتەکانیان کوشت، لەوانە بەلایەنی کەمەوە حەوت منداڵ دەبینران. ئۆج ئالان بەئاشکرا لاریی لەو رەوشەنەبوو، بەرپرسانی پەکەکەیش هەوڵیاندەدا جۆرێك لە لۆژیك بدەنە کوشتارو کاولکارییەکان. وتەبێژی پەکەکە چەند رۆژێك پاش کوشتارگەکە کوشتنی هاوڵاتیانو زارۆی وەك شتێك کە قابیلی خۆلێلانەدان بێت، دایە دوواوە. ئەو وتی: "لەهەموو تێکۆشانو نەبەردییەکدا خەڵکی دەکوژرێن، وەلێ ئێمە پشتیوانی لە کوشتنی هاوڵاتیان ناکەین"[١٣٥] تەنانەت دوواتر روونبوویەوە زۆرینەی ئەوانەی کە دەکوژران ژنو زارۆبوون. گەریلاکانی پەکەکە لەپاش ئەو رووداوەیشو لە زۆرینەی

---

[134] From a 1987 issue of Serxwebun, quoted in Birand, Apo ve PKK, 142.
[135] Cumhuriyet, June, 26, 1987.

ئەو هێرشانەی لە پارێزگای ماردین روویانددەدا کە زۆرینەی تەنگژەکان لەوێ بوون پەکەکە بەهیچ کلۆجێك تاکتیکی شەڕی خۆی نەگۆڕی. بەچەند رۆژێکی کەم پاش هەڵکوتانە سەر ئاواییەکە، گەریلاکان سەرشاخی ئاواییەکی نێزیك لەوێیان گرتو پێیانیان راگەیاندن، گەر ناتانەوێت کوشتارگەیەکی هاوشێوەی ئەوێ دووبارە نەبێتەوە، ئەوا نابێت ناپاكو غەیانبن بەرامبەر بە پەکەکە[136]. لەراستیدا ئەم سیاسەتەی پەکەکە رای گشتی تورکیاو گروپگەلێکی دژ بەپەکەکە راستکردەوە، هاوکات سەربازەکانیش گەیشتنە بڕوایەك کە زۆرجار کوردانی نێوچەکان ئەو خراپ بەکارهێنانو کوشتوبڕە هێند بەسەختی ناگرن.

هەربۆیە گەر سالآنی ١٩٨٧–١٩٨٨ کوشتارگەکان هۆیەکی گەشەو نمای پەکەکە بووبن ، ئەوا لەکاردانەوەی ئەو کوشتوبڕانەی کە پەکەکە بەکاریدەهێنا، کۆمەڵگەی کوردەواریی هەڵوێستو کاردانەوەی نەبوو. دیارە ئەوەیش هۆکارگەلێکی جۆراو جۆری لەپشتەوە بوو، لەراستیدا خەڵکی بەئەستەم هەواڵیان پێدەگەیشت. یان لە کوردەواریدا بڕوا بەمیدیا تورکییەکانو رۆژنامەکانی میریی نەدەکراو سەرلەبەری هەواڵەکانیان بەدرۆ دەزانرا و بەهەوڵێکیان دەزانین تا پێگەو پێناسەی پەکەکە لەکەدار بکەن.

هاوکات نەبوونی کارەباو هێڵی تەلەفۆنو خزمەتگوزاری بۆ گەیاندنی رۆژنامەو نوسراوەکان بۆ ناوچە شاخاوییەکان ئێجگار کەم بوو. نەجدەت بولگان کە دوواتر بووە سەرۆکی شارەوانی یوك سیکۆڤا (شارێکە نێزیك سنوورەکانی ئێراقو ئێران) دەیووت:" زۆرجار میری لەمەڕ رووداوەکان هەواڵی ناڕاستی وەشاندەکرد، ئەم رەوشە هێند کاریگەریی هەبوو گەر هەواڵێکی دروستیش بڵاوبکرایەتەوە کەس بڕوای نەدەکرد".

[136] Milliyet, June 24, 1987.

له راستیدا هەندێك لەكوردان شایەتی كوشتارگە كە بوونو بەداخ بوون بۆ رەوشو رێگایەكی لەو جۆرە، وەلێ نەیانتوانی نكولی لە خەباتی رەوای پەكەكە بكەن. ئەم تێگەیشتنە یارمەتی توندوتیژییەكانی پەكەكەیان دا ، بەجۆرێك كاری لەو جۆرە زۆر ناجۆر نەبوو لە نێو هەرێمە دێهاتییەكانی كوردەواریدا.

هەوەها دووژمنایەتی خوێن كە بەردەوام لەهەرێمەكەدا برەوی پێدەدرا، ئەوە وەك خواستێك بوو بۆ تۆڵەكردنەوە لە مردنێك یاخۆ كردارێكی بێ ئابڕوویی. ئەم رەوشی تۆڵە سەندنەوە بەسەر كەسێكدا نەدەسەپا كە لەنێو گەریلاكاندا بەشداربوو لە هێرشێكدا، وەلێ بەسەر كەسێكدا جێبەجێدەكرا كە سەر بەهۆزێك لە هۆزەكان بێت[137].

ژنو زارۆ بەدەر نەبوون لە زەبری هێرشەكان. پەكەكە بۆ كارناسێكی تورك نووسی:" ئەو نەریتە نامۆیە بۆ باشترین جۆر ئیستغلالكراوە".[138] رەنگە بۆ پەكەكە هەمان بایەخی هەبێت، بۆنموونە پەكەكە بەعەشوایی هەڵی نەدەكوتایە سەردێهاتەكان، تەنها ئەو دێهاتانەی بەگیر دەهێنا كە پوڵو چەكیان لەمیریی وەرگرتبوو. بۆنموونە تەنها هەفتەیەك پاش رووداوە خوێناویەكە پەكەكە هەڵی كوتایە سەر سێ گوند لەسنووری پارێزگای ماردین، ئەو گوندانە هیچ پێوەندییەكیان بە میلیشیاكانی میرییەوە نەبوو. گەریلاكان بەسانایی خەڵكی ئاواییەكانیان لەنێوەندی دێكاندا خڕكردنەوەو ناچاریانكردن گوێبگرن بۆ وتارگەلێك كە تێیدا ستایشی جەنگی چەكداریو خەباتی كوردیان دەكرد. كەسێك نەكوژرا، پەیامەكەش روون بوو. ئەو ئاواییانەی كە خۆیان بە هاوپەیمانی میریی نازانن بەلایەنی كەمەوە لە هێرشو هێزی پەكەكە بۆ سەریان دەپارێزرێنو هێرشەكانیش

137 The best analysis on Kurdish tribal structure and behavior remains van Bruinessen's Agha, Shaikh. See pages 64–73 for an overview of the history of blood feuds.
138 Imset, the PKK, 100fn92.

بۆ سەر ئەوانەیە کە بوونەتە بەشێك لەپرۆسەی رامیاریی میریو لە پرۆژەی کرێگرتەییو جاشایەتیدان. ئەم تاکتیکەی پەکەکەیش بەشێوەیەکی بەرفراوان لەپاش کۆنگرەی سێهەمی پارتەکەیان گیرایە بەر.

ئەم هەڵوێستەی پەکەکە لەکاتێکدا بوو کە بەشێوەیەکی راستەوخۆ و بێ لاموجیمی بڕیاریاندابوو کە نیازیان بەوە هەیە دەسەڵاتی خۆیان لە هەرێمەکەدا نومایان بکەن. لەراستیدا بەئامانجگرتنی ئاوایی میلیشیا چەکدارەکانی سەر بە میریی تەنها بەشێك بوو لەو گۆڕانە لە رامیاری رێبازی کاری پەکەکەدا درابوو. ئەوان پیاوانی گەنجیان دەڕفاند، یاخۆ لەکاتێکدا دەیان کەس لەئاواییەکدا دەڕفێنرانو دوواتر بانگەشەی ئەوەیاندەکرد کە ئەوانە پێوەندیانکردووە بەڕیزەکانی پەکەکەوە.

لەراستیدا یاسای سەربازگیریی ناسراوی نێو پەکەکە، دروست تەقلیدێکی بێ چەندووچوونی هێزو ئەرتەشی دەوڵەت بوو، چوون ئەوان بەتۆپزی سەرباز گیرییان دەکرد، هاوکات هەوڵێکیش بوو تا برەو بەهێزی چەکداری پەکەکە بدرێت، چوون بەگوێرەی هەڵسەنگاندنەکانیان لەهەر شوێنێك نێزیکەی چەند سەدکەسێك بۆ زیاتر لە هەزار چەکداریان دەستگیر دەبوو.

بەمجۆرە گەریلاکان لە شەوقو شۆریاندا بۆ بەتۆپزی گرتنی سەرباز لەنێوچەکەدا هەندێکیان هەرکەسێك توانای سەربازی هەبووایە راپێچیاندەکرد.

حوسەین تۆپچیلەر کە ئەوکات شەرکەرێکی پەکەکە بوو، ناسراو بوو بە بۆتان، بۆتان مەڵبەندی سەرەکی هەوادارانی پەکەکە بوو لە باشوری رۆژهەلاتی تورکیادا، ئەو دەیگێڕایەوە: "رۆژێك بە دووربین تەماشام دەکرد، لەناکاو گروپێکی گەورەم بینی بەرەو رووی ئێمە دەهاتن، تێکڕا ئەوان ژنی ئاواییەکان بوون لەنێو بەرگو پۆشاکی رەنگاورەنگدا، بەڕێکەتبوون". ناوبراو لە درێژەی گێڕانەوەکەیدا ووتی:" پرسیم لە هاوڕێکەم ئەوانە کێن؟ ئەویش گوتی: ئەوانە یەکە نوێییەکەی دکتۆر کەنداڵن. حوسەین پێکەنی، گەریلاکان چوونە ئاواییەکەوە هەموو ئەو ژنە

گەنجانەیان گرتن، وەلێ ئەوان ئامادەنەبوون جلو بەرگەکانیان بگۆڕنو چەك هەڵبگرن، هەموو ئەوانە خێزانداربوون، ئێمەیش ڕێگەمان نەدا ئەوان جارێکی دیکە بگەڕێنەوە بۆ نێو ئاواییەکانیان". ئەم سیاسەتە جێگەی مشتومڕو ناکۆکیی بوو تەنانەت لەنێو خودی پەکەکەیشدا. هەندێ لە فەرماندەکانی پەکەکە لەکاردانەوەی پێچەوانەی سیاسەتی سەربازگیریی زۆرەملێدا هەڵوێستیان وەرگرت، بەتایبەت کاتێك نەوجەوانو جەوانەکان دەستیان دابوویە خۆحەشاردانو خۆلادان لە رفاندن، فەرماندەکان ئیدی خۆیان دەبووارد لە جێبەجێکردنی یاساکە. ساری باران کە فەرماندەی هێزێکی سەرەکی ٤٠–٥٠ چەکداردەبوو لە جوکورکای ناوچەی هەکاریدا ناڕازی بوو . ئەوانەی بڕیاریی یەکلاکەرەوەیان دابوو لە نێو کۆنگرەدا، تا ئەوکات نەیاندەزانی بەدرووستی شەڕکردن چۆنو چییە. ناوبراو دەیوت:" یاسای بە زۆرەملێ گرتنی سەرباز ئاواییەکان دەخاتە بەرەی دژمانەوە، کاتێك بەزۆر گەنجەکان راپێچی جەنگ دەکەین ، دوواتر ئاواییەکان کاردانەوەیان دەبێت، ئەو خەڵکانەی لە چنگی ئێمە هەڵهاتوون پێویستبوو لەنێویان بەرین". پەکەکە تەقەلای ئەوەی دەکرد کە کاریگەریی و دەسەلاّتی راستەوخۆی میریی لە هەرێمەکەدا لاوازو بێ هەرەکەت بکات. پەکەکە هۆشداری دابوویە کرێکاری پرۆژە گشتییەکانی وەك چەوڕێژی ڕێگەوبانەکان یاخۆ بڕینەوەی دارەکان پێویستە دەستهەڵبگرن لە کارو بارەکانیان، هەروەها پێیان راگەیەنرابوو ئامێرو کەرەستەکانیان هەموو دەسوتێنرێت. مامۆستاکانیان ئاگادارکردنەوە کە پێویستە هەرچی زووترە هەرێمەکە جێبهێڵن.

ساڵی ١٩٨٨ پەکەکە ٥ مامۆستای کوشت. ئەو مامۆستایانە لەسنووری پارێزگای ماردین هەر لەوشوێنەی رووداوە خوێناوییەکەی پینارچیك روویدابوو

مژووڵی کارەکەیانبوون[139] هاوکات لە شوێنە جیاوازەکانی ناوچەکەدا چەند قوتابخانەو بنکەی تەندروستییان گرتێبەردا. ئاپۆچییەکان پێیانوابوو مامۆستایان سەربازن یاخۆ کرێگرتەی میرییەنو قوتابخانەو بنکە تەندروستیەکانیش وەك جێگەو بارەگای سەربازیین. لەراستیدا سەربازەکانیش هەندێك جار ئەو بیناو شوێنە حکومیانەیان کردبووە شوێنی کاتی نێشکگرتنیان.

هەروەها میریی لەگەڵ وەزارەتی بەرگریدا بەرنامەیان دانابوو بۆ ناردنی مامۆستای سەرباز بۆ ئەو شوێنانە، ئەوەیش لەبەرنامەکەدا وەك ئەکێکی دامەزراندنیانبوو لە پیشەی مامۆستایدا. لەراستیدا ئەم رەوشە وەك بەشێك لە تاکتیکەکانی میریی تەنها یاریدەی پەکەکەیدا تا ئەو باوەڕەیان لاگەلاڵەبێت کە پاساویان هەیە بۆ هێرشەکانیان. هەربۆیە لەو میانەدا چەندین مامۆستا کوژران، لەبەرئەوەی کە تەنها مامۆستان. بەمجۆرە تاکتیکە نوێیەکانو دەستدرێژیی زێدەتری پەکەکە ئاوێتەی سەرکەوتنەکانیان ببوو.

بۆنموونە لەهەوڵ ساڵدا کەپەکەکە ئاوابیەکانی بەئامانجگرت، خواستە نوێیەکانی میریی کەمیانکردو رێژەی پاسەوانەکان دابەزین بۆ دوو لەسەر سێی رێژەی پێشوویانو تەنها ٦٠٠٠ چەکدار مابوونەوە[140]

لەکاردانەوەی رامیاری پەکەکەدا دەوڵەت بە ئەجێندایەکی نوێوە دەستی دایە زیادکردنی موچەی پاسەوانەکانو پێدانی جیهازی بێ سیمو دەسەلاتی فراوانتر، بەمەیش بوونە هێزێکی پابەندترو تۆکمەتر لەناوچەکەدا. لەبەرامبەردا توندوو تیژییەکانی پەکەکەیش گەلێ لە نێزیکەکانی پەکەکەی کردە دوژمنو بەشێك لەدانیشتووانی کوردیشیان خستە بەرەی دژ بە خەباتی پەکەکەوە. حوسەین

---

[139] The TIHV (Turkish Human Rights Foundation) included a comprehensive report on attacks on teachers in its 2001 Turkiye Insan Haklari Raporu.

[140] McDowall, Modern History, 423

دەیگوت: " دەوڵەت هەوڵی دەدا کورد بخاتە بەرەی دژ بەپەکەکەوە، هەر بۆیە پێویستبوو ئێمە نەکەوینە نێو ئەو داوەی کە میریی بۆی دانابووین". پەکەکە هەرچەند تاکتیکگەلی هەمەلایەنەی بەکاردەهێنا وەك ئایدیۆلۆژیاو هزری فرەلایەنە بۆ راکێشانی پشتیوانی بۆ ئەجێنداکەی. ئیدی ئۆجەلان تێگەیشت لەکاریگەرییە نێگەتیڤەکانی هێرشکردنە سەر هاوڵاتیانی بێ چەك، بەتایبەتی وێنای ئەو شەپۆلە بەرفراوانەی نەیارییەتی نەدەکرد، بەتایبەتی لە ساڵی ١٩٨٨دا، هەربۆیە هەر زوو بانگەشەی ئەوەی کرد کە ئەوان دژی کوشتنی بەو جۆرەن‌و دانیشی نا بەوەدا کە هەندێك لە گەریلاکان کەوتوونەتە هەڵەی لەو جۆرەوە[141].

ئیدی لە کۆنگرەی چوارەمی ١٩٩٠دا ئامادەبووانی کۆنگرە تێکڕا دەنگی نارەزاییان لەمەڕ هێرشکردنە سەر هاوڵاتیان بەرزکردەوە، بەو جۆرە بەکەمتر لە سێ ساڵ ئەو رەوتە لەناو پەکەکەدا بەرەو کزی‌و لاوازی چوو. پەکەکە ساڵی ١٩٩١ لێبووردنێکی سنووورداری دەرکرد بۆ ئەو دێهاتیانەی واز لە پاسەوانی سنوور دێنن. هەرچەند هاندەری مادی‌و بێ متمانەیی‌و فشاری بەهێزی میریی رێگربوو لەوەی زۆرێك لەپاسەوانەکان ئەو ئۆفەری ئاشتییەی پەکەکە پەسەندبکەن، وەلێ بەجۆرێ لەجۆرەکان پێشنیاری لێبووردنی پەکەکە رێزوو پێگەی بۆ ئەو گروپە گەڕاندەوە. هاوکات پەکەکە لەسیاسەتی سەربازگیریی زۆرەملێ‌و رفاندنی لاواندا کەڵکی نەبینی‌و دۆڕا، چونکە زۆرجار رفێنراوەکان هەڵدەهاتن، جا بۆئەوەی بەدامەزراوەکانی میریی‌و ئاسایشی بسەلمێنن کە بەخواستی خۆیان نەبووە، چەندین بەڵگەو زانیاری بەسوود لەسەر پێگەو پلانی پەکەکە دەدرایە هێزەکانی ئاسایش.

[141] Milliyet, June 16, 1988. Ocalan told this to Mehmet Ali Birand, the first mainstream Turkish journalist to interview him. The series of articles Birand later wrote was banned before it could run in full.

بەم جۆرە سەربازگیرییەکەی پەکەکە دەستکەوتەکانی پەکەکەی خستە مەترسییەکی بەرچاوەوە، ئەوەیش بەدروستی لە هێرشەکانی سەر ئاواییەکاندا هەستی پێدەکرا. سەلاحەدین چیلیکی فەرماندەی پێشووی پەکەکە دەیووت:"هاوکات رفاندنەکان هانی خەڵکی دا تا پێوەستبن بە پاسەوانانی سنوورەوە تا بتوانن چەك بەدەستبهێنن‌و لەو پێناوەدا زارۆو سامانیان دژ بە پەکەکە بپارێزن". هەر بۆیە پەکەکە بەخێرایی چاوی خشاندەوە بە نەزمی یاسای زۆرەملێدا. لە ساڵی ١٩٩٠داو لەدووەم کۆنفرانسی نەتەوەیی دا لە لەلوبنان بەشداربووان رازی بوون کە یاسای بە تۆپزی گرتنی سەرباز هەڵبسپێرن. لە کۆنگرەی چوارەمی چەند مانگی پاش ئەو کۆنفرانسە. بەشداربووان دەیانگوت دیسان پێداگریی لەسەر ئەو بڕیارە کراوەتەوە. ئەم بڕیارە ئاماژەبوو بەخاڵێك کە دووپاتی دەکردەوە پەکەکە هێند جەماوەرو تەرەفداری هەیە کە چیدی یاسایەکی لەو جۆرە پێویستییەکی ئەوتۆ نییە.

هاوکات ئامادەیی پەکەکە بۆ بەهەند وەرگرتنی رەخنەو خواستی خەڵکی دیسانەوە هۆیەکی دیاری گەشەو گەڕانەوەی متمانەو جەماوەرییبوونەوەی پەکەکە بوو. لەراستیدا بەردەوام ژن‌و زارۆ لە هێرشەکاندا دەبوونە قوربانی‌و تارادەیەکیش بەتۆپزی کەسانێك راپێچی جەنگ دەکران، وەلێ ئەوەی گرنگ بوو گەڕانەوەی متمانەی خەڵك‌و رێزبوو بۆ بنەمای جەماوەر.

ئەو دیاردانە مابوویەوە سەر سروشتی جەنگەکان‌و دەبوو رووبدەن. ئاویی‌و شارۆچکەکانی لێواری چیای جوودیداو لە زنجیرە چیا سەختەکاندا ئۆردوگا گەلێکی گوێزەرەوەو کاتی دامەزراندبوو، لەوێوە رەوشێکی نوێ لەپابەندبوون بەبنەمای کوردایەتی‌و وابەستەییان بەکوردستان‌و رێزو ئەمەکدارییان بۆخەڵك دەستپێکرد. سەرەتا چوار کورد کە دەستدرێژی سێکسیان کردبووە سەر ئافرەتێك لەلایەن پەکەکەوە قۆڵبەستکران‌و لەسێدارەدران. هەروەها پیاوێك کە پارەی دزی بوو لە

چەکدارانی پەکەکە پارەکەیان بە قازانجەوە لێوەرگرتەوە. ئەو تەنها سزادرا بە بڕێك قازانج بەشێوەیەکی فەرمی.

مۆراڵی ئەو ڕووداوو چیرۆکانە ڕۆشنبوو، پەکەکە سەختگیرو سەپێن بوو، وەلێ بەویژدان بوون، کەسانێك کە نەدەهاتنە سەر پەکەکە ڕووبەڕووی گرفتو کێشە نەدەبوونەوە. پەکەکە هەمیشە دەیانووت کە قۆناغی سەرەتای جەنگەکەیان تەنها پڕوپاگەندەبووە بۆ ململانێکانیان، پەکەکە لەو قۆناغەدا تەنها ویستوویانە باوەڕوو شکۆ بۆخۆیان دەستەبەربکەنو بیسەلمێنن کە دارای هێزێکنو دەتوانن ڕووبەڕووی دەوڵەت بووەستن، هەربۆیە لەکۆتایی هەشتاکاندا پەکەکە ئاشکرای کرد کە لەجەنگەکەیاندا لەسەرکەوتندان.

## ئۆج ئالان پێدەگات

ئۆج ئالان وەك سەرکردە کوردەکانی دیکە لەهەرێمەکەدا کەمێك دڵگرمیٚ بوو لەبارەی دامەزراندنی پێوەندیی لەگەڵ ئەو وڵاتانەی کە گەلی کوردیان بندەستکردبوو.

هاوکات پێی وابوو دامەزراندنی پێوەندیی پێویستییەکی هەنووکەییە بۆ ئەوەی پەکەکە جەنگەکەی لە نێوچەکەدا درێژە پێبدات. هەربۆیە ئۆجەلانو سەرکردەکانی پارتەکەی تەقەلای ئەوەیاندەکرد لەگەڵ ئێرانو ئێراقدا کە هاوسنووری تورکیا بوون ڕێگەیەك بۆ پێوەندی بدۆزنەوە. ڕێبەری کوردانی ئێراق مەسعود بارزانی پێوەندییەکی تۆکمەو تەواوی لەگەڵ حکومەتی ئێراندا هەبوو، هەربۆیە پەکەکە بۆ ماوەیەك پێوەندیی لەگەڵ بارزانییان بەکارهێنا تا بپەڕنەوە بۆ نێو قەڵەمڕەوی ئێران. کاتێکیش لە ١٩٨٦ یان ١٩٨٧ هاوپەیمانییەتی نێوان بارزانیو پەکەکە ئاشکرابوو، ئیدی ئۆج ئالان هەوڵیدا پێوەندی ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئێرانییەکاندا دابمەزرێنێت. برابچووکی ئۆجەلان، بەنێوی عوسمان، ئەوەی کە ئەندامانی دیکەی

پەکەکە دەیانگوت، ئەو پولێو یارمەتی لەنێو کرێکارانی کورد لەلیبیا کۆدەکردەوەو دەینارددەوە بۆ ئێران تا پەکەکە پێوەندیی لەوێندەر بونیاد بنێت. لە ساڵی ۱۹۸۷دا پەکەکە رێگەی پێدرابوو کە قەڵەمڕەوی ئێران بۆ راپەڕاندنی کارەکانی بەکاربهێنێت.

هەروەهاماڵگەلێکیان لە باکۆو ئورمییە بۆ رێکخرابوو؛ هاوکات چەند جێگایەکیان لە خۆرئاوای ئێران بنە کردبوو، کە زۆر دوور نەبوون لە سنووری تورکیاوە.

ئەم رێکخستنە نوێیە لە ئێراندا زۆر بەسوود بوو بۆ پەکەکە، چونکە مەترسی لێدان‌و بۆردوومانی تورکیا فرە کەمتربوو وەك لەوەی کە لەباکووری ئێراقدا رووبەڕوویان دەبوویەوە. لەویێ بەغداد نە کۆنترۆڵی تەواوی سنوورەکەی پێدەکرا نە بایەخیشی دەدا بەچاودێری سنوورەکان‌و ئەو بۆردوومانە تاو نا تاوەی کە رووبەڕووی ئۆردوگاکانی پەکەکە دەبوویەوە. وەلێ ئێران بەتەواوی دەسەڵاتی دەشکا بەسەر هەرێمە کوردییەکانیدا.

پەکەکە بەمجۆرە توانی رێگە دوورەکان نزیك بکاتەوەو بەئاسانی بنکەی راهێنان‌و چارەسەری بریندارەکانی لەوێندەربکات. ئیدی دەیتوانی بە لەرێگەی ئێرانەوە ئاسانتر بگات بەباکووری ئێراق‌و رێگە سەختەکانی پێشووی لەبەردەمدا نەمان‌و بەمەش چالاکییەکانی لەناو تورکیادا پەرە پێدا[142]. ئەوان لەلایەن بەرپرسانی ئاسایشی ئێرانییەوە، کەناڵێکیان دۆزیبوویەوەو کات‌و پێناسی تایبەتیان بۆکرابوو تا بتوانن بەئاسانی هاموشۆی ئەو کیشوەرە بکەن. هاوکات توانیان سەرکردایەتی خۆیان لەوێندەر بسەلمێنن‌و بەسانایی لەئێرانەوە بچنە نێوخاکی تورکیا. هەروەها زۆرجار هێزە ئاسایشییەکانی ئێران لەرێگەی ماشینی

[142] A good overview of the PKK's difficulty of holding forced recruits is given in Ozcan, PKK, 121–127.

جێبو کامپۆنەکانیانەوە ئەندامانی پەکەکەیان دەگوازتەوە بۆ شوێنو بارەگاکانیان.

هاوکات لەماوەکانی دوواتردا پەکەکە توانی پێوەندی راستەوخۆ لەگەڵ کوردانی ئێرانیشدا چێبکەن. وەلێ نازانرێ یاخۆ روون نییە ئەوە بە ئاگاداریی یان دەستێوەردانی دەزگای هەواڵگیریی ئێرانیی بووە یان نا. چونکە ئێران لەسەرەتای هەشتاکاندا لەشەرێکی دژواردابوو لەگەڵ کوردەکانیداو تێکی شکاندن، ئێران لەگەڵ سەربەخۆیی کوردا نەبوو چ لە خاکی خۆیداو چ لەهەرپارچەیەکی دیکەدا. بەڵام بەرژەوەندی لەوەدا بوو لەململانێدابن لەگەڵ دراوسێکانیدا، بەتایبەت لەو کاتەدا کە لە ململانێدابوو لەگەڵ دراوسێکانی.

جەنگی ئێرانو ئێراق، بواری دایە تاران تا پشتیوانی جەنگاوەرانی کوردی ئێراق بکات، هاوکات تەنگژەکانی تارانو ئەنکەرە دیسان هەمان بەرژەوەندیی بەخشیە تاران تا خۆی لەگەڵ یاخی بووە کوردەکانی تورکیادا کۆك بکات. ئێرانو تورکیا دوو وڵاتی موسڵمان بوون، وەلێ هەریەکەیان دارای میتۆدێکی جودابوو لە ئاییندارییدا. ئێران وڵاتێکی تیۆکراتی ئایینی بوو، لەهەمانکاتدا تورکیا دەوڵەتێکی توند پێداگر لەسەر سیکۆلارییەت بوو[١٤٣]. هەربۆیە بەرەی جیۆسیاسیی هەریەك لەوی دی فرە جیاواز بوو، چوون تورکیا ئەندامی هاوپێمانییەتی باکووری ئەتڵەسی(ناتۆ)و مێمانوازی بنکە سەربازییەکانی ئەمریکابوو. ئێران ئەو بڕوایەی لەلا دروستکرابوو، کە ئەمەریکا تێدەکۆشێت تا حکومەتی ئیسلامی سەراوخونکات. ئێران نە پێی خۆشبوو نەیارە سیاسیەکانی لە تورکیادا جێگیربن، نەیش ئاسودەبوو بە دەستێوەردانو تەوەغولی تورکیا بۆ باکووری ئێراق. جیا لەو گرفتانە

[143] This section draws on interviews with a number of former Kurdish militants with firsthand information about relations with Iran. Books used include Dagli, Birakuji, 49–57; Ozcan, PKK, 231–237, 262–264; Imset, the PKK, 138, 184, 205; McDowall, Modern History, 272–275, 351–360, and 372–373.

باکووری ئێراق هۆیەك بوو بۆ هاوپەیمانییەتی ئێران‌و کوردانی ئێراق، وەلێ ئامادەیی تورکیا لەو سنوورەدا دەبووە هۆی بەهێزی زێدەتری تورکیا بەدرێژایی سنووری ئێران‌و ئێراق"[144].

لەراستیدا تورکیا هەڕەشەیەکی راستەوخۆ نەبوو بۆ سەر ئێران، وەلێ دەکرا هۆشداری لەوەدا نومایان کردبێت کە هەر وەسیلەیەکی بەردەست بگرێتە دەست تا رەوشەکە بەو جۆرە بهێڵێتەوە. لەبەرامبەر بە رێگەدان بە چوونە ناوەوەی گەریلاکانی پەکەکە بۆ نێو خاکی ئێران، تاران داوای کرد زانیاری لەسەر دامەزراوە سەربازییەکانی ئەمەریکاو تورکیا بەدەستبهێنێت.

تورکیا لەهەوەڵدا توانی زانیاریی لەو ئەندامە نوێیانەی پەکەکە بەدەستبهێنێت کە لە رێگەی سنووری ئێرانەوە دەربازی ئێران دەبوون. ئیدی ئەندامە نوێیەکان لەلایەن بەرپرسەکانی پەکەکەوە لێیان دەپرسرایەوە، ئەم زانیاریانە بۆ پەکەکە بەسوود بوون، چوون لەلایەن دەزگا هەواڵگیرییەکانی ئێرانەوە یاریدەی هاموشۆی ئەندامانی پەکەکە دەدرا. لەراستیدا ئێرانییەکان وردبینیان دەکرد لەمەڕ ناو و زانیاری ئەوانەی دەهاتنە نێوخاکی ئێرانەوە. عوسمان ئۆجەلان بەرپرسی پەکەکە بوو لە ئێراندا، ئەو ناو و نازناوی ئەندامانی ئامادە دەکرد. ئێرانییەکان ئەو زانیارییەیان دەویست تا دڵنیابن لەوەی پەکەکە هیچ زانیارییەکی هەڵە نادەن‌و دەست نادەنە پروپاگەندەو پەیوەندیی لەگەڵ پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران. هاوکات پەکەکە لێیان قەدەغەکرابوو لەنێزیك سنوورەکانی ئێرانەوە هێرشەکانیان بکەنە سەر تورکیا. لە راستیدا ئێران بەردەوام دەنگۆی هاریکاریکردنیان بۆ پەکەکە دەدایە دوواوە. ئەوەیش بۆ کەمکردنەوەی خەیاڵ‌و خشمی تۆڵەی هێزە

[144] Robert Olson, in The Kurdish Question, argues that Iran feared that a Turkish presence in northern Iraq would allow Ankara to exert a destabilizing influence over Iran's Kurdish and Azeri populations.

چەکدارەکانی تورکیا بوو. لە هەمانکاتداو لەچوارچێوەی هاوپەیمانییە ئاڵۆزو گرێخواردووەکانی نێوچە کوردییەکەدا پەکەکە پێوەندی لەگەڵ بەغداد دا دامەزراند.

لەراستیدا هێرشی کیمیایی ئێراق بۆ سەر هەڵەبجەو بەردەوام هێرشە سەربازییەکانی ئێراق دژ بە جەنگاوەرانی کورد هامزەمانبوو لەگەڵ ئاگربەستی نێوان ئێراقو ئێران کە زۆربەی سوپای ئێراق لەنێوچەکانی باکووری وڵات جێگیر ببوون. هەرچەند نێوچە سنوورییەکان ئەستەم بوو بۆ هەر سوپایەك بتوانێت کۆنترۆڵیان بکات. بەغداد نیگەرانی ئەوەبوو کە دەکرێت جەنگاوەرانی کوردی ئێراق دزەبکەنە نێو ئۆردوگا دامەزراوەکانی ئاوارەکان لەنێو خۆی تورکیادا. بەغداد هیواخواز بوو بە جێگیرکردنی گەریلاکانی پەکەکە لەسەر سنوور بتوانێت رێگە بگرێت لە بوونی هێزە کوردییەکانی دژ بە وڵاتەکەی"[١٤٥].

چەند ساڵێکی کەم دوواتر بارزانی رایگەیاندبوو:" زۆرێك لە کوردان کە لەو ناوچانە بوون یان کوژران یاخۆ لە شوێنی خۆیان هەڵکەنران". هەروەها گوتی:" هەر لەهەمانکاتدا سەدام حوسەین مۆڵەتی دابوویە پەکەکە لەو شوێنانەدا جێگیر بن". لە راستیدا رۆشن نەبوو تاچەند رێگە بەمانەوەو فراوانبوونی ئۆردوگاکانی پەکەکە درابوو لە نێوچە چیاییە سەختەکان بەدرێژایی سنووری تورکیا، وەلێ ئەوە روونە کە بوونیان لەو قۆناغەدا شتەکانی بۆ پەکەکە ئاسانو هەموار کردبوو. دیسان لەبەرامبەر ئەوەدا رژێمی ئێراق لەپەکەکەی خواست تا زانیاری لەسەر هێزە سەربازییەکانی تورکیاو تەڤگەری کوردیی ئێراقی کۆبکاتەوە بۆ دەزگا هەواڵگیرییەکانی.

ئازمان سەرکردەی پەکەکە دەیوت:" لەهەندێك شوێنی گشتیدا بارەگاکانی پەکەکە لەهەمان ئەو شوێنانەدا بوون کە بارەگا سەربازییەکانی ئێراقی لێبوون"[١٤٦].

---

[145] Ozcan, PKK, 263fn217

. 21. Talabani recounted the details in Birand's Apo ve PKK, 193–197.

ئەوان زۆرجار دیداریان دەکردو تێیدا زانیارییەکانیان ئاڵو گۆڕدەکرد. زستانێك وەختێك بەهۆی بەفرو بۆرانی سەختەوە هەندێك لە بارەگاکانی سوپای ئێراقی داخران، گەریلاکانی پەکەکە چوونە نێویانەوەو بەکاریان هێنان وەك پەناگەیەك بۆ خۆیان. تامەزرۆیی ئۆجەلان بۆ پێوەندیی لەگەڵ رژێمدا وادیارنەبوو لەئاستی بەرپرسە ئێراقییەکاندا بوو بێت. هەربۆیە پێوەندییەکان تارادەیەك پێوەندیی نافەرمیو لابەلایی بوون، زیاد لەوانەیش پەکەکە پێوەندی لەگەڵ ئێراندا گری دابوو.

بە گوێرەی سەرنجەکانی ئازمان پەکەکەیش ئامادەکاریی فرەی نەکرد بۆ چوونە پێشەوە لەلای ئێراقییەکان. هاوکات لەنێوەندی بونیادنانی ئەم پێوەندییە نوێیانەدا ، ئۆجەلان لەتافەتی زێدەی لەگەڵ جەلال تاڵەبانیدا دەنواند.

جەلال تاڵەبانی ساڵی ١٩٨٦ لەگەڵ نەیارە دێرینەکەی خۆیدا مەسعود بارزانی گەیشتبوونە ئاشتیو هاوکات ئەویش لەگەڵ ئێراندا پێوەندیی دۆستایەتی دامەزراندبوو. تاڵەبانیش هاوشێوەی بارزانی لەلایەن ئێرانییەکانەوە کۆمەکی مادیو سەربازیی دەکراو بەڵێنی لێوەرگیرابوو کە پەیوەندییەکانی لەگەڵ چەکدارانی کوردی ئێراندا بپچڕێنێت[147] .

دیارە کە پێوەندیی پەکەکەو بارزانی لەناچاریدابوو، گەر نا لە رووی کردارییەوە هەڵوەشابوویەوە، پەکەکە لەدووی پێوەندییەکی بەدیلدا دەگەڕا لەنێوچەکەدا، کە بواری ئاسایشییان مسۆگەربکات. بۆیە پێوەندیی تاڵەبانی لەگەڵ تاراندا کە ئەوکات لە دانوستاندا بوون. بوارێکی لەبەردەم قوڵکردنی پێوەندی نێوان پەکەکەو تاڵەبانیدا درووستدەکرد.

درووست لە ١٩٨٦دا مەسعود بارزانی داوای لە پەکەکە کرد کە نێوچەکانی ژێر کۆنترۆڵی پارتەکەی چۆڵبکەن. لەم میانەدا ئۆجەلان نامەی نارد بۆ تاڵەبانیو

[147] McDowall, Modern History, 351.

پێشنیازی کاری پێکەوەیی خستبووە پێشچاوان. سکرتێری یەکێتی نیشتمانی کوردستانیش هەمیشە پشتیوانی کردبوو لە بیری هاوپەیمانییەتی لەنێوان گروپە کوردییەکاندا، هەربۆیە بەهەلی دەزانی رەوشی رووداوە خوێناوییەکانی ناو تورکیا راستبکاتەوە کە کاریان کردبووە سەر شۆهرەتی شۆڕشگێڕان لەتورکیا. لە ئۆکتۆبەری ١٩٨٧دا دروست حەوت مانگ پاش کۆتا هاتنی وادەی پێوەندییەکانی پارتیو پەکەکە. تاڵەبانی دیداری لەتەك نوێنەری پەکەکەدا لەباکووری ئێراقدا سازدا.

ئەو خواستی کە پێش هەموو شتێك پەکەکە هێرشەکانی بۆ سەر هاوڵاتیانی مەدەنی کۆتا پێبهێنێتو بەگشتی تێرۆریزم رسوابکەنو هێرشە فیزیکیو زارەکییەکانیان دژ بە گروپە کوردییە نەیارەکانی دی بوەستێنن. ئەوەبوو لە سەرەتای ١٩٨٨ هەردوو لەسەر جیاوازییەکانیان دەستیان دابوویە کارکردن، هەربۆیە لە مانگی سێی هەمان ساڵدا رێکەوتننامەکەیان واژۆکرا. رێکەوتنەکە هاوشێوەی رێکەوتنی پێشووی ئۆجەلان لەتەك بارزانی پەیمانی پشتیوانی هاوبەش بوو تا زیاتر لەوەی یەکبوونی دوو گرووپ بێت. رێکەوتنەکە پێداگری کردبوو لەسەر نەبەردیی جودا لە هەر گروپێکداو پێداگریی دەکرد لە سەر کۆتا هاتن بە نارازیبوونەکانیانو پێویستی وەدو کەوتنی پرسی نەتەوەیی دەوڵەتی کوردیی.

تاڵەبانی روونی کردەوە:" ئێمە رزای بووین بەم رێکەوتنە، لەبەر ئەوە رێکەوتنێکی گرنگ بوو بۆ تەڤگەریی کوردیی". رێکەوتنەکە پاش دوومانگ لە هێرشی کیمیایی بۆ سەر هەڵەبجە کۆتایی پێهێنرا. دیارە لەوکاتەدا تاڵەبانی کەمێك دەیتوانی لەبەرامبەر پەکەکە بێتە پێشەوە. هێرشەکانی سوپای ئێراق بۆ سەر پێشمەرگەو هاوڵاتیانی مەدەنی بەشێکی گەورەی هەرێمەکەی لەچنگ تەڤگەری کوردیی دەرهێناو هەمانکات بوارێکی بەرینتری بەجێهێشت بۆ تەراتێنی هێزەکانی پەکەکە لەناوچەکەدا.

ئیدی ئۆجەلان تێگەیشت لە گۆڕانکارییەکانی هێز لەناوچەکەدا، هەربۆیە پێوەندییەکی جیای لەتەك بەغداد دا دەستپێکردو بەزوویی کاری کرد لەسەر هێرشێکی زارەکیو جەلال تاڵەبانی تۆمەتبارکرد بە کارکردن بۆ لەبەینبردنی پەکەکە بە پێشنیهادەکانی ئەمەریکاو تورکیا. هەربۆیە لە خەشمو رقەوە رێکەوتنەکەی نێوانیانی لەساڵی ۱۹۸۹دا هەڵوەشاندەوە، رەخنەکانی ئۆجەلان لەناو هەموو بابەتەکانی دیکەدا کورتکرابوویەوە لەوەدا کە ئەوان لەجیاتی سەربەخۆیی کوردستان خوازیاری ئۆتۆنۆمین بۆکورد[148].

تاڵەبانیش بەهەرحاڵ سیاسەتمەدارێکە، ئەو زیاد لە تورەیی‌و خەشمی ئۆجەلان نائومێد بوو بەوبادانەوەی ئۆجەلان لەبەرامبەریا دەستی دابوویە. هەمانساڵ تاڵەبانی لەدیدارێکدا رایگەیاند:" گەر ئۆجەلان بتوانێت هەموو کوردستان ئازادبکاتو سەربەخۆیی کوردستان دەستەبەر بکات، ئەو کات هەموو ئێمەیش وەك سەرۆکی هەمووان دەیناسین، وەڵێ ئەو ناتوانێت هیچ شتێك بکات، کاتێك ئێمەیش لەتەمەنی ئەودا بووین هەر هەمان شتمان دەووت، ئیدی دوواتر هەمووان تێگەیشتین کە چ دەکرێت ئەنجامبدرێتو چ شتێکیش ئەستەمە"[149].

## سنوورەکانی رامیاریی تورکیا

لە دەستپێکی ۱۹۸۸ دا، پەرلەمانتارانی کورد لە چەپی نێوەندی پارتی جەماهیری سۆشیال دیموکرات، بە کەڵك وەرگرتن لە پێگەکەی خۆیان داوایان لە سیاسییەکان کرد کە قەدەغەکارییەکانی سەر کورد کۆتایی پێبهێنن.

ئیرین، ئەوەی لێدووانە نەخشە بۆدارێژراوەکانی بە پارتەکەی رانەگەیاندبوو رایگەیاند:" کێشەی کورد پێویستە هەموو گۆشەکانی بگرێتەوەو پێویستە بە تێرو تەسەلی موناقەشەی لەبارەوە بکرێتو چارەسەری واقیعی بۆ پێشنیار بکرێت".

---

[148] Birand, Apo ve PKK, 197.
[149] Birand, Apo ve PKK, 198.

هەروەها وتی:" تا ئێستا بەرنامەیەکی گونجاو بۆ چارەسەری پرسی کورد نەخراوەتە ڕوو، هەمیشە نکوڵی لە بوونی کورد دەکرێت"[١٥٠]. هێشتا ئیرین لە وتەکانی نەبوویەوە قاڵەقاڵو بگرەو بەردە سەریهەڵدا. ئیدی نوێنەرانی پارتی نیشتمانی دایك لە باڵی ڕاسترەوی ناوەند کە پارتی باڵادەست بوون، هەوڵیاندا ناوبراو لەسەر میمبەرەکە دابەزێنن، ئەوان بەکێشان بەسەر مێزەکانیاندا هەرایان نایەوەو یەکێك هەستایە سەرپێو دەیقیژاند، هەروەها یەکێکی دیش تفی کردە ئیرینو نوێنەرانی دیکەی پارتی گەلی سۆشیال دیموکرات.

هەر لەوێدا وەزیری نێوخۆ سوور بوو لەسەر خوێندنەوەی ئەو بڕگەی دەستووری بنچینەیی تورکیا بەدەنگی بەرز، کە نووسراوە:" هەموو هاوڵاتییەك لە توورکیا تورکە". وادادەنرا ناوبراو بۆ یادخستنەوەی ئیرین ئەوەی بڕگەیەی خوێندبێتەوە. بۆ ڕۆژی دووایش سەرۆکی پێشووی کۆدەتاو سەرۆکی ئەوکاتی وڵات کەنعان ئیفرین فرە بەسانایی ڕایگەیاند:" ئەگەر ئەوە بەو جۆرەیە، کە من بیستم، ئەوە شتێکە من ناتوانم قەدەغەی کەم"[١٥١].

بەڵام هەوڵەکانی ڕژێمی سەربازیی پێشوو بۆ پێکهێنانەوەی هەستی سیاسیی تورکیا بوو، لەو سیاسەتەدا دەستکرابوو بە بەخشینی فەزایەك بۆ هەردوو نەوەی کۆنو نوێی سیاسییەکانی تورکو کورد[١٥٢]. بەهۆی ڕیفراندۆمێکی گشتییەوە لە سێپتەمبەری ١٩٨٧دا هەموو کۆتو بەندەکانی سەر بەشداری سیاسیی سەرکردەی پارتە سیاسییەکان هەڵگیراو هاوکات دوو مانگ دوواتر هەڵبژاردنێکی نەتەوەیی

---

[150] TBMM (Turkish Parliament), Tutanak Mudurlugu, Birlesim: 10, Tarih: 19/1/1988. Copy provided by Mehmet Ali Eren. See also Cumhuriyet, Jan. 20, 1988, for coverage of the speech.
[151] Milliyet, Jan. 21, 1988.
[152] This section draws heavily on an interview with Mehmet Ali Eren. Published sources include Ahmad, Modern Turkey, 194–197; Olmez, DEP, 55– 109; McDowall, Modern History, 357–360; and Cumhuriyet and Milliyet newspa- pers (January 1988).

ئەنجامدراو هەندێك لە پاسەوانو پلەدارە کۆنەکان گەڕانەوە نێو پەرلەمان. هەروەها پارتی نیشتیمانی دایکیی سەرۆك وەزیران تورکۆت ئۆزال دیسان زۆرینەی دەنگی بەدەستهانییەوەو پارتی سۆشیال دیموکراتیش کە ساڵی ١٩٨٣ قەدەغە کرابوو، توانیان جارێکی تر وەك دووەم گەورە پارتی تورکیا بچنەوە نێو پەرلەمان.

لەراستیدا هەمیشە کورد لەلایەن پارتە چەپڕەوەکانەوە سەرنجیان راکێشراوە. پەرلەمانتارەکانی سۆشیالْ دیموکرات بڕێکی کەم لە کوردی رۆشنبیر پێکهاتبوون، هەندێك لەوانە لە حەفتاکانو سەرەتای هەشتاکاندا لەبەندیخانەبوون یاخۆ دەستبەسەربوون.

ئۆزال کەسێکی تەکنۆکرات بوو، ئەو دەستی دایە سیاسەتو وەك سیاسییەك لە پڕ رووبەڕووی ئۆپۆزسیۆنێکی کاراو بەهێز بوویەوە، هەوڵەکانی ئۆزال لە پێناو دابینکردنی ئابووریەکی ئازادبوون ئەو دژی یاسا توندەکانی رژێمی سەربازی بوو کە گەلێ لە نوێنەران نیازیان بوو برەویان پێبدەن. بەزوویی نوێنەرانی کورد بەتایبەتی ئەوانەی لەنێو پارتی کۆمەڵگەی دیموکراتی بوون، هەوڵیان دەدا ئاڕاستەی گفتوگۆکان بگۆڕن بەرەو باسی ئاڵۆزییو نائارامییەکانی باشووری رۆژهەڵاتو ئەو کۆتو پێوەندانەی لەسەر شوناسی کورد دا سەپاون.

ئێرین کە پارێزەرێکی تەمەن ٣٧ ساڵ بوو، لەنێو لیستی پارتەکەیدا لەپلەی یەکەمدا بوو، سەبارەت بە وتارەکەی گوتی:"ئامانجی من لە وتی ئەو وتارەدا چوونە ناوەوەی پرسی کورد بوو بۆ پەرلەمان". هەروەها گوتی:" من وەك پارێزەرێك توانام نەبوو کۆمەڵگە بگۆڕم، وەلێ بڕیارم دا بچمە نێو سیاسەتەوە، لەو رێگەیەوە دەمتوانی کاریگەری فرەترم هەبێت".

ئێرین لەکاردانەوەی پەرلەماندا هیچ سەرسامنەکرا، ئەو دەیووت:" ئەوان دەکرا هەوڵیان بدایە بۆ بلۆك کردنی من". ناوبراو لە بڕوایەدا بوو کە وتارەکەی هەیەجانو تورەیی زێدەتر بەدووی خۆیدا دەهێنێت. ئەو لە لێواری بەشێکی راقی

ئەستەمبوڵداو لە شوێنێکی تەنگەبەری ئیشی پارێزەریەکەیدا دانیشتبوو، دەیووت:" من باش ئاشنای نێوچەکەم، رێکخستن‌و میتۆدی پەکەکەیش چاك دەناسم، ئالودەو ئاشنای رەوشی تورکیاشم". هەروەها دەیگوت:" دڵنیام جەنگو جەڵەبە زەبرو زیان دەگەیەنێت بە هەردوو نەتەوەی کوردو تورك، هەربۆیە دەمەوێت رێبگرم لە هەر جەنگ‌و کوشتارێك، پێم وایە ئەم رەوشە تەها لە واتاکانی دیموکراسیدا دەکرێت چارەسەریی بۆ بدۆزرێتەوە، گەر پەرلەمانتارەکانی دیکە کێشەکە بگرنە ئەستۆن بەدڵنیاییەوە دەکرێت رێ لەجەنگ بگیرێت".

لەدرێژەی قسەکانیدا ئەوەی روونکردەوە کە لەجیاتی رێگەی ئاشتی لەپەرلەماندا پێچەوانەکەی روویدا، ئەو دەیووت:" من دارای کێشە گەلێك بووم لەپەرلەماندا، بواریان نەدەدا قسەکانم بکەم، لەلایەن خودی پارتەکەمەوە پەراوێز خرابووم". ستوون نوسێکی رۆژنامەیەکی بەنێوبانگی تورکیا ئیرینی تۆمەتبارکرد و بەشێوەیەکی نەخوازراو تۆمەتی تێرۆریستی هەوڵدان بۆ دابەشکردنی تورکیا درایە پاڵی.

ئۆکتای ئیسی هەر لەو میانەدا نووسی:" تەنانەت لەتورکیادا کەمینەی کوردیش بوونی نییە". هەروەها نووسی:" ئەوان هەندێك لە تورکەکانن کە وابیردەکەنەوە یاخود رازین بەوەی کە زادەی گروپێکی ئیتنی ناسراو بەکوردن"[153]. نێزیکەی ساڵێك دوواتر نوێنەرێکی دیکەی کورد بەنێوی ئیبراهیم ئاکسۆی لەلایەن پارتەکەیەوە لە ئەندامییەتی هەڵپەسێردرا، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە وتارێکی داوە بۆ پەرلەمانتارانی ئەورووپاو تێیدا رەخنەی لە ئەدای سیاسی تورکیا گرتبوو بەرامبەر بە رەوشی کورد. ئەو تەنها حەسانەی پەرلەمانتارییەکەی پاراستی لەوەی کە تاوانی جوداخوازی نەدرێتە پاڵ.

---

[153] Hurriyet, Jan. 22, 1988.

تورکوت ئۆزال لەو وەختەوەی هاتبووە نێو کایەی سەرۆکایەتییەوە ئەوەی دووپاتکردبوویەوە کە ئەوانەی گەرەکیانە وڵات دابەش بکەن، ئەوانە دەستی دەرەکین‌و لەدەرەوە وزەیان پێدەدرێت[١٥٤]. ناتەوانی دامەزراوە سیاسییەکانی تورکیا یاخۆ رەفزی هێنانە پێش باسی دۆزی کورد لە تورکیادا چاوەڕێکرابوو. دانەدوواوەی شوناسەکانی دی لە میتۆدی تورکیادا ریشەدار بوو بە هزری کەمالیزم کە دارای جەماوەرێکی چەسپاو بوو، هەر باسو خواسێك لەمەڕ شوناسی گەلان باسێکی بێ بنەماو پێچەوانە بوو، هەربۆیە پێویست بوو خۆی لێ لابدرێت.

لەوکاتەشدا کۆدەتای سەربازی تورکیا نوێ بوو، هەرچەند کە سوپا لە کاروباری سیاسییدا کێشرابوویەوە، وەلێ بوونی خۆی لە نێو ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیدا نومایان دەکرد، هەر بۆیە جارجار پرسو دۆزی کورد وەك ناونیشانی خواستێکی تێرۆریستی دەهێنرایە پێشچاو.

سیاسییەکان بەشی ئەوەندە بەئاگابوون لە رووبەرووبوونەوەی نەزمی سەربازییدا بۆ دۆزی کورد. بوونی سێ کۆدەتا لەنێوان سالآنی ١٩٦٠ بۆ ١٩٨٠ نموونەیەك بەس بوو بۆیان تا بزانن سوپا دەکەوێتە چ رەوشێکەوە کاتێك بزانرێت رەوشی نێوخۆی وڵات لەمەترسیدایە.

وەلێ لەدەرەوەی وڵاتدا میتۆدو هزری نوێ فرە بەدروستی ئاڕاستەی نێوخۆ دەکرایەوە[١٥٥]. لە ئۆکتۆبەری ١٩٨٩ دا لەنێو پەیمانگای کوردیی پاریسدا کەندال نەزان مژوڵی راهێنان بوو وەك فیزیاناس‌و کەسێکی نەرمو نیان لە ئەدای هزری‌و سیاسیدا ، ساڵی ١٩٧١ لە تورکیادا قوتاریبوو، لەدەرەوە توانی هەوەڵین کۆنفرانسی کوردیی نێونەتەوەیی ببەستێت، کەندال کەسێکی ناسراو و خۆشەویست

---

[154] . Cited in Olmez, DEP, 60.

[155] For details of the conference, see the Institute's Bulletin: "Interna- tional Conference on the Kurds" (February 1990).

بوو، کۆنفرانسەکە لەژێر سەرپەرستی گروپی مافەکانی مرۆڤدا بوو کە خاتوو دانیاڵ میتەرانی هاوسەریی سەرۆکی فەڕەنسا بەڕێوەی دەبرد.

دەستەیەك لە چالاکوانانی کورد و نوێنەرانی پارتەسیاسییەکانو سیاسەتمەدار هامڕا لەتەك شارەزایانی بیانی بانگهێشتکرابوون بۆ کۆنفرانسەکە بۆ قسەکردن لەسەر گرفتاریی کوردان ، بەتایبەتی کوردانی ئێراق.

ئێراقو ئێران لەمانگی هەشتی ۱۹۸۸دا ئاگربەستیان واژۆکردبوو. لەهەمانکاتدا و لەسەروبەندی کۆتایهاتنی جەنگدا ئێراق دەستی دابوویە هێرشو هێزێکی ئێجگار توند بۆ سەر چالاکوانانی کوردو چەکدارە کوردەکان. پاش گرتنی شارۆچکەی هەڵەبجە لەلایەن هێزە کوردییو ئێرانییەکان پێکەوە، هێزەکانی ئێراق هێرشی کیمیاییان کردە سەر شارەکە، هاوکات گرتنی دەستە جەمعیو لەسێدارەدانو کوشتن لەوانە منداڵو زارۆ تەواوی شارو شارۆچکەو ئاواییەکانی گرتبوویەوە.

بەگشتی لەو رەوشەدا نێزیکەی ۲۰۰۰۰ کەس کوژرانو یەك ملیۆنو نیو لەماڵەکانیان هەڵکەنرانو راگوێزران، ئەو راگوازتنە ئێراقییەکان وەك شاڵاوی ئەنفال نێو زەدیان کردبوو. هاوکات سەدان هەزار ئاوارەی وڵاتانی دی بوون، لەوانە ۶۰۰۰۰ روویان نا بەرەو تورکیاو ئەوانی دیکە بەرەو ئێران. کەندال هیوای خواست کۆنفرانسەکە هۆیەك بێت تا نەخشە رێگایەك بۆ چارەی گرفتی کورد بخاتە روو، هاوکات بتوانێت سەرنجەکان بەرەو کێشەکانی کورد رابکێشێت لە ناوچەکەدا. لەناو ئامادە بووەکاندا ۳۰ پەرلەمانتاری تورکیا بانگێشتکرابوون کە حەوتیان پەرلەمانتاری کوردی پارتی کۆمەڵگەی دیموکراتی بوون[١٥٦]. هاوکات ئەردال ئینۆنۆی رێبەری پارت لەهەوەڵدا رێگربوو لەبەشداریکردنی ئەندامەکانی لەوەها کۆبوونەوەیەکدا، ئەو دڵنیانەبوو لەوەی چی دەقەومێت، ترسی ئەوەی هەبوو

[156] Details on events before and after the conference are found in Olmez, DEP, 67–84.

رووبەڕووی رەخنەی جەماوەری تورك بێتەوە. نوێنەرانی حزب هۆشدارییەکەی ئینۆنۆیان بەهەند وەرنەگرت.

وەختێك دەگەڕانەوە لە کۆنفرانسەکەدا، رۆژنامەکانی تورك لەدووی رەوشەکەوە بوون‌و پێش لیژنەی ئینزیباتی پارتەکە ئامادەبوون. ئیدی چەند هەفتەیەك پاش ئەوە هەمووان لەپارتەکە دەرکران، ئەوەیش بەبیانووی ئەوەی کە بەشدارییان کردووە لەچالاکییەکی سیاسیدا کە پێچەوانەیە لەگەڵ میتۆدو دیسپلینی حزبدا.

ئەرین کە لە کۆنفرانسەکەدا ئامادەبوو، هۆکارەکانی پارتەکەی کورتکردەوە لە سەرەتا دا وتی:"پارتەکە، پارتێکی کەمالی بوو". بڕیاری پارتەکە بووە هۆی کاردانەوەیەکی سەرتاسەری کوردان لەوڵاتداو سەرۆکی شارەوانی ١٢پارێزگا لە باشوری رۆژهەڵاتی تورکیا دەستیان لەکارکێشایەوەو شەپۆلێکی توڕەیی توندی بەدووی خۆیدا هانی.

لە راستیدا ئەوە تەنها کوردەکان نەبوون ناڕازی بەبڕیارێکی لەو جۆرەی پارتەکەبوون. بەڵکو هەندێك لە تورکەکان، بەتایبەتی ئەوانەی لەبازنەیەکی چەپڕەوەوە هاتبوونە نێو پارتی سۆشیال دیموکرات پرۆتستۆی ئەو بڕیارەیانکرد. هەربۆیە چەندین ئەندام پەرلەمان لەتورك‌و لەکورد بڕیاری دەستلەکارکێشانەوەیان پێشکەش بە پارتەکە کرد.

لەچەند مانگێکی دواتردا هەموو ئەو ئەندامە سەربەخۆیانە لەتەك ئەندام پەرلەمانگەلێکی ناڕازیی پێوەندییان گرت‌و لەبارەی چۆنییەتی هێشتنەوەی کاریگەریان بەسەر ژینگەی سیاسی وڵاتەوە کەوتنە وتوویژ. لە تێگەیشتنی ئەواندا ئەوە روون‌و رەوان بوو کە بۆ چارەکردنی پرسگەلێك کە رووبەڕووی تورکیا بوونەوتەوە، لەسەرووی هەموویانەوە دیموکراتیزەکردنی تورکیاو کێشەی کورد، ئەوا ئاتاج بە بوونی پارتێکی سیاسی نوێ لە گۆڕێدابوو.

چەپرەوە تورکەکان رازی بوون بە پارتێکی نوێ کە میتۆدێکی جودای لەمەڕ پرسی کورد لەهەگبەدا بێت، هاوکات پێشبینی دەکرا پارتەکە بتوانێت هەموو ئاریشەکانی تورکیا لە کارنامەیدا گردبکاتەوە لەئابوورییەوە بۆ ژینگەی وڵات. لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ دەرکردنی نوێنەرە کوردەکان. دەنگۆی پارتە وێیەکە بڵاوبوویەوە، نوێنەرە کوردەکان بەهیوای چارەسەریی گرفتو لەخۆگرتنی بەرژەوەندییەکانیان لەو پارتەدا خۆیان رێکخستبوو.

بەو جۆرە سییەکانی کورد لە دووی فرسەتێکی نوێدا دەگەڕان تا تموحی نەتەوەییان دەستەبەربکات. دەستلەکارکێشانەوەی دەستە جەمعی سیاسییەکانی کورد لە هەرێمەکەدا ئاماژە بە خەملێنی کادێر گەلێکی ئامادەو بە ئەزموون بوو کە نە پشتیوانی پەکەکەو خەباتی چەکدارین نەیش رێگەی توندو تیژییان قبوڵە، ئەوان دارای خواستێکن لە دیموکراتییەتدا جێی دەبێتەوەو چارەسەری ئاشتیانەی پرسی کلتوری‌و نەتەوەیی کوردیان لە کارنامەدایە.

بەمجۆرە لە دەنگۆی پارتە نوێیەکەدا هەندێك لە هەوادارانی تورکچێتی هەستی نیگەرانی لەمەڕ زیادبوونی ئاوڕدانەوە لە گرفتی کورد نائارامی کردبوون. لەراستیدا ئەو هەستە بەکاوەخۆ لەنێو تەڤگەری تورکچییەکاندا هێور دەبوویەوە[157] ئایدین جۆفون غورکان کە ئەندامێکی کاراو دیاری نێو پارتی سۆشیال دیموکراتبوو، پێشبینی کرابوو ببێتە سکرتێری گشتی پارتە نوێیەکە، ئەو نیگەرانی خۆی لەوەدا دەردەبڕی کە پێکهاتەی پارتە نوێیەکەیش نێجگار بەرتەسك‌و داخراوە. غورکان پێشنیازی کردبوو کە کاتێکی زێدەتر بدرێت بە هەوڵدان بۆ فراوانکردنی بنکەی

[157] This section draws on Olmez, DEP, 85–109, where the interactions between Kurdish and Turkish supporters of the planned new party are described in detail. I also relied on interviews with Kurdish politicians Mahmut Kilinc, Mehmet Ali Eren, Serafettin Elci, and Mehmet Emin Sever; the views of former PKK militants Selim Curukkaya and Zeki Ozturk; and rival Kurdish leader Kemal Burkay.

جەماوەری پارتەکەو رایەڵە جەماوەرییەکانی بەرینبکرێن، وەلێ ئەو هەوڵانە بەهەند نەگیران، هەر بۆیە غورکان هەر زوو دەستی لەکارکردن لەگەڵ ئەو گروپە نوێیەدا کێشایەوەو دانیشت.

هەر رۆژ ئەندامێکی دیکەی چەپی تورك لە نێو پارتەکەدا دەستی لەکار دەکێشایەوە. مەحمود کیلینچ کە سەرۆکی شارەوانی ئادیامان‌و ئەندامی پارتی سۆشیال دێموکراتبوو، دروست لەپاش کۆنفرانسی پاریس دەستی لەکار کێشابوویەوە. ئەو دەیووت:" ئەندامانی تورك رۆژ لەدوای رۆژ لەنێوماندا نەدەمان، ئیدی گروپەکەمان لە تێڕوانینی ئەواندا پارتێکی شێوە کلاسیکی بوو، زێدەتر کوردبوون بەسەریدا زاڵ بوو، ئێمە تارادەیەك هەمووشمان کورد بووین".

لە ٧-٧-١٩٩٠ پارتی کاری گەل بەشێوەیەکی فەرمی لەتورکیادا دامەزرا. پارتەکە لەیسەر پێشنیازی کارناسانی بۆ تەواوی گەلی تورکیابوو، هەر بۆیە وادانرابوو کە سەرۆکی پارتەکە تورك بێت‌و سکرتێری گشتیشی کوردێك بێت. بەمجۆرە پارتەکە لە بواری رەسمییەتدا پارتێکی کوردی نەبوو. لەیاسای پارتە سیاسییەکانی تورکیادا بوونی هەر پارتێکی کە بانگەشەی ناوچەگەرایی‌و رەگەزی لەخۆگرتبێت قەدەغەبوو. بۆنموونە بانگەشەکردن بۆ مافی تایبەتی کوردو فەرهەنگ‌و وێژەی کوردی‌و هاندان بۆ بوونی زمانێکی دیکە جگە لەتورك لە چوارچێوەی ئەو قەدەغەکارییانەدا بوون.

ئەوە یەکەم پارتی سیاسی فەرمیی کوردیی بوو لە مێژووی تورکیا، کە بە بەکارهێنانی مەکری زمانەوانی بۆ خۆلادان لە یاسا قەدەغەکارییەکانی تورکیا دامەزرابوو. لەسەرەتادا رۆشن نەبوو چلۆن پارتەکە شۆڕ دەبێتەوە بۆ نێو جەماوەر. لەدەستپێکی ١٩٩٠دا پەکەکە زیاتر گەشەی کردبوو، هەندێك کورد لە لاوانی کوڕو کچ لەو باوەڕەدا نەبوون کە رژێمی سیاسی خواستەکانی کوردو خەباتی یاسایی کوردان جێگەبکاتەوە. هەر بۆیە لە سەرەتادا میتۆدی پەکەکە لەمەڕ

پارتێكی لەوجۆرە بایەخێكی گاڵتەجارو بێ ئەرزشی پیشاندا. هەربۆیە جەنگخوازانی یەكەكە پارتەكەیان بە پرۆژەیەكی میریی دەزانیو پێیان وابوو بوونی پارتێكی لەو جۆرە پێویست نییەو جگە لە بەفیڕۆدانی كات هیچی دیكە نین. ساری باران كە یەكی

توندوتیژیەکانی پەکەکە بە سەرچاوەی گرفتەکە بزانن. لەو دەمەدا راستی بانگەشەگەلێك لە گۆڕێدابوو، کە پشتیوانی بۆ پەکەکە ریشەدارکرابوو بە نائومێدیی خەڵك لە ناسیۆنالیزمی کوردیی. هاوکات ئەنکەرە هەمیشە ئەو راستیەی دەدایە دواوە کە گرفتی پەکەکە وەك گرفتی هاوڵاتیانی رەسەنی وڵاتەکەی بزانێت، ئەمە ببوە بنەمایەك‌و لەنێوەندە سیاسییە جۆربەجۆرەکانی میرییەوە ئیدی هەنگاوی واقیعی بۆ چارەسەری گرفتی جەماوەرییبوونی پەکەکە نەدەنرا[158].

موحەمەد عەلی بیراندی رۆژنامەنوسیی بێلایەن‌و نێزیك لە رەوشەکەوە پێی وابوو کە ئەو کوردانەی کە ئاتاجیان بەهاریکارییو یارمەتی رژێم بوو بەرەبەرە ببوونە هاوسۆزی پەکەکە. جیا لەوەیش میری رێڕەوی سەرکوتگەرانەی خۆی دیسان لە نێوچەکەدا درێژەپێدا. یاسای عورفی لەهەرێمەکەدا گۆڕرا بۆ حوکم‌و رەوشێکی کتوپڕ، ئەویش شێوە یاسایەکی سەربازی بوو کە لەلایەن بەرپرسێکی هەرێمیی دامەزراوەوە تایبەت بەڕێوە دەبرا.[159]

لە ئاماژەیەکی روون‌و رەواندا حکومەت پیشانی دا کە پروپاگەندەی جەنگەکەی دۆڕاندووە. چوون حکومەت لە بەهاری ١٩٩٠دا بڕیارێکی دەرکرد کە حاکمی هەرێمێکی بۆی هەیە هەربڵاوکراوەیەك قەدەغەب کات کە هەڵە رووماڵی رووداوەکان بکات لە ناوچەکەدا. لەراستیشدا رووماڵکردنی دروستی رووداوەکانیش واتە خستنە رووی نیازو تێروانینی میریی لەمەڕ هەر رووداوێك.

هاوکات فەرمانداری ناوچەکە بۆی هەبوو هەر چاپەمەنییەك لە هەرکوێیەکی وڵات بێت دابخات‌و هەرکەسیش بیویستایە دەیتوانی بەبێ ئاگادارکردنەوەی پێشوەخت

---

[158] Milliyet, April 19, 1988.
[159] The provinces were Bingol, Diyarbakir, Elazig, Hakkari, Mardin, Siirt, Tunceli, and Van. In 1990, the newly formed provinces of Batman and Sirnak were added. Adiyaman, Bitlis, and Mus also fell under emergency rule as "neighboring" provinces.

دووریبخاتەوە[١٦٠]. لەو ماوەیەدا بە کاوەخۆ ٤١٣ بڕیار تەعدیلکران، لەچەند مانگی دووای ئەو رەوشەدا بەهۆی پرۆتستۆکردنەکانی سۆشیال دیموکراتەکانەوە دیسانەوە روانینی کوردان بۆ پرۆسەکە پایەداربوویەوە. ئەوە لەکاتێکدا بوو کە دەوڵەت هیواداربوو بوونی کورد لە وڵاتدا بداتە دوواوە. هاوکات ئەو هەستە درایەوە بەپەکەکە کە تەنها توندوتیژیی لەئێستادا زیاد لەهەمووکاتێکی رابردوو رێگەیە بۆ ئاوڕدانەوەی میریی لەخواستە رەواکانی کورد.

## تۆفان (١٩٨٨-١٩٩١)

زەکی ئۆزتورك کە دوواتر بە ئازامان ناسرا، پێش ئەوەی پێوەندیی بکات بە پەکەکەوە پارێزەر بوو. تارادەیەك بەهۆی فشاری باوە گەورەیەوە سکوڵی یاسای هەڵبژاردبوو. ئەو لەساڵی ١٩٨٥دا دەستی دابوویە پراکتیکی پیشەکەی. دووساڵ دووای ئەوەی رژێمی سەربازی واز لەدەسەڵاتی وڵات بهێنێت. ناوبراو بەتەواوی نائومێد ببوو. ئازامان دەیگوت:" شتێك کەمن رووبەڕووی بیوومەوە فرە جیاواز بوو، من وابیرم دەکردەوە. لەلایەکەوە یاسا گەلێك هەبوون، وەلێ بەبێ ئازادییەکی راستەقینە، لەلایەکی دیکەوە هەموو رۆژێك یاساگەلێکی نوێ لەدەرکردندا بوو، کە هەموو چالاکییەکی سیاسیی‌و رۆژنامەگەریی‌و رێکخستن‌و گردبوونەوەو تەنانەت پارتی سیاسی تورکیشی سنوردار کردبوو.

لەبەر ئەوە شانازیەك لە گۆڕێدا نەبوو بۆ ئەوەی بتونین پارێزەر بین". پاش ساڵێك کارکردن لە ئەنکەرە. ناوبراو گوازرایەوە بۆ شاری ئەنتاڵیا لەسەر لێواری دەریای میدیتەرانە.

---

[160] Further details on Decree 413 and the effect on the Turkish media are found in Helsinki Watch, Destroying Ethnic Identity (Sept. 1990), 13–18.

له ئەنتالْیا کۆمەڵگەیەکی کوردیی تەواو گەورە هەبوو، رەنگە بەهۆی ئەوەوە بووبێت کە کارو فەرمان لەوێندەر بەهۆی رەوشی گەشتیارییەوە فرە بووبێتو ئیش بەسانایی دەدۆزرایەوە.

لەویٚ ئازمان لەتەك هاورێکانیدا دەستیان دایە وتوویژ لەبارەی پەکەکەوە. زۆربەی ئەوان وەك ئازمان دارای هەستێکی لایەنگیریی بوون بەرامبەر بە پەکەکە. دیارە ئازمان وەك قوتابیەکی کوردی خوێندنی ئامادەیی لە کۆتایی هەفتاکاندا سەرسامبوو بە نەزمی ناتوندوتیژی کەمال بۆرکای لە پارتی سۆشیالیستی کوردستان پەسەکە دا. وەلیٚ لەتورکیا چالاکی سیاسیی بەپێی پێویست ئەنجامنەدەدرا.

ئازمان ئەو رەوشەی روونکردەوە، ئەو بەردەوام بەزمانێکی بەرزو پرۆفیشناڵ وەك پارێزەرێك دەدووا:" پارتەکەی بۆرکای پێداگری لەسەر ریفۆرمی سیاسیی دەکرد، وەلیٚ لەو قۆناغەدا وادیار بوو خەباتی بیٚ چەك ئەستەم بێت"، هەروەها پێداگری دەکردو دەیوت:" لەم قۆناغەدا کرانەوەی دێموکراسی لە تورکیادا نییە". هێشتا بەرگریو جەنگی چەکداریی لە گۆرێدابوو، ئەوە سەرەرای ئەوەی کە نیگەرانییەکی ئێجگار زۆر لەبەرامبەر پەکەکەدا لەگۆرێدابوو. ئایزمان بیرکردنەوەیەکی ئێجگار توندی لەلا گەلاڵە ببوو. لەلایەکی ترەوە پەکەکە هێزە مەدەنییەکانی خۆی ناردبوویە سنووری خۆرئاوای وڵات تا کار بکەن بۆ پێکهێنانی ئەندامی نویٚو هێزی مرۆییو هەروەها گەیاندنی ئەو رەوشەی کە لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیادا دەگوزەرێت"[161].

لەباشووری رۆژهەڵاتی تورکیادا دەستراگەیشتن بە چاودێری کوردان فرە ئەستەم نەبوو. دەنگو زرمەی فیشەكو تەقەکردنەکان لە نێوەندی شارەکانەوە دەبیسترا.

---

[161] 1. The lack of census data based on ethnicity makes it impossible to know the real number of Kurds living outside the Kurdish region, but it gen- erally is thought to be about half the country's overall Kurdish population

زیادبوونی دەوریاتە سەربازییەکانی رژێم ئەو بانگەشانەی پەکەکەی پشتڕاستدەکردەوە، کە کوردستان داگیرکراوە. کوردەکان دەبوو زۆرجار بە پەکەکەو هەوادارانی پەکەکەو چالاکییەکانیان لە نێوچە کوردییەکاندا ئاشنابن‌و فرەجار لەکاتی سەردانی نێزیکەکانیاندا پێکدەگەیشتن. وەلێ لەنێوچەکانی خۆرئاوادا کە ملیۆنان کورد لەوێندەر دەژیان، بەهۆی دەستکەوتنی هەلی کارو باخۆ دوورکەوتنەوە لەتەنگژەکانی نێوچە کوردییەکان روویان لەوێ نابوو، دووربوون لەماجەراکانی نێوچە کوردییەکان. پەکەکە دەبوو شتانێك بکات بۆ کەمەندکێشکردنەوەی ئەوانیش بۆ پرسی کوردایەتی.

لەوێندەر هەم پەکەکەو هەم جەنگەکەی رەنگو ڕووی فرە دوور بوو، ئەو زانیاریانەیش لە راپۆرتە هەواڵییەکانی تورکیاوە دەگەیشتن، بەتەواوی ئاراستەیان گۆڕابوو بەرەو خواستو بەرژەوەندی میریی. دیارە ئەو گرفتانەی رووبەڕووی شوناسی نەتەوەیی کوردی دەبوونەو ئەو قەدەغەکاریانەی کەهەبوون، دروست هاوشێوەی ئەو نەزمە بوو کە رووبەڕووی چالاکوانە دێموکراتیی خوازەکان دەبوونەوە. مێزگردو موناقەشەکان لەمەڕ خراپبەکارهێنانەکانی مافی مرۆڤ لەلایەن هێزەکانی پۆلیسەوە بلاوەیان پێدەکراو هاوکات ئەشکەنجەو ئازاری دەستبەسەران فرە باو بوو، ئەو بلاوکراوانەی چەپڕەوەکان کە پرسی کوردیان دەگرتە خۆ، بەتەواوی رووبەڕووی ئاستەنگە یاساییەکان ببوونەوە.

هاوکات دادگاکان رێگەیان نەدەدا هاموشۆی بەندکراوەکان بەشێوەی پێویست بکرێت. ئازمان باش دەیزانی کە داواکاری گشتی هەوڵدەدات هەڵەیاساییەکان دژ بە ئەندامانی پەکەکە بەدروستی بخاتە ڕوو. ئەوان هەمیشە بە ئازمان پێدەکەنین‌و بەشۆخییەوە پێیان دەگوت جەخت بکاتەوە سەر بڕیارێك‌و بڵێت لێرە یاسا بەرقەرار نییە.

ساڵی ١٩٨٨ ئیدی لەکۆمەڵگە کوردییەکانی خۆرئاوادا چالاکوان‌و میلیشیا مەدەنییەکانی پەکەکە لەخۆرئاوای تورکیادا کەوتبوونە خۆ. ئازمان بەمجۆرە باس دەکات:" لە ئەنتالیا تەنها ئاشنایەکمان هەبوو، ئەو دێهاتییەك بوو، کەسێك بوو بێئاگا لە ژیان. ئەو نوێنەری رێکخراوێکی نایاسایی بوو، ئیدی ئەمە هۆیەك بوو تاپریشکێکی لە بەرژەوەندی هەندێك لە ئێمە تەواو بێت. ئازمان بەجدی لێنەوییی بە پێوەندی کردن بە جەنگێکی سەرکەشانەوە.

هەروەها دەیگوت:" من دارای گەلێ پرسیار بووم لەگەڵ خۆمدا، بەڵێ دەمتوانی ببمە کەسێکی پاسیڤ، دەکرێت ببمە پەکەکەو دەکرێت ببمە بیۆکراتێکی دەوڵەتیی. ئیدی بەدیلێك نەبوو، بەڵێ رێگەیەکی دی شك نەدەبرا". بەمجۆرە هەر لە ١٩٨٨دا ئازمان وازی لە پیشەی پارێزەرییەکەی هێناو پێوەندی کرد بە پەکەکە وە. خەڵکی خەباتی چەکدارییان وەك دوا مەنزڵ هەڵبژاردبوو. ئەوە هەوەڵێن هەڵبژاردن نەبوو، لە ئەورووپاو لە ئەمەریکا ئەو رێگەیە وادیاربوو نامۆو سەیربوو، وەڵێ بۆ کەسێك کە لەهەلومەرجی رۆژهەڵاتی ناویندا بووایە رەوشەکە جودا بوو، لێرە لەتورکیادا کرانەوەی دێموکراسی لە گۆڕێدا نەبوو.

جەنگی پەکەکە هەلێك بوو تا سەرنجی هەموو ئەوانەی راکێشا کە هەوڵیاندابوو، یاخۆ شکستیانهێنابوو لە بەرپاکردنی شۆڕشدا لەنێو گروپە کوردییەکانی دیکەدا. ئەحمەد .هـ کە لەساڵی ١٩٧٩دا وازی لە زانکۆ هێنا، هەروەها لەبەرئەوەی ئەندامی دەنگی کاوە بوو دەستگیرکرا، ئەو دەیووت:" پاش ئەوەی ساڵی ١٩٨٧ لە زینداندا مەرەخەس بووم، بینیم تەنها گروپێك کە مابێتەوە پەکەکە یە، هەموو ئەوانی دیکە کۆتاییان پێهاتوو".

ناوبراو کاتێك لە زیندان ئازادکرا تەنها تەمەنی ٣٧ساڵبوو، لەدرێژەی باسەکەیدا دەیگوت:" کاتێك ئازادبووم دەنگی کاوە نەمابوو، رێکخراوی کاوەیش کۆتایی هاتبوو، ئیدی گەیشتمە بڕوایەك تەنها رێگەی ئاپۆ دروستە". ناوبراو پاش

ئازادبوونی رووی کردە خۆرئاوای وڵاتو لە فەتحییە گیرسایەوە، بەهیوای دەستگیربوونی کارێك لە رێستورانتی ئاشنایەکیدا. ئیدی بەزوویی چاوی بە هەندێك لە چالاکوانی پەکەکە کەوت کە ساڵی ١٩٨٦ نێردرابوونە هەرێمی ئیجە بۆ هەماهەنگیو چالاکی لەو سنوورەدا. ئەحمەد دەگێڕێتەوە:" ئەوان داوایان لێکردم کە لەگەڵیان بمو بچمە ماڵەکانیانو بەشداربم لە گردبوونەوەکانیان".

بەمجۆرە ناوبراو دەستی دایە هاوکاریی پەکەکە لەساڵی ١٩٨٨دا. ئەحمەد دەیوت:" من بەهەیەجانەوە دەمڕوانییە خەباتی گەریلا. لە پەکەکەدا ئارەزووی تۆڵەکردنەوە دژ بە دەوڵەت لەگۆڕێدابوو، هەر ئەوەبوو منو هاوەڵەکانمی راکێشا تا هاریکاریی لەگەڵ پەکەکەدا بکەین". لەگەڵ ئەوەشدا تەواوی گروپەکانی دی لەمەیدانەکەدا پێچرابوونەوە.

سیاسەتی پەکەکە لەبەرامبەر نێوەندە شارییەکانی خۆرئاوای تورکیا، سەرنجی گەلێ لە قوتابیانی زانکۆکانی بۆ لای خۆی راکێشا. لە حەفتاکاندا قوتابیانی زانکۆو ئەومامۆستایانەی لە راهێناندا بوون، دارای جەوهەری گروپەکە بوون. وەلێ کاتێك جەنگی چەکداری لە بەشە دێهاتییەکانی باشووری رۆژهەڵاتدا دەستی پێکرد، لەسەر دەستی ئەو کوردانە بوو کە لە ئاواییەکانەوە کەمەندکێشکرابوون.

لە هەوەڵدا، قوتابیانی کورد لە هەشتاکاندا عەزمیان جەزمکرابوو لەسەر هەڵسەنگاندنی دۆزیی نەتەوەییو ناسیۆنالیستی، ئیدی بۆ ئەوان گرنگ نەبوو ئایا پێویستە پشتیوانی لە پەکەکە بکەن یان نا. ئەیهان سیفتسی کە لە خێزانێکی سەروەتمەند گەورەببوو بەمجۆرە رەوشەکەی روونده‌کردەوە:"کاتێك ساڵی ١٩٨٦ گەیشتمە زانکۆی ئەستەمبوڵ، لە شاری ئەستەمبوڵدا هیچ رێکخستنێکی پەکەکە نەبوو، فشاری میریی بەردەوام توندو سەختگیر بوو".

هاوکات دەیگوت:" ئێمەی قوتابی لەمشتومڕی ئەوەدا بووین کە پێویستە چی بکەینو ، چیشمانکردووە لە توێژینەوە لەبارەی دۆزی کوردەوە". هاوکات رووداوە

سیاسییەکان لە نێوچەکەدا ببووە هۆی ئەوەی کە قوتابیانی کوردو کوردانی روانینێکی نوێیان هەبێت لەسەر ئەوەی ئەوان ئیدی چۆن لەلایەن میرییەوە مامەڵەیان لەتەکدا دەکرێ. لە وڵاتی بولغاریای دراوسێدا دەوڵەت لەرێگەی کەشتییەوە بە ناچاریی کەمینە تورکەکانی ئەوێی کەمەندکێش دەکرد بۆ تورکیا. نارەزاییە بەهێزەکانی ١٩٨٩ وەك تۆفانێك وابوو لەبەرامبەر کورداندا، ئەوانیش رووبەڕووی هەمان رەوشو روو ببوونەوە لەتورکیا. کیمیابارانی هەڵەبجەو بێدەنگی دنیا لەئاست ئەو تاوانەدا ئەو راستیەی دوپات کردەوە کە کورد ناکرێت هاوپەیمانی وڵاتێك بن تا بیانپارێزێت. هەر بۆیە ئەو پارتە سیاسیانە کە خوازیاری رێگەی ئاشتی بوون بۆ چارەی گرفتەکان، قوتابیانی زانکۆکانیان بۆ رام نەدەکراو دارای گرفتگەلێکی شێوازی خەبات بوون لەگەڵیان.

سیفتیسی دەیوت:" سروشتی گفتوگۆکانمان پەلکێشی دەکردین بۆ ئەوەی باس لە کوردستان بکەین". هەروەها دەیگوت:" رەوشەکە تا ئەوکات لەبارنەبوو بۆ قسەکردن لەوبارەوە، دەوڵەت خواستی بوو بمانکوژێتو بمانتوێنێتەوە". لەو دەمەدا ئەندامێکی دێرینی پەکەکە بەنێوی (ه) لە رێگەی ئاشنا دێرینەکانییەوە لە شاری ئەستەمبووڵدا کاری کرد تا پێوەندی لەتەك قوتابیانی زانکۆدا چێبکات. هەموو ئەو قوتابیانە هاوسۆزی پەکەکە بوونو ئەوانە بوون لە نارەزاییە بچوكو خێراکاندا لێرەو لەوێ دەردەکەوتنو قۆڵبەستدەکران. (ه) کاریکرد تا بەچەند شێوازێکی جیا سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی رابکێشێت. بۆ نموونە داوای دەکرد جێگەی کەسێك بکەنەوە بۆ چەند شەوێك لەبەشە ناوخۆییەکاندا یاخۆ جانتایەکی بۆ هەڵبگرن تا چەن رۆژێك.

هەموو ئەوانە وادەردەکەوت کە بایەخ بە پەکەکە دەدەن، وەلێ ئەم نێزیکبوونەوەی (ه) لەوەدا بو ئایا ئەوان دەیانەوێت بەشداری بکەن یاخۆ نا. ئەو لە رێگەی زنجیرە پرسیارێکەوە کە دەربارەی تەمەنو نوسینو بەشداری

خۆپیشاندان‌و وازهێنان لەخەبات بۆچوونەکانی هەڵدەسەنگاند. سیفتیسی سەبارەت بە توندی رێوشوێنەکانی رێکخستنی پەکەکە دەگێرێتەوە:" هیچ رێیەك بۆ قوتابیانی زانکۆ نەبوو گەر بیانویستایە کاری یاسایی بکەن، کەواتە رێگەکە رۆشن بوو، جارێکیان هاورێیەکم گوتی دەمەوێت بتبینم، کاتێك کە چوومە دیداری داوای لێکردم کە پەیوەندی بکەم ، ئەو بەرپرسی هەماهەنگی ئەندامە نوێیەکان بوو، ئیدی منیش گوتم باشە".

## دەرهاویشتەکان

ئۆجەلان‌و فەرماندەکانی تری نێو پارتەکەی ئامادەی ئەو نەزمی مشتومڕو نیازە هزرییەی نێو ئەندامە نوێیەکانی پەکەکە نەبوون. ئەندامانی نوێ لە کۆتایی هەشتاکاندا وەك شەپۆلێك روویان لەپەکەکە نا، ئەوان پسپۆڕو قوتابی‌و خەڵکی خۆنەواربوون‌و خۆیان یەکلایی کردبوویەوە بۆ پرس‌و جۆ لەسەر بابەتە هزرییەکان‌و نەزمی ناسیۆنالیزمی کوردیی، ئەوان ئاسان نەبوو بۆ یان ژینگەی توندی سەربازی پەکەکە هەرس بکەن، چاوەڕوانی ئەوان بۆ پەکەکە یان مشتومڕی سنگفراوانانە بوو یاخۆ گفتوگۆی ئازاد. هەندێك لەوان کە هەلومەرجی دژواری شاخیان چەشت، ئیدی ویستیان وازبهێنن‌و قوتاربن. ئەوانی دی بێزارو بێ تاببوون لە وانەکانی راهێنانی سیاسی‌و ئەو شیکارە کۆمەڵناسیانەو وێژوویانەی ئۆجەلان کە دەبوو بێ لام‌و جیمی پەسەندیان بکەن.

بەوتەی خەباتکارێك کە لەو قۆناغەدا پێوەندی لەگەڵ پەکەکە بەستبوو:"ئەو قوتابیانەی کە هاتبوونە ریزەکانی پەکەکەوەو بەئاگابوون لە دەورووبەرو دنیا، دروست وەك گومانلێکراوێك تەماشایان دەکرا". هەروەها گوتی:" ئەوە هەوەڵبار بوو کە خەڵکێکی زۆر هاتبوونە ریزەکانی پەکەکەوە، هەربۆیە ئامادەییەکی لەبار بۆ

ئەو بارودۆخە نەکرابوو". هەروەها دەیوت:" هەرکەسێك لەو قۆناغەدا وەك بەکرێگیراوێك تەماشا دەکرا".

سالّی ١٩٨٩ ئۆجەلان ڕێنومایی دەرکرد بۆ فەرماندەکانی پەکەکەو هۆشداریی دایە ئەندامان لە ئەگەری کرێگرتەیی زۆرێك لەو ئەندامە نوێیانەی کە هاتبوونە نێوپەکەکەوە بۆ ئەوەی پشێوی بخەنە ناو ڕێکخستنەکانەوە. هەندێك لە خەباتکارەکان دەیانوت:" ئۆجەلان وتبوویی، چاودێری ورد بکەن، دەکرێت بەکرێگیراوو ناپاك لە ریزەکانتانا بن".

هەر بۆیە یەکێك لەخەباتکارەکان ئەو رەوشی بەدگومانییەی بە پارانۆیا نێودەبرد هەر بۆیە لەو قۆناغەدا، واتە لە ١٩٨٩–١٩٩٠ بەلایەنی کەمەوە ٢٥و نێزیکەی ٥٠ بۆ ١٠٠ گەریلا بەگومانی غەیانبوونو ناپاکی یاخۆ بەتاوانی ناپاکی لەسێدارەدران. بەمجۆرە لەهەرشوێنێك بوونی پەکەکە هەبوو بێت ، ئیدی لەوێ کوشتو بڕ روویداوە. بۆ نموونە لە ئەکادیمیامی مەعسوم قرقماز لە دۆڵی بیقاعو کەمپە سەرەتاییەکانی نێو تورکیاو لە ئۆردوگا شێوە هەمیشەییەکانی نێو تورکیا کە هاو سنوور سنووری ئێراقبوون تاوانەکان ئەنجامدەدران[١٦٢]. سالّی ١٩٨٩ نێزیکەی ١٠ قوتابی زانکۆی خەڵکی شاری ئیسکی لە خۆرئاوای تورکیا، پاش ئەوەی پێوەندییان کرد بەریزەکانی پەکەکەوە لە باشووری رۆژهەلاّتی تورکیا بە تۆمەتی کرێگرتەیی بۆ میریی لە سێدارە دران[١٦٣].

---

[162] . This section relies on interviews with PKK militants active at the time. Because of the sensitivity of the subject, I withheld all names. General information on internal executions are also drawn on the interviews in Buldan, PKK'de Kadin; from the history of the PKK in Celik, Agri; from the brochures issued by PKK members who broke away in 1991 and formed PKK-Vejin; and in the limited report on internal executions made at the PKK's 5th Congress, published in PKK 5. Kongre Kararlari, 257–264

[163] This incident, with slightly different details, also is recounted by the late PKK militant Ersoz in her diary, Gurbet'in Guncesi, 143.

مەوحەمەد ناوێك كە پێشتر قوتابی زانكۆی ئەنكەرەبوو، بەرپرسی تۆماری قوتابییە نوێیەكان بوو، هەموو ئەوانەی بە ئاشكرا ناساندبوو، هەمووشیانی رێكخستبوو لە یەكە سەربازییە جوداكانی باشووری رۆژهەڵاتی وڵاتدا. بۆنموونە یەكێك لە هۆیەكانی تۆمەتباركردنیان بریتی بوو لەوەی كە یەكێك لە قوتابییەكان خوشكی ئەفسەرێكی پۆلیس بوو، ئیدی ئەمە بەس بوو بۆ ئەوەی ئەوو هەموو ئەوانەی لەگەڵی بن نەفرینیان لێبیكرێتو بەناپاك لەقەڵەم بدرێن. ئیدی بە هەر هۆیەك بووایە هەر قوتابییەك لەسێدارە دەدرا، گەر لە ماوەی ئەو چەند رۆژەدا پێوەندیی بەیەكە چەكدارییەكانی خوێندكار یان خوێندكارەی ناپاكەوە بكردایە. تا وەختێك ئەو رێنومایيانەی پەكەكە كۆتاییان پێهات، مەهمەد لەكەمپێكی نێزیك سنووری ئێراق بەنێوی جوجوركا مابوویەوە، ئەو لەتەك قوتابیەك بەنێوی هایری كە خەڵكی دیاربەكر زیندوو مابوونەوە، دوواتر تەوای چیرۆكەكەیان بۆ قوتابییە هاو كۆلێجەكانیان باسكردبوو، من هەموو ئەوانەم لە مەهمەت وەرگرت كاتێك كە لە شوقە تایبەتییەكەیدا بوو لە ئەڵمان.

یەكێك لە خەباتكارەكانی پەكەكە كە سەردەمێك شوێنی باڵای لەپەكەكەدا هەبوو، دەیووت:" پەكەكە قوتابی ئامادەیی نەبوو بۆ قوتابی وەك ئەوانە، ئەوە شتێكی ئاسایی بوو، هەموو ئەو لەداردانە نێوخۆییانە، هەندێكجار رەوشەكە فرە ترازیدیایەكی كۆمیدی بوو". لەپایزی ١٩٨٩ دا ئەم فەرماندەیەی پەكەكە بەردەوام بوو دەیگێڕایەوە كە لە كۆنفرانسی پەكەكەدا بووە لە بۆتان. لەوێ فەرماندرابوو بەلەسێدارەدان بۆ كەسانێكی دیاریكراو كە تۆمەتباربوون بەوەی نێردراوی میرین یان ناپاكن. ناوبراو بەردەوام بوو لە گێڕانەوەكانی بەم جۆرە: یەكێك لەوانەی كە قۆڵبەستكراو پاشان كوژرا، پیاوێك بوو بەناوی كارسو. بۆ رۆژی دوواتر هەواڵیان هێنا كە كارسو بینراوەو نەكوژراوە، وەلێ گەریلاكان سووربوون لەسەر ئەوەی كە كارسویان كوشتووە، تا دوواییی بۆیان دەركەوت كە ناوەكانیان تێكەڵكردووەو

کەسێکی دییان بەهەڵە کشتووە. ئەمەیش ئەو راستییە نیشان دەدات کە نرخی کەسێك چەند نزمو نەوی بووە لە نێو ئەو تەڤگەرەدا.

هەموو کەسێك دەربارەی ئەو شتانە ئاشنایی هەبوو، وەلێ لەسەر بنەمای ئەو بیرکردنەوەی کە دەڵێ چۆن خۆم بپارێزم، تۆ نەتدەویست خۆت تێوە بتلێنی. لەراستیدا شێوەی کوشتن ناتەبابوو لەگەڵ ئەو شێوازەی پەکەکە بۆ لەنێوبردنی کەسانی ناکۆکو نەیار دەستی دابوویە. ئەو شێوازە لەچەند ساڵی پێشووی ئەکادیمیای موحسین قرقماز لە شیوی بوقاع دەستی پێکردبوو. هاوکات ئۆجەلان ترسی هەبوو لەو شەپۆلی نێوتۆمارکردنەی ئەندامان کە لە ساڵانی ١٩٨٦-١٩٨٧ لە ئەورووپاوە رووی لەپەکەکە نابوو. ئۆجەلان لەخەمی لەدەستدانی کۆنترۆڵی حزبەکەیدا بوو.

یەکێك لە ئەندامانی پێشووی تەڤگەری پەکەکە کە ئاگاداری هەندێك لە کوشتنەکان بووە. ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە ئۆجەلان بۆخۆی فەرمانی دەرکرد یاخود بەشێوەیەکی پەنهان ملی دابوو بۆ کوشتنی نێزیکەی بیست لەو ئەندامە نوێیانەی کە تازە هاتبوونە نێو ریزەکانی پەکەکەوە. لە راستیدا هەرگیز هۆکارەکان روون نەبوون.

هەندێك لەو ئەندامە نوێیانە داوایانکردبوو بیانێرنەوە بۆ ماڵێ، هەندێکی دیکە لەو ئەندامانە کەوتنە ژێر نیازپیسیو گومانەوە بەهۆی تەمبەڵییان یاخۆ بەهۆی هەندێك هەڵسوکەوتی گوماناوی شاراوەوە. هەروەها دووان لە ئەندامانی پێشووی پەکەکە کە ئەوێ دەم لەوێ ببوون، ئاماژەیان بۆ ئەوە دەکرد کە جیا لەو دەیان ئەندامە کرێکار گەلێکی کوردی فرە تر لە لوبناندا تۆمەتبارکرابوون بە هەوڵدان بۆ لاوازکردنی گروپەکەو ئاماژەدرابوو بەسزادانیان یا کوژرابوون. هاوکات یەکێك لە شایەت حاڵەکان پێی وابوو:" دەکرێ ئەو کوشتنانە وەك راهێنانو وانە وتنەوەیەکی پراکتیکی ئەنجامدرابن یاخۆ وەك ترساندنو هەرەشەکرن". لەراستیدا هەندێك

لەخەڵکی بڕوایان بەو ڕەوشە هەبوو، هەندێکیش بەکارهێنرابوون، لەهەردوو حاڵەتەکەدا کەسێك نەیدەتوانی شتێك بڵێت یاخۆ نەیدەتوانی بەرەو کوێ بڕوات‌و خۆی قوتارکات. لەسێدارەدان‌و کوشتنەکانی شیوی بیقاع لەساڵی ١٩٨٩دا گەیشتنە لوتکە، ئەوە لەکاتێکدا بوو قوتابیانی زانکۆ بەلێشاو ڕوویان لە ئۆردوگاو کەمپەکان نابوو.

ئۆجەلان فەرمانی دابوو بە هاوکارەکەی لە ئەکادیمیا تا تەحقیق لە ئەندامە نوێیەکان‌و شوناسیان بکات، ئەوانەی کە بەدەست ئەنقەست نێردرابوون تا ڕەوش‌و ڕووی پەکەکە پشێو و پەرتەوازە بکەن. ئیبیك کە ژنێکی خەباتکاری تەمەن ٢٧ ساڵ بوو لە کەمپەکەدا، بەمجۆرە ڕەوشی پڕ هەرومەرج‌و ژینگەی ترسناکی کەمپەکەی باسدەکرد:" گروپگەلێك لە شارەکان‌و زانکۆکانەوە هاتبوون، زۆربەی ئەوان کە وەك بەکرێگیراو ئاماژەیان بۆکرابوو، گەر بۆ ڕۆژی دوواتر تەماشای دەوروخولی خۆتبکردایەن دەتبینی هەموو ئەوانە برابوون"[١٦٤].

بەڕێوەبەرانی ئۆردوگا کە ڕێوشوێنێکی توندیان گرتبوویە بەر بۆ ئەوەی وا لەو کەسانە بکەن دانبنێن بە کرێگرتەییاندا، لەوانە نەزمی ئەشکەنجە بەگشتی ڕەچاودەکرا. سەلاحەدین چیلیك فەرماندەی پێشووی پەکەکە ئاماژەی دا بە ڕەوشەکە:" ژمارەی بەکرێگیراوان، ئەوانەی ئاشکرابببوون، زیادکرابوون، بۆ ئەوان گۆڕی بەکۆمەڵ ئامادەکرابوون"[١٦٥].

هەموو ئەوانەی کە لەو دۆخەی بیقاع کە بە هستریای پەکەکە ناسرابوو، بەشدار بوون، دیسان هەمان شێوازیان لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیەو باکووری ئێراقدا دووبارەکردەوە. فەرماندەی پێشووی خەباتکارانی پەکەکە ئەوەی خستە ڕوو:" لەژینگەیەکی وادا هەمووان لەترسدا بووین، هەرکەسێك لەوی دیکە بەگومان بوو".

---

[164] Buldan, PKK'de Kadin, 110–111
[165] Celik, Agri, 161.

هەروەها وتی:" خەڵکی بۆ ئەوکارە راسپێردرا بوون". لە درێژەی وتەکانیدا ئەوەیشی وت کە ئەو کارە لە هەنگاوی هەوڵدا تایبەتمەندی پەکەکە بوو، ئەوە شتانێك بوون کە لەو رەوشەدا روویاندەدا. وەلێ دوواتر ئۆجەلان تێگەیشت کە بەربلاوی کوشتارو ناوزەدکردنی ئەو هەموو بەکرێگیراوە لە ریزەکانیاندا بەجۆرێك لە جۆرەکان ئاماژەی لاوازی پارتەکەی نیشاندەدات‌و کوشتنەکانیش کاریگەریی دەکەنە سەر شۆرەت‌و دیسپلینەکانی پارتەکەی.

لە دەستپێکی ١٩٩٠دا حەسەن بیندالّی هاورێی منداڵیی بەهۆی تەقەکردنی هەوانتەوە لەلایەن بەرپرسی ئەکادیمییەوە کوژرا.

شاهین بالیك لەماوەی مەشقی سەربازیدا هۆیەك بوو تا نەزمی سەرزەنشتەکانی ئۆجەلان بگۆرێت[166]. ئۆجەلان بانگەشەی ئەوەی کرد کە شاهین بەدەست ئەنقەست دەستڕێژی کردووە، ئەوەیش هێرشێکی بەرنامەدارێژراوە بۆ سەر سەرۆکایەتییەکەی، هەربۆیە شاهێنیان خستە زیندانەوەو لەئاکامی دادگایکردنەکەیدا سزای مەرگیان بە گوللەبارانکردن بەسەردا سەپاند. هاوکات ئۆجەلان شاهینی بەوە تۆمەتبارکرد کە لەپشت تەواوی کوشتن‌و لەسێدارەدانەکانەوە بووە لە نێو ئەکادیمییەکەدا.

ئەوە لەکاتێکدا بوو کە شاهین لە بەرپرسایەتیدا بوو لەو ئەکادیمییەدا. ئەو دەم ئۆجەلان شاهینی وەك مونەسیق دیاریکرد بوو. لەو میانەدا رایسپاردبوو تا کۆڵینەوە لە ئەندامە نوێیەکانی ناو پەکەکە بکات. ئۆجەلان ئەم نەخشەیەی بەکارهێنا تا لە نەزمی کوشتن‌و لەسێدارەدانی ئەندام‌و گومانلێکراوەکان بکشێتەوە. بەگشتی لەو قۆناغەدا لە شیوی بیقاع بەلایەنی کەمەوە ١٢ ئەندامی نوێ لە ریزەکانی پەکەکەدا بە تۆمەتی هەڵسوڕاویی بۆ دەرێ، لە سێدارە دران، ئەوانی دیکەیش تۆمەتبارکران، وەلێ لەنێویاننەبردن. هەر لەهەمان ساڵدا ئۆج ئالان

[166] Background on the Bindal-Balic affair is given in Celik, Agri, 160–163.

فەرمانی دەرکرد بە کۆڵینەوە لەبارەی کوشتارو کوشتنەکانی نێوخۆی تورکیاو لەو میانەشدا لۆمەو لەتمەی لەگەڵ لە سەرکردەکانی پەکەکە دا، لەوانە جەمیل(هۆگر)ئیسیک، ئەو یەکێك بوو لە فەرماندە هەرێمییەکانی پەکەکەو لە ریزەکانی پەکەکە هەڵهاتبوو، پەکەکە دوچاریکردبوو بە تێوەگلان لە کوشتن‌و لەنێوبردنی هاوڵاتیانی مەدەنی لەنێوخۆی تورکیا دا.

هەر لەو میانەدا ئەنجومەنێك پێکهێنرا بۆ کۆڵینەوەو گردکردنەوەی زانیاریی لەمەڕ ئەو کوژراوانەو لە کۆنفرانسی چوارەمی کۆتایی ئەو ساڵەشدا زۆربەی ئەوانە وەك شەهیدی گیان بەختکردوو دژ بە تورکیا نێویان لێنرا. یەکێك لە فەرماندەکان دەیگوت:"کوشتارەکە هێند زۆر نەبوو بوو، وەڵ گەشتبوونە ئاستێك کە ئۆجەلان هەوڵی دەدا تارادەیەکی دیاریکراو چارەسەری ئەو دۆخە بکات".

لەهەمانکاتدا رێبەرە سەربازییەکانی پەکەکەیش هەوڵیاندا کۆنترۆڵی چالاکی‌و نەزمی لەسێدارەدان بکەن لە مەیدانەکەدا، ئەوەیش بە فەرمانێك بوو کە بۆهەوەڵجار لە دادگاکانەوە گیرابوویە بەر. یەکێك لەو ئەندامانەی پەکەکە کە بۆخۆی شایەتی یەکێك لە دادگاکان بووە لەساڵی ١٩٩١ دا دەیوت:" لەراستیدا کاریگەریی ئەمە فرە کەمتر بوو. نەزمی دادگاکان کەم‌و کوڕ بوو، لەکاروباری رۆژێکدا، تەنها تۆمەتبارێك دارای ئەوە نەبوو کە مشتومڕ لەبارەی تاوانەکانی بکات. گەر تۆمەتبار بیویستایە شتێك بڵێت بۆی نەدەلوا، رەوشەکە بەجۆرێك بوو، هیچ کەس نەیدەتوانی ئەوەی رووبەڕوویکراوەتەوە بیداتە دوواوە، نەك تەنها تۆمەتی تاوانێك. ئەگەر فەرمانی مردن بەسەر کەسێکدا بدرایە لە دادگادا، ئەوا هەمان رۆژ جێبەجێدەکرا، جێبەجێکردنەکەیش زۆرجار لەبەردەم هەموو ئەوانەدا دەبوو کە لەو شوێنەدا ئامادە بوون". هەروەها گوتی:" کەسێك لەنێوبرا لەلایەن پێڕێکی شەش تا حەوت کەسییەوە، ئەوان کلاشینکۆف بەدەستبوون، یەکێکیان چووە بان‌و فیشەکی نا

بەتەوقی سەری تۆمەتبارەکەوە.چاکم لەیادە کە ژنێکی گەریلا لەو دەمەدا جەڵدە لێیداو مرد".

لە راستیدا سەرەڕای ئەو رێوشوێنە نوێیانە، هێشتا کوشتارو لەنێوبردنو گوللەبارانکردن لەنێو ریزەکانی پەکەکەدا کەمی نەکرد، ئەگەرچی ئیتر ئەوانەی بۆ لەنێوبردن بەئامانجگیرابوون تەنها ئەندامە نوێیەکانی نێو تەڤگەرەکە نەبوون. تا ئەوکاتیش دەکرا گەریلاکان ببڕێنو بەسانایی گوللەباران بکرێن، ئەوەیش بەبێ دادگاو بەبێ ئەوەی سەرەتا بە تۆجەلانیش رابگەیەنرێت. بلاٌوترین رێگە بۆ رزگاربوون لەکەسێك، ئەوەبوو کە هەڵدەکوترایە سەرىو بەخێراترین رێگە بەرەو مەرگ راپێچدەکرا، ئیدی هۆکارەکان هەرچی بوونایە.

رەنگە هۆی ئەوە بووبێت کەسەکە رەخنەی لەفەرماندەیەك گرتبێت یاخۆ دڵکرمێ بووبێت لە رووبەڕووبوونەوەیەکدا یان گرفتێکی لەنێو یەکەیەکدا هەبووبێت. یەکێك لەگەریلاکان کە بەشێوەیەکی سەرەکی لە ماوەی ١٩٩٥–١٩٩٨ لەنێوچەی بۆتاندا جەنگابوو دەیوت:" رەنگە دادگاکانیش فرە بەهەند وەرنەگیرانایە، بەلاٌم ئەم جۆرە شتانە ئێجگار فرە روویاندەدا".

لە ناوچەکەدا لەوشوێنەی کە ئەم جەنگاوەرە جێگیرکرابوو، یەکێك بوو لەو پێنج هەرێمەی بۆتان، لەوێ رەنگە لە هەر سێ ساڵدا ٢٠ کەس بەو شێوەیە بمردنایە(ئەوان بەدەست ئەنقەست دەنێردران بۆ بەرەکانی پێشەوە) ئەم شێوازە بەئاسانی لە ٤ هەرێمەکەی دیکەی بۆتاندا بەئاسانی تێبینی دەکرا، تەنانەت لە پارێزگاکانی دیکەشدا کە گەریلا چالاکیان دەکرد، هەمان رووداوی هاوشێوە دووبارە دەبوویەوە. هەمان گەریلا کە لەبۆتاندا مژوڵی خەبات بوو دەیگوت:" هیچ کەس زانیاریی نەبوو لەشوێنەکانی دیکە خەریکە چی روویدەدا". دواجار بڕیارەکان لەسەر ئەوە کۆك بوون کە کەسێك راسپێرن دەستڕێژبکات بەنێو ئەوانەی کە بڕیارە

لەنێوبدرێن یاخود بنێردرێن بۆ ئەرکێك کە گیانیان بخاتە مەترسییەوە، ئەم رەوشە باڵاترین ئەندامی پەکەکەی دەگرتەوە.

یەکێك لە فەرماندەی پارێزگاکان دەیگوت:" بە هەر هۆکارێك دەکرا کەسێك بکوژرێت، دواتر دەکرایە راپۆرتێكو دەتنووسی ئەم کەسە بەکرێ گیراوبوو". لەنێوبردنەکان شێوەیەك بوون لە شێوەکانی کۆنترۆڵکردنی کەسانی نەیارو بەرهەڵستکاری نێو پەکەکە، ئەو نەزمە تەنها لەنێوشانۆخدا قەتیس نەمابوو.

بەهەمان شێوە ئەندامانی پەکەکە لە ئەوروپایشدا دوچاری لەنێوبردنو کوشتن دەبوونەوە. هەرچەندە لەوێ توندیی رێوشوێنو بەدوواداچوونی پۆلیس تارادەیەك رێگر بوو لە ئەنجامدانی چالاکی کوشتن، بەڵکو پەکەکە لە سزای ئەندامانیدا زیاتر لێدانو حەپسکردنیانی بەکاردەهێنا لەنێو ئاپارتمانەکاندا.

هاوکات ئەندامانی پەکەکە لە نێوچە شارییەکانو شارەکانی خۆرئاوای تورکیادا دەکوژران. بۆ نموونە لەساڵی ۱۹۹۳ دا ئەندامێکی پەکەکە، کە نەوجەوانێکی کچۆڵەی ۱۰ ساڵ بوو لە ئەستەمبوڵ. ئەم کیژە کاتێك دەیەویست ئایس کرێم بکرێت رووبەڕووی خەڵکانێك بوویەوە کە ناسیانەوە، ئیدی لەهەڵهاتنیدا تا پەیوەندی بکات بەیەکەیەکی سەربازییەوە لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکییە لەلایەن پۆلیسەوە قۆڵبەستکرا. ئەو وادیاربوو لەلایەن پۆلیسەوە دوچاری ئەشکەنجەو سزا بوویەوە، هەربۆیە بەهۆی زاڕۆییەوە یاخود بەهۆی ترسەوە بوبێت ئەو شتەکەمەی کەلەبارەی پەکەکەوە زانیبووی بەپۆلیسی گوتبوو. هەر بۆیە لە دەوروبەری مانگی یەکی ۱۹۹٤ بەچەند مانگێك پاش گەڕانەوەی کیژەکە بۆ نێو ماڵی بابی لە ئەستەمبوڵ.

دروست کیژەکە لەلایەن پەکەکەوە رفێنراو برا تا لەبارەی ئەوەی چی روویداوە کۆڵینەوەی لەبارەوە بکەن. ئیدی نێزیکەی سێ هەفتە پاش ئەوە تەرمەکەی لەیەکێك لە دارستانەکانی شاردا بە خنکاوی دۆزرایەوە. بەمجۆرە ئەندامانی پەکەکە

لەشارەکاندا کۆنترۆڵکرابوونو فەرماندەرکرابوو کە هیچ کام لەوان بۆی نییە هیچ پرسیارێك بپرسێت، لە راستیشدا هەر بەوجۆرەشیان دەکرد[١٦٧]. یەکێك لە ئەندامانی پەکەکە دەیوت:" تەنانەت لە ناشتنی تەرمێکداو لە رێو شوێنی ناشتنەکەدا کەسێك بۆی نەبوو ئامادەبێت، هەموو ئەوانە لەلایەن پەکەکەوە هۆشدارییان پێدرابوو". لەم نەزمەدا هیچ کەس بۆی نەبوو لەشێوازی کوشتنێك بپرسێت، تەنانەت پرسیارکردن بۆ ئەوانە سەختتر بوو کە لەشاخدا بوونو لەجەنگدابوون دژ بەتورکیە، چونکە هەموو پشتیوانیو پشتبەستنێکیان بە پەکەکە بوو.

لەگەڵ ئەوەشدا گومانو رارایی سەبارەت بەجۆری کوشتنەکانو تۆمەتبارکردنی کەسانێك بە ناپاكو بەکرێگیراو و مەترسی دروستکردن بۆسەر ژیانیان ئێجگار پەرەی گرتبوو. ئەندامانی پەکەکە وایاندەبینی لەهەرکاتێکدا نێزیکە تۆمەتی ناپاکییان بدرێتەپاڵ، تەنانەت ئەوانەیش پێوەندی خوێنو خزمایەتیان هەبوو، ئەوان لەهەرکاتێکدا ئامادەبوون لەنێوببرێنو گوللەباران بکرێن. بۆنموونە لە دەستپێکی نەوەدەکاندا دووبرا لەنێوچەی بادینانی هاوسنوور لەتەك ئێراق بەناوەکانی جەعفەرو فەریك گوللە بارانکران، ئەوە پاش ئەوە هات کە برایەکی دییان لەپەکەکە هەڵهاتبوو. یەکێك لە هاورێ پێشووەکانی زانکۆی موحەمەد دەیگوت:" موحەمەد دوازدە قوتابی زانکۆی رادەستی پەکەکە کرد کە بەکرێگیراو بوون، دواجار خۆیشی کوشتەوە، چونکە پێیان وابوو، ئەوانە هەموویان بەکرێگیراو بن، موحەمەد بۆخۆیشی هەروایە، هەر بۆیە لەبەهاری ١٩٩٠ دا بۆخۆی کوشت".

پیاوێك کە موحەمەدی دەناسیو لەدەوروبەرەکەی سۆراخی کردبوو بۆئەوەی بزانێت چی بەسەر موحەمەددا هاتووە دەیگوت:"سەرەتا موحەمەد فرە ئەشکەنجە درابوو. پارچە نایلۆنێك سوتێنراو کردیانە گەدەیەوە تا ناچار بە قسەکردنی بکەن .

---

[167] This story was told to me by a number of people, including one person who knew the girl very well. The murder apparently was reported in Turkish newspapers, but without the exact dates, it proved impossible to locate the articles.

لەو دەمەدا ئەشکەنجدان فرە باو بوو". یەکێك لە جەنگاوەرە ئاست بەرزەکانی پەکەکە دەیوت:"لێرەو لەوێ شتانێك بەر گوێ دەکەوتن، بەتایبەت سەبارەت بە ناشتنی قوتابییەکی ئامادەی بە زیندوویی، بەجۆرێك لەکاتی ناشتنیدا هاواریکردووە ، من بەکرێگیراو نیم. ئەم رووداوە لەئێراندا و لەنێو چیاکانی زاگرۆزدا روویداوەو قوتابییەکەیش خەڵکی شاری وان بووە.

کێ دەزانێت بۆچی، رەنگە تەنها لەبەر ئەوە بووبێت کە پرسوجۆی فرەی کردبێت، سەرەتا ساڵی ١٩٩٥ کاتێك درێژەی بە گەریلابوونی دەدا لەپەکەکەدا، ئیدی دەیپرسی، ئەو تاوانو کوشتارانە لەپای چی، ئەو هەرگیز دانەدەساچا. منداڵی کەسێك دەکوژرێتو بەخێزانەکەی دەوترێت لە شوێنێکدایەو لەوێ کەس پێی ناگات، تەنانەت ئەوان وابیردەکەنەوە کوڕەکەیان یان کیژەکەیان هێشتا لەژیاندایە". هەروەها ئاماژەی بەوەیشدا، کە پەکەکە لەسەر خەڵکیدا حەوابوویەوە، بەڵام پارتەکە بۆخەڵك بایەخی نەبوو، ئەوانەی لەناوپەکەکەدا بوون، تەنها خۆیان دەگونجاندو خۆیان دەبوارد لە کوشتنو لەنێوبردن، ئەگەرنا ئەوانەی بەدووای سەر ئێشەوە بوون، ئەوا فرە بەباشی تەفرو تونا دەکرانو لەنێو دەبران. لە راستیدا هێندەیش سەخت نەبوو بۆ ئەوەی کەسێك خۆی بسازێنێت لەگەڵ رەوشەکەدا.

هاوکات بەشێوەیەکی گشتی ئەوەی لەزیهنی خەڵکیدا بوو شتێکی دیکە بوو، خەڵکی زۆرجار گوێیان بەوە نەدەدا بە روودانی هەڵەگەلێك لێرە یان لەوێ. بەڵکو ئامانجی راستەقینە لە داواکاری دەوڵەتی کوردیدا بوون.ئەم ئامانجە چاوپۆشی لەنێو خەڵکەکەدا زیندو راگرتبوو. لەم بارەیەوە گەریلایەك کە ساڵی ١٩٨٨ پەیوەندی کردبوو بەرپزەکانی پەکەکەوە دەیوت:" تۆ هەموو شتێکت قەبوڵ نەدەکرد، وەڵێ دەتەویست بەشداربی لە خەباتەکەدا، من هاتبوو تا ئەرکی خەباتم جێبەجێبکەم، هەرگیز بیرم لەوە نەدەکردەوە کە مەیدانەکە چۆڵبکەم.

## سەرهەڵدان

کوردەکان راپەرینە جەماوەرییەکەیان دوواتر بە سەرهەڵدان نێودەبرد. ئەم راپەرینە جەماوەرییە لە بەهاری ١٩٩٠ دا لە شارۆچکەیەکی گچکە بەنێوی نوسەیبین نێزیك سنوریی سوریە دەستی پێکردو و دوواتر تەواوی باشووری رۆژهەلاتی تورکیەی گرتەوە. پریشکی راپەرینەکە لەئاکامی کوشتنی ١٣ گەریلا بوو کە لە ئەشکەوتێکی نێزیك سابووری سەر بە نوسەیبین خۆیان حەشاردابوو، ئەوان بەچەند رۆژێکی کەم پاش ئەوەی بەشێوەی نهێنی لەسنوورەکانی سوریاوە هاتبوونە تورکیا لەنێوبران.

لە راستیدا ئەوە رۆشن نەبوو چۆن گەریلاکان کەوتبوونە کەمینەوە[168]. یەکێك لە چیرۆکەکن باس لەوەدەکات، کە هەڵسوڕاوی نهێنی نێو شاری پەکەکە کاری بۆ میریی کردووە، هەر بۆیە ئەو نێوارەیە برێك ژەهری رۆکردۆتە نێو ماستیێو بۆ گەریلاکانی بردووەو دوواتر کە بێ هۆش بوونە سەربازەکانی تورکیای ئاگادارکردوونەتەوە. راستییەکەی ئەوەیە، هەروەك چۆن لە رۆژنامە لۆکاڵییەکانی میریشدا ئاماژەی بۆکرابوو، ئەوان فرەبەسادەیی لەلایەن سەربازەکانەوە غافڵگیر کرابوون.

لە هەمان کاتدا خزمو دۆستی کوژراوەکانی پەکەکە دەستیان کرد بەداوای تەرمی کوژراوەکانو بۆ ئەو مەبەستەیش کەوتنە جەنگەوە. لە راستیدا ئەستەم بوو بتوانرێت شوناسی راستەقینەی کوژراوەکان بناسرێتەوە. چوون گەریلاکان وەختێك پەیوەندیان کردبوو بە شاخەوە، ئیدی وازیان لە شوناسنامەی تورکییان هێنابوو، هەرچی ناوی نیهێنیشە کە لەنێو پەکەکەدا پشتیان پێبەستبوون پێویست نەبوو بۆ

[168] This section draws on interviews with PKK militants active in the region during this period. Published sources included Ozcan, PKK, 198–202; Birand, Apo ve PKK, 150–154; Imset, the PKK, 79–81, 219–221; Celik, Agri, 165–167; and Milliyet newspaper, March, April 1990.

خێزانەکانیان بیزانن. لەهەمان کاتیشدا دەکرا گەریلایەك لە شوێنێك بکوژرێت کە دوور بێت لە شوێنی نیشتەجێبوونی خێزانەکەی‌و بەچەی شارێکی دیکە بێت.

لەگەڵ بوونی هەموو ئەو تەنگو چەڵەمەیە لەناسینەوەی تەرمی کوژراوێکی پەکەکەدا، دیسانەوە هەندێك لەو خێزانانەی کە بۆیان روونده‌بوویەوە کوڕ یان کیژەکانیان لە پێکدادانەکاندا کوژراون، ئەوان لەترسی کەوتنە مەترسییەوە یاخود تۆڵەی میریی، خۆیان نەدەدا لەقەرەی تەرمی کوڕو کچەکانیان‌و داوایان نەدەکردەوە. هەرچەند پەکەکە دەیویست خەڵکەکە داوای تەرمی رۆڵەکانیان بکەنەوە.

چونکە ئەو شەهیدانە، کە تورکیایش هەمان دەستەواژەی بۆ سەربازە کوژراوەکانی بەکاردەهێنا، بە نیسبەت پەکەکەوە شەهید هێمایەکی گرنگ بوو، کاتێك خێزانێك رۆڵەکەیان بەئاشکراو لە بۆنەیەکی جەماوەریدا ئەسپەردەی خاك دەکرد ، ئیدی ئەوە جۆرێك لە هاوسۆزی ئەو خەڵکەی بۆ جەنگی پەکەکە لێدەخوێنرایەوە. وەلێ گرفتێك لە گۆڕێدابوو، ئەویش ئەوە بوو کە پەکەکە دارای سیستەمێکی دروست‌و باش نەبوو تا پێگیریی بکا لەسەر ئەوەی ئەوانەی دەکوژرێن کێین‌و لە کوێ کوژراون. جیا لە هەموو شتێکی تریش، گەریلاکان ناوی دروستی کوژراوەکانیان پێنەدەزانی.

وەلێ لە رووداوەکەی سابوردا پەکەکە بەختی هێنابووی، چوون یەکێك لەو گەریلایانەی کە کوژرابوو، ناوی کامەران دوندار بوو، ئەو تەمەنی ٢٠ساڵ دەبوو، ناوبراو دارای بنەماڵەیەکی ئێجگار نەتەوەپەرست بوو. لەبە ئەوە جەنگاوەرێکی وەك دوندار بۆپەکەکە بایەخێکی مەزنی هەبوو، کوژرانی چەندین گەریلا لەهەمان کاتدا دیسانەوە هێندەی پێویست رووداوێکی مەزن بوو. هەربۆیە پەکەکە دەیتوانی بەسانای کۆدی نهێنی ئەوانە بداتەوە بە بنەماڵەکانیان.

بابی دوندار خێرا داوای لەدەسەڵاتدارانی نێوچەکە کرد کە تەرمی ڕۆڵەکەی ڕادەستی بکەنەوە. هیلین خزمێکی تەمەن چواردە ساڵی کامەران دەیگوت:" ئەو شەوە چاوەڕێی باوکی کامەرانمان دەکرد لەماڵی خزمەکانماندا، سەدان کەس گردببوونەوە، پرچیان ڕادەکێشاو دەگریان. ئێمەی زاڕۆکان پێمان گوترابوو تا بڕۆین هەموو کاسێتی گۆرانیو مۆسیقا کوردییەکان حەشار بدەین. لەراستیدا ئەو کاسێتانە هی یەکەکە نەبوون، تەنها مۆسیقاو گۆرانی بوون ، ئەو کارەمان دەکرد چون دڵنیابووین پۆلیس دەگاتو ئەوانیش باش دەزانن ئەوەی کە کوژرابوو کێیەو چی بووە.

لەسەرەتادا پۆلیس داواکەی بابی کامەرانیان دایە دواوە بۆ ئەوەی تەرمی کوڕەکەی وەربگرێتەوە، تا دوواجار نەرمیان نواندو تەرمەکەیان ڕادەستی بابی کرد". هیلین لە درێژەی گێڕانەوەکەیدا گوتی:" بە بابی کامەران سەعات ٤ی بەیانی تەرمەکەیان پێدابوو، پێیان وتبوو پێویستە تا سەعات حەوتی بەیانی بنێژرێتو تەنها ئەندامانی خێزانەکەشتان لە ڕێو ڕەسمی ناشتنەکەدا بەشداربن". هەروەها وتی:" دایکی کامەران پێویستبوو لە ئەزمیرەوە بگاتو ئامادەی ڕێو ڕەسمەکە بێت. ئێمە زارۆ بووین هەموو لامان تێکەیاندبوو کە بێنو پێوەندی بکەن بە ڕێو ڕەسمەکەوە. یەکێك لە خزمەکانی کامەران پێی دەوتین، مەگرین، ئەمە جەنگە، پێویستە بەهێزبین".

لە درەنگانێکی دووا نیوەڕۆ ڕێوڕەسمی ناشتنەکەی کامەران بەڕێوەچوو. سەرەتا تەرمەکە برایە مزگەوتێکی دوور لە شارۆچکەکەوە. هەرچەند لەماڵی کامەرانەوە مزگەوتی نێزیکتر هەبوو، وەلێ بنەماڵەکەی مزگەوتێکی دوورتریان هەڵبژارد تا خەڵکانێکی زێدەتر دەرفەتیان هەبێت پێوەندی بکەن بە ڕێو ڕەسمی ناشتنی تەرمەکەوە. بەم جۆرە لەکاتی گەڕانەوە لەسەر قەبران، ڕەوشەکە ماتەمینییەکە گۆڕا بۆ توندوتیژییو بگرەو بەردە، ماتەمگێران کە ژمارەیان خۆی

دەدا لەهەزاران کەس، دەستیان دایە هاویشتنی بەردو بەردەفڕکێ ڕوو بەپۆلیس. یەکێك خزمێکی گەنجی کامەران دەیووت:"ئەو پۆلیسانەی ڕژابوونە نێوچەکە تا ڕێ لەتەشەنەسەندنی خۆپیشاندانەکە بگرن. لەو کاتەدا کەسێك کە دەبوو خۆپیشاندەربێت، دەستی کرد بەتەقە. ئیدی جەنگ هەڵگیرسا، هەر مەردوم بوو تەقەی دەکردو لەهەردوو تەرەف قوربانی هەبوون". بەمجۆرە قەدەغەی هاتووچۆ لەلایەن میرییەوە ڕاگەیەنرا، وەلێ هیچ کەسێك ملی نەدا بۆ ڕێنومایییەکان. میریی لەڕێگەی فڕۆکەو دەبابەوە هێزی تایبەتیان گواستەوە بۆ شوێنەکە. بەجۆرێك ڕۆژنامەیەکی تورکی هۆشداری دا، کە لەنوسەیبیندا ژینگەیەکی شۆڕش ئامێز دەڕەخسێت[169].

خۆپشاندەران لەتەواوی شارو شارۆچکەکانی دیکەی هەرێمەکەدا بڵاوبوونەوە. کاتەکە درووست لەسەروبەندی چەژنی نەورۆزو سەری ساڵی کوردیدا بوو، هەر بۆیە ئەو کاتە زیاتر هانی تەنگژەو پشێوییەکانی دا. بەجۆرێك زانیاری درابوو کە تەنها لە نوسەیبیندا خۆپیشاندەران ٥٠٠٠ کەسیان پێکدەهێنا.

لەشارۆچکەی سیزر کە یەکێکبوو لەو شارۆچکانەی بەسەختی هەواداری پەکەکە بوون، ١٠٠٠٠ کەس پەشداریان لە پرۆتستۆکردنەکەدا کرد. ئیدی لێرەو لەوێ ڕۆژنامەکانی تورکیا بە سەرسوڕمانو هەیەجانەوە پیاوانی توڕەیان پیشان دەدا کە بەنێوشەقامەکاندا ڕایاندەکردو تایەو لاستیکەکانیان ئاگرتێبەردەدا، هاوکات ژنانیش بە رووسەری سوننەتییەوە کە نیمەی دەمووچاویان داپۆشیبوو، بە شکۆوە دەستی توڕەییان بەرزکردبوویەوە.

ئیدی دەوڵەت بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی کاردانەوەکان چۆن دەبنو چی دەقەومێ نارەزاییەکانی بە کاری پشێویو تێکدەرانە پێناسەکردو نێوچەکانی

---

[169] Milliyet, March 17, 1990.

گەمارۆدا. رەخنەو گازاندەکانیش روویان کردە پارتی سۆسیال دیموکراتی بەرهەڵستکار.

هاوکات پەرلەمانتارێك گازاندەی ئەوەیکرد کە هێزە ئاسایشییەکان رۆڵیان هەبوو لەهاندانی تەنگژەو یاخیبووەکان لەکاتی رووبەڕووبوونەوەی خۆپیشاندەرەکاندا، یەکێکی دی پێی وابوو پشێوییەکان دەرخەری ئەو راستیەن کە سیاسەتی دەوڵەت لەنێوچەکەدا دووچاری شکستبووەتەوەو پێویستە لەبری رێگەی سەربازی شتانێکی دی پێشنیازبکرێت بۆ بەرگرتن لە گرفتەکە"[١٧٠].

دەنگی پەرلەمانتارە نارەزاکان درێژەی نەکێشا، دەوڵەت مژوڵی ئەوەبوو لەرێگەی توندکردنەوەی دەسەلاتو تواناکانی بەرووی خۆپیشاندەراندا کۆنترۆڵی بگەڕێنێتەوە، هەر بۆیە تانكو زرێپۆشێکی ئێجگار زۆر نێوچەکەیان تەنی بوو. وەزیری ناوخۆی تورکیا عەبدولقادر ئاکسو لە دیدارێکدا سەرزەنشتی پەکەکەی کردو رایگەیاند:"خەڵکی شاراوەی پشت جەماوەری خۆپیشاندەرو خەڵکی لۆکاڵی نێوچەکە هۆکاری پەرەگرتنو گەشەی پشێوییەکان بوو"[١٧١]. لەکۆتایدا وادیاربوو کە جەنگی پەکەکە لە شاخەکانەوە دابەزیوەتە نێو شارەکانی تورکیە. وەلێ پەکەکەیش دروست وەك دەوڵەت لە هێزو تواناو هەیەجانی خەڵك سەری سوڕمابوو.

هەرچۆنێك بێت هەردوو سالآنی ١٩٨٩ و دەستپێکی ١٩٩٠ بۆ جەنگاوەرانی پەکەکە بەسەخت گوزەرا. رێژەی پێکدادانەکانو تێکگیرانی لەتەك هێزە ئاسایشییەکاندا لەزیادبووندا بوو. پەکەکە تاڕادەیەك توانیبووی لە رێگەی کۆمەكو هێزی ئەندامە نوێیەکانەوە قەرەبووی لەدەستدانی ژمارەیەکی ئێجگار زۆر لە ریزەکانی بکاتەوە. گرفتەکان لەنێو یەکە سەربازییە جوداکانی پەکەکەدا لەسەروبەندی ١٩٨٩ بووە هۆی تێکگیرانو هەندێك وردە تەقە لەنێوانیاندا ،

---

[170] Independent deputy Adnan Ekmen and Social Democratic deputy Tevfik Kocak, respectively, quoted in Milliyet, March 20, 1990.
[171] Milliyet, March 22, 1990

بەتایبەتی لەنێوچەی تونجەلی لە نێوەراستی ١٩٩٠دا هەندێك گرفت روویدا. رەوشەکە بەجۆرێك بوو کە یەکێك لە یەکە هەرێمییەکان لەدەرەوەی سنوورەکانی تورکیادا کاری کرد تا گروپەکان رێکبخەنەوە بۆ بەرێوەچوونی پلانە نوێیەکانیان.

جیا لەوەیش هەرچەند ئاتاج بەیارمەتی خەڵکیو ئاواییەکان پەکەکەی زیندو راگرتبوو، ئەو پشتیوانیی وەرگرتنە لەخەڵکی ئاواییەکان هەر بەردەوام بوو. تا ئەوکات پەکەکە تێمابوو نەیدەزانی چەندە رادەی پشتیوانیی لەشارەکاندا مسۆگەرکردووەو چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو دەنگدانەوەو تەقینەوە جەماوەرییەدا بکات. ساری باران فەرماندەی پێشووی پەکەکە، ئەوەی بانگەشەکانی ئەندامانی دیکەی پەکەکە دوپاتیاندەکردنەوە رایگەیاند:" خۆپیشاندەران بەبێ هیچ تێوەگلانێك یا بەشدارییەکی پەکەکە راپەرین". هەروەها دەیووت:" پاشئەوەی خەڵکی راپەرین، ئێمە بیرماندەکردەوە پێویستە شتێك بکەین، بەڵام لەکۆتایدا هیچمان پێنەکرا". لە راستیدا پەکەکە دارای توانایەکی کەمو کورت بوو تا ئەو خۆپیشاندەرانە رێبەرییبکاتو بیانجولێنێت بەرەو پێشەوە. ئامادەیی خەباتکارانی پەکەکە لەشارەکاندا تا ئەوکات سنووردار بوو. بوونێکی لاوازی چالاکوانە مەدەنییەکانی پەکەکەو خەباتکارەکان تەنها بۆ ئامادەکردنو بەدەستهێنانی ئەندامی نوێ بوو تا بۆ بەرەکانی جەنگ ئامادەیان بکەن.

باران لەم بارەیەوە دەیوت:" ئێمە کاریگەریمان هەبوو، وەلێ رێکنەخرابووین". لەراستیدا هۆیەك بۆ لاوازیی لەشارەکاندا دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی کە کارکردن لە ژینگەی شاردا فرە سەختو دژوار بوو. هۆکاری دیکە ئەوە بوو، ئەوکات جەنگاوەریی لەنێو شارەکاندا تا رادەیەك واتایەکی تانە ئامێزو سوکایەتی هەڵدەگرت. لەبەر ئەوە پەکەکە هیچ پێداگیرییەکی ئەوتۆو تایبەتی لەسەر مانەوە لە نێوەندە شارییەکاندا لەپێشچاونەگرتبوو، تەنها سەرگەرمی گردکردنەوەی ئەندامی نوێو ناردنیان بوون بۆ شاخ. لەراستیدا رێی تێدەچێت نەخشەی پەکەکە

سەبارەت بە شارەکان لۆژیکیی بێت چونکە ئەوان خۆیان بە بەڕێوەبەری خەباتی چەکداریی کورد دەزانی، هەربۆیە وایاندانابوو ئەو خۆپیشاندانانە سەرنجی خەڵکی بۆ ئەوە رادەکێشێت کە رێگەیەکی تر لەخەباتو دوور لەخەباتی چەکداریی خەڵکی ئاڕاستەبکات. لەبەر ئەوە پەکەکە هیچ هۆکارێکی نەدەبینی بۆ هاندانی زێدەتری خۆپیشاندەران دژ بەمیریی.

بەمجۆرە خۆپیشاندانەکان وادیاربوو هەر چەند هەفتەیەك درێژەبکێشن، ئیدی خەڵکی ماندوو بێزار نەیاندەزانی ئیدی هەنگاوی داهاتوو دەبێت چی بێت، هەر بۆیە لەو قۆناغەدا خزابوونە کونجی ماڵیّو هیچ بەرنامەیەکیان نەبوو. هاوکات دەسەلاتدارانی نێوچەیی تورکیا هاوکاربوون تا تەنگژەو خۆپیشاندانەکان کەمکەنەوە، چوون ئەوان فەرمانیان دەرکردبوو بۆ هێزە ئەمنییەکان تا دەستوەرنەدەنە کاروباری خۆپیشاندەرانەوە، مەگەر ئەوەی رەوشێکی تەواو پێویست بێتەپێشەوە. بەمجۆرە ئەو هەیەجانو وروژانە کورتو کەمخایەنەی خەڵك لەبەرامبەر دەوڵەتدا هاوڕابوو لەبەرامبەر دەستبەسەرکردنی سەدان کوردو گوللەبارانکردنی چەندکەسێکو هۆیەك بوو تا چەندین کەس رووڵەشاخ بنێنو پێوەندی بەپەکەکەوە بکەن.

هیلینی ئاشنای دووندار دەیگووت:" هەموو هەفتەیەك پاش رێورەسمی ناشتنی تەرمەکە پۆلیس دەهاتە نێو ماڵمان، لەیادمە بابی کامەران لەماڵیّ نەدەنووست. دوواجار پۆلیس ئەویان دییەوەو دووریان خستەوە، ئەو دارای گەلیّ نەخۆشی بوو. سەربازەکان لەهیچ نەدەگەڕان ، تەنانەت گۆڕستانەکانیشیان تێکدابوو، من وا راهاتبووم رۆژنامەنووسانم دەبردنە ئەویّو تێکدانو دەردیسەرییەکەم دەخستنە پێشچاو، پێشم دەگوتن گەر ئەم رەوشە بەردەوام بێت، ئەوا ئێمە هەموومان روودەکەینە شاخ".

بەمجۆرە بەرەنگارییەکی سەرتاسەریی لەنێو ریزەکانی خەڵکدا نیشاندانی ئەو راستییە بوو کە خەڵکیی ئامادەیی دەردەبڕن بۆ مردن و کەمتر ترسی میریی کاریان لێدەکات.

ئەوە ئێجگار جێگەی بایەخ بوو بۆ پەکەکە، ئەوە هەوڵێك بوو تا زێدەتر خەڵکی رازی بن بە نەزم و نوارینی پەکەکە لەمەیدانەکەدا. بەمجۆرە پرۆتستۆکان ئەوەی سەلماند کە چیتر خەڵکی ناکاراو بێدەنگ نابن. ئەم جموجوڵ و گورە نوێیە هۆیەك بوو تاپەکەکە ئیدی بتوانێت لەنێوەندە شارییەکەشدا زاڵبێت بەسەر ئەو تەنگ و چەڵەمەو تاستەنگانەی پێشوودا کە دەهاتنە رێی. ئیدی پەکەکە دەستی رادەگەیشت بە تۆرێك پێوەندی فراوانترو زانیارییە هەواڵگیرییەکانی پەرەیان پێدراو بازنەی پەیوەندییەکانی فراوان بوون، هاوکات رێنەندازیش کرا تا تۆرێك چالاکوان و پێرێك گەنجی کارا بێنە نێو ریزەکانییەوە.

بەوتەی چیلیك فەرماندەی پێشووی پەکەکە بوونی خۆپیشاندان و پرۆتستۆکان پەکەکەیان پاراست و هێشتەوە. بە هاتنی ١٩٩٠ هەیمەنەی ئۆجەلان لەنێو پەکەکەدا وەك مانگ رۆشن بوو، هیچ ئۆرگانێکی پارتەکە بەبێ ئاماژەی ئۆجەلان نەیدەتوانی پەنجە بکات بەئاودا. بە لێکدانەوەی یەکێك لە شۆرشگێرەکان، ٢٥ ئەندامەکەی کۆمیتەی ناوەندی پەکەکە لەماوەی ٣ساڵدا، سێ جار گۆرانکارییان بەسەرداهات و گۆران بۆ کەسی تر. کاتێك گردبوونەوەیەك ئەنجام دەدرا لەنێوان ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی پەکەکەدا، ئۆجەلان بۆ هەمووان ئامادەسازی دەکرد تا رەوشەکە هەڵسەنگێنن و ئەنجامگیریی بکەن و پاشان روانینی خۆی چرِدەکردەوەو پێشبینی پەسەندکردنی دیدگای خۆی لە هەمووان دەکرد.

بە هەمان شێوە کۆنفرانسەکان لەسەر ئاستی هەرێمیی فەرماندە سەربازییەکان لەلایەن ئۆجەلانەوە بەرێوەدەبرا، ئەو تێروانین و دیدگای خۆی نومایان دەکردو دەیخواست لەرێگەی پەیکی خێراوە کاسێت و بڵاوکراوەو پەیامەکانی وەشانبکرێن.

لەراستیدا ئەوە مانای ئەوە نەبوو کە ئەندامانی پەکەکە ئەوانەی لەئاستە بالأکانی پارتەکەدان‌و ناتوانن سەرنج‌و تێبینی‌و هەڵسەنگاندنی خۆیان بخەنە ڕوو، یاخود ڕۆحی بەرەنگاریی‌و تەحەدایان تێدانییە، لە سەرەتادا کاروبارەکان بەهۆشداری‌و پەسەندمەندیی ئۆجەلان بەڕێوەدەچوون‌و ئۆجەلان دەیتوانی هەرکەسێك لەفەرمانی دەربچێت سزای بدات، وەلێ هەندێك جار کارگەلێك کە بەفەرمانی ئۆجەلان ئەندامانی پەکەکە پێی هەڵدەستان، دیسانەوە ڕووبەڕووی سزادەبوونەوە.

بۆنموونە لەساڵی ١٩٨٨ خەلیل کایا لەسێدارەدرا، ئەوە پاش ئەوە هات ئۆجەلان بڕیاری دابوو، کە ئەو پێویست دەکات پلار بگرێت لە کەسێك لەپێناو شکستی پرۆسەی سەربازگیریی زۆرەملێدا. ئۆجەلان لەرووکەشدا خۆی وەك سەرۆك‌و سکرتێری گشتی نومایاندەکرد، کە ئەمەیش ئاماژەبوو بۆئەوەی ڕێبەرایەتی پارتەکە لە دەستەلأتێکی دەستەجەمعیدا بەڕێوەدەچێت، وەلێ ڕێبەرایەتییەکە لەراستیدا ئاماژەبوو بەدەسەلأتی تەنها ئۆجەلان. پێڕەوی نێوخۆیی پەکەکە لەساڵی ١٩٧٨دا داڕێژرابوو، وەلێ کاریگەریی بەندویاسا جۆراوجۆرەکان‌و ڕێکخستنەکانی دەوروبەر بەدرێژایی چەندین ساڵ جۆرێك لە گۆڕانکارییان لەسەر نەزمی پارتایەتی پەکەکەدا هانی بوو. وەلێ هیچ کام لەو گۆڕانکاریانە یاخۆکاریگەرییانە سەربەخۆو جیا لە خواستی ئۆجەلان نەبووە.

ئەو بۆخۆی داوای دەکردو ڕاستیدەکردەوەو لایدەبردو دەیگۆڕی (کوردەواری گوتەنی بۆ خۆی دەیبڕی‌و بۆ خۆی دەیدووری، وەرگێڕ). هەرچەند ئۆجەلان فرە هەستیار لەبەرامبەر ئەگەری لەدەستدانی دەسەلأتەکەیدا ڕەپ وەستابوو. هەربۆیە ئامادەکاری کردبوو بۆ کۆنگرەی چوارەمی پارتەکەی کە بڕیاربوو لەمانگی ١٢ ی ١٩٩٠دا ببەسترێت.

لەوێدا چەند بڕیارێکی دەرکردبوو کە هێزی مانەوەی زێدەتریان دەدا بەدەسەلاتی ئۆجەلان[172]. بۆنموونە زانیاری گەلێك لەبەردەستدابوون بۆ ئەوەی تەحقیق لە شەش فەرماندەی سەربازیی بەئەزموونی پەکەکە بکەن، گوایا راڤەی هەڵەیان بۆ فەرمانو خواستەکانی ئۆجەلان کردووە لە نێو گۆڕەپانەکەدا.

تۆمەتبارکردنی ئەوانە وابەستە بوو بە شکستی پەکەکە لە فراوانکردنی بەرەی جەنگەکەیدا، هاوکات گرێدرابوو بەو هەموو پلارو رەخنەیەی لەسەر نەزمی جەنگیی پەکەکەو هێرشەکانی بۆ سەر گیانی هاوڵاتیان . لەلایەکی تریشەوە بەندبوو بە نەزمی سەربازگیریی زۆرەملێو کوشتنی ئەوانەی ناو زەد دەکران بە کرێگرتەیی لەنێو پەکەکەدا. لەراستیدا لێپێچینەوەو وەستان لەسەر ئەم پرسانە ئاماژەیەك بوو بۆ ئەوەی کە ئۆجەلان گەرەکیەتی ئیدی هیچ پێشهاتێکی لەو جۆرە لەنێو پەکەکەدا نەقەومێو بواریان بەرتەسکبکرێتەوە.

بەکورتی تەقەلای ئۆجەلان لەم کارانەیدا وابەستەبوو داماڵینی خۆی لەتاوانو رەخنەو پلارو چەوتییەکانی حزب. حسێن تۆپ گیدەر لەم بارەیەوە هەوڵی لەم جۆرەی ئۆجەلانی بەم جۆرە لێکدەدایەوە: ئەگەر کارێکی ماقوڵو باش ئەنجامبدرایە، ئەوە دەستکەوتی پارتەکەبوون وەلێ گەر هەڵەیەك بکرایە ئەوە هەڵەی شەخسو تاکەکان بوو، هەرگیز حزب لە هەڵەوە نەدەگلا. لەراستیدا هەندێك جار هەڵەکان بەهۆی ستراتیژی هەڵەی ئۆجەلانەوە بوون، وەلێ ستراتیژی ئۆجەلان نەدەبوو قسەی لەبارەوە بکرێت. لەبەر ئەوەی گەر تۆ لەبارەی ئەو ستراتیژەوە پرسیارت بکردایە، واتە پرسو جۆ و کۆڵینەوە لە پارتەکە دەکەیت، ئەوەیش مانای وابوو لە ئۆجەلان دەپرسیتەوە، کارێکی لەم جۆرەیش دوور تانێزیك بقە بوو.

---

[172] nformation on the 4th Congress draws on interviews with congress participants. Additional information in Celik, Agri, 169–173; Ocalan, PKK'ye Dayatilan Tasfiyecilik, 451–525; Yuce, Bildirgesi, 226–237; and the open letter is- sued by PKK-Vejin, "PKK-MK ve tum uye ve savasci arkadaslari" (To the PKK central committee and all comrade fighters and members).

لەدووی مانگی هەشتی ۱۹۹۰ پێنج مانگ پێش ئەوەی پەکەکە پلانی کۆنگرە دابڕێژێت، ئێراق کووەیتی داگیر کرد، کوەیت وڵاتێکی زەنگین بەنەوت لەسنوورەکانی باشوری ئێراق بوو.

باش چەند مانگێك کۆمەڵگەی نێونەتەوەیی، دەستیوەردایە جەنگەکەوەو دوواجار بڕیاریان دا پێویستە ئێراق بەبێ هیچ مەرجێك پاشەکشەبکات، ئەگەر نا هێزی سەربازی بەکاردەهێنن بۆ هەڵکەندنی هێزەکانی ئێراق. ئیدی لەپێشبینی ئەگەری جەنگەکەدا، ئێراق بەشێکی فرەی هێزەکانی گواستەوە بەرەو سنوورەکانی باشووری وڵاتەکەی، بەمەیش بۆشاییەکی فرە لە رووی هێزی سەربازییەوە لە سنوورەکانی باکووری ئێراقدا دروستبوو. ئەمەیش بەبێ رەچاوکردنی رەوشی سیاسیی بوو لەگەڵ تورکیا. بەمجۆرە غیابی کتوپڕی هێزەکانی ئێراق لە نێوچە سنورییەکانی باکورداو پەرتەوازەیی پارتەکانی کوردستانی ئێراق زەمینەی سازکرد تا پەکەکە بەسانایی شوێنی خۆی لەنێوچە سنووریەکانی باکووری ئێراقدا بکاتەوە. تەنانەت ئۆجەلان لەتاو تامەزرۆیی دەربڕینی بۆ ئامادەبوونی لەبەشێکی خاکی کوردستاندا ناوچەکانی باکووری ئێراقی بە بەشێك لە کوردستان نێو زەد کردو بڕیاریدا چوارەم کۆنگرەی خۆی لە باکوری ئێراقدا ببەستێت. لەکاتی دامەزراندنی پەکەکەوە تا ئەوکات ئەوە یەکەم کۆنگرەی گروپەکە بوو کە لەقەڵەمڕەوی کوردیدا ببەسترێت. هەربۆیە ژینگەو هەیەجانێکی گەورە رووی لە ئەندامانی گروپەکە نابوو. بەڵام ئۆجەلان بواری بۆ نەرەخسا سوریا بەجێبهێڵێتو لەباکووری ئێراقدا ئامادەبێت. لە راستیدا دەربازبوون بەناوچە سنورییەکاندا مەترسیدارو دژواربوون بەتایبەتی ئامادەبوون لە نێوچەشاخاوییەکانی باکوری رۆژهەڵاتی زاخۆدا کە کەمپی گروپەکەی لێبوو. لەجیاتی ئامادەنەبوونی خۆی ، ئۆج ئالان نۆکەسی وەك ئەنجومەنی ئامادەکاری دەستنیشانکرد، کە لەنێو ئەواندا عوسمان ئۆج ئالانی برایو جەمیل بایکی جێ متمانەی خۆی تێدابوون بۆ ئەوەی کۆنفرانسەکە لە

هەفتانێن دا بەڕێوەبەرن. هەفتانێن دەکەوتە نێوچە شاخاوییەکانی هەڵکەوتوو لە سنووری ئێراق تورکیا، ئەوێ ببووە نێوەندی ڕاهێنان و گردبوونەوەی ئۆردوگاکانی پەکەکە لەنێوچەکەدا.

لەسەر بەردەلآن و تەختی زەمینی ئەو نێوەدا عادەتەن ۳۰۰ گەریلا دەنوستن، وەلێ بەگوێرەی حساباتی کۆنگرەکە خێوەتگەلێکی بەرین ئامادەکرابوو کە سەد کەس یاخۆ نوێنەرانی ئامادەبووی لەخۆدەگرت بۆ خەوتن و حەوانەوە. کۆنگرە لە دواین هەفتەی مانگی دە دا بە گردبوونەوەی سەردارانی کۆبوونەوەکەو ئیدانەکردنی ئەو جەنگاوەرە هەمەجۆرانەی کە ببوونە هۆی لاوازکردنی نەبەردییەکانی پەکەکە دەستی پێکرد. نوێنەرانی کۆنگرە بەجارێ دەستیان هەڵبڕی تا دروست لەوکاتەدا جەنگاوەرە ناپاکەکان دەستبەسەربکەن و کۆڵینەوەیان لەبارەوە بکەن. ئیتر یەك یەك لەکۆنگرەدا تۆمەتبارەکان دەرهێنران و دوریانخستنەوە تا لێپێچینەوەیان لەتەکدا بکەن. لەم نێوەندەدا حوسەین تۆپ گیدەری فەرماندە لەهەموو دەسەلآتێك تەکێنرایەوە، تەنانەت لەپێش کۆبوونەوەکەدا تەنها رێگەی پێدرا گوێ لە لێپێچینەوەکان بگرێت، دوواتر نەیانهێشت بەشداری کۆنگرەکەیش بکات. یەکێکیتر لە سەرکردە بالآکانی پەکەکە بەنێوی جەمیل ئیسیك(هۆگر) کە لەپێش کۆنگرەدا لەدەستی پارتەکەی پەنای بردبووە بەر ئێران و هەڵهاتبوو، لە کۆنگرەدا بە غیابی سزای مردنی بەسەردا سەپێنرا. هەموو کەسێك چاوی لێسورکرابوویەوە. تەنانەت یەکە چەکدارییەکانی پەکەکە رەخنەی شکستی هەڵکوتان و هێرشەکانیان لێگیرا بۆ سەر ئامانجە سەربازییەکانی تورك و شکستەکانیان دایەپاڵ نا وردو وریایی لە ئامانجەکانداو بێ بایەخی و هەڵە لە ئامانجەکاندا.

تەنانەت ئەو راپۆرتانەی لەلایەن یەکە سەربازییە جیاوازەکانی پەکەکەوە ئامادەکرابوون لەرووی ئایدیۆلۆژی و ئیلزامییەوە لاواز بە دۆزو دۆسیەی پەکەکە

لێكدرانەوە.ئیسیل كوروكایا بەمجۆرە دەیگێڕایەوە:" كەسێك هەستاو راپۆرتەكانی خوێندەوە، پاشان مشتومڕی كراوە لەبارەیەوە دەستی پێكرد".

هەروەها وتی:" كەسێكی ترهەستا گوتی: ئەوان رازی نابن بە راپۆرتێكی لەو جۆرە، چونكە زانیارییەكانی شوێن نەهێو نیازی پەكەكە نەكەوتوون. دوواجار هەمان ئەنجامو روانین سەبارەت بە تێكڕای راپۆرتەكان درا. ئیتر راگەیەنرا كە ئەوانەی رێبەرایەتی جەنگی چەكدارییان كردووە لە نێوچە شاخاوییەكاندا، بە گوێرەی پێویست دارای بەرنامەی رۆشنو توانای سەربازیو زاڵ بەسەر كارەكەیاندا نەبوون".

لەم بارەیەوە ئیسیك كوروكایا ئاماژە بۆ ئەوەدەكات كە چۆن ژینگەی تێرۆر باڵی كێشاوە بەسەریاندا. مەهمەت چەتین سینەر، ئەو كەسەر رێبەرایەتی هەڵمەتە سەربازییەكانی پەكەكەی دەكرد، نێزیك لەو كاتەوە پێوەندی بەرپزەكانی پەكەكەوە كردبوو، ئەوە پاش ئەوە بوو كە هەشت ساڵ تەمەنی خۆی لەزیندانی دیاربەكردا گوزەراندبوو. سینەر كەسێكی ناسراوو سەنگین بوو لەنێو ئەندامانی پەكەكەدا، ئەو پەشداری كردبوو لە راپەرینی زیندانیانی دیاربەكرو یەكێك بوو لەو زیندانیانەی كە مانی لە خواردن گرتبوو .

پاش مەرەخەسكردنی لەزیندانن پەكەكە یارمەتیاندا تا لەتوركیا قوتاربێتو لە سەرو واری ١٩٨٩دا پێوەندی كرد بەپەكەكەوە لە دۆڵی بیقاع دا. ئۆجەلان ئەوی وەك سەرپەرشتیاری مەشقە ئەكادیمییەكان دەستنیشانكردو هەڵی بژارد بۆ لیژنەیەك كە تێیدا ئامادەكارییەكانی كۆنگرەی خرایە ئەستۆ. دوواتر سینەر باسی لەوەدەكرد كە ئۆجەلان بۆیە ئەوی بۆ ئەو پۆستانە دەستنیشانكردووە تا جەماوەرییەتیو دەنگدانەوەی زیندانیی ئەو بقۆزێتەوە بۆ شیرینكردنی وێنەی خۆی لەپێشچاوی ئەندامانددا. هەرچەند ئەوەیش رێی تێدەچوو كە بەراستی ئۆجەلان لەبارەی نێو و شۆرەتی سینەر نیگەران بوو، هەر بۆیە ئەوی لەنێزیك خۆیەوە

هێشتبوویەوەو چەند پۆستێکی بەڕێوەبردنی خستبووە ئەستۆ تا لەنێو پەکەکەدا مژوڵی کارەکانیبێت. لەدووایدا ئەو سیاسەتە دادی ئۆجەلانی نەدا، چوون سینەر پاش ئەوەی زەبوونکردنی جەماعی ئەندامانی پەکەکەی دی‌و تۆمەتبارکردن‌و کوشتن‌و دەکردنی فەرماندەکانی پەکەکەی ڕەچاوکردن ئیدی کەوتە گلەو گازاندەگرتن لە ئۆجەلان.

زیاتر یان کەمتر لەساڵێك کە سینەر لە بیقاع گوزەراندبووی. بەچاودێریکردنی هەوڵی شێوە هستریای پەکەکە بۆ لەبێخ هەڵکێشانی ناحەزانی لەنێوخۆی پەکەکەداو بەتەماشاکردنی ڕەفتاری ئۆجەلان لەو ماوەیەدا، ئیتر ئەو ڕاستیە لەلای سینەر گەلاڵەبوو کە سوچی لاوازیی پەکەکە وابەستەیە بە خودی ڕێبەرەکەیەوە.

هەربۆیە لەئێستادا جیا لە ئۆجەلان بە پشتیوانی کەسێکی دیکە بەنێوی ساری باران کە لە بیقاع لەگەڵ سینەر پێکگەیشتبوون. سینەر جموجوڵەکانی دەستدایە. ساری باران بەهەمان شێوە ئاست بڵندو سەنگین‌و فەرماندەیەکی کارای هەرێمی هەکاری بوو. کوروك کایا پێی وابوو کە ساری باران هەرگیز وتەکانی سینەری فەرامۆش نەدەکرد. سینەر دەیگووت:" هاورێیان، بارودۆخەکە بەجۆرێك هەڵسەنگێنراوە کە هەر حوکمێك دەرابێت هەڵەو نارەوا بووە. من پێم وایە دەکرێت جەنگەکان هەڵەو پەڵەبن، وەلێ ئەوانەی کە چەك هەڵدەگرن‌و ڕوو لەشاخ دەنێن جگە لەکارێکی شکۆمەندانە هیچی دیکە نییە، ئەوانە کەسانێکن کە بەگیانی خۆیان قوربانی دەدەن‌و داویانە، وابیرناکەمەوە ئەوانە تاوانبارو ناپاکبن.

ئاپۆ دەیوت ئێوە یارمەتی هەوڵەکانی جەنگی تورك دەدەن بە ئەنجامدانی هەڵەکانتان، وەلێ ئەو ئەوە دەکاتە ڕاستییەك، چونکە کارەکانی ژمارەی پاسەوانەکانی سنوور هەڵدەکشێنێت. هەروەها ئەگەر هەر چییەك کە گەریلاکان ئەنجامی دەدەن هەڵەبێت یاخۆ ئەو چالاکیانەی کە دەیکەن تاوانبن، ئەوا پێویستە خودی پارتەکە کۆڵینەوەی لەبارەوە بکرێت‌و دادگایی بکرێت، من زۆر بە سانایی

دەمهەوێت بیروبۆچوونی خۆم نومایان بکەم". سینەر لەلایەن جەمیل بایك یەکێکی تر لە سەرۆکەکانی کۆنگرە، هۆشداری دابوویە سینەر، بەوەی پێویستە وریای خۆی بێتو هۆشی بێت خەریکە چی دەڵێت. وەلێ سینەر ملی نەداو ئەوەی دایە دوواوە کە رەخنەو رامیاری خۆی سەبارەت بە ئۆجەلان پەنهانبکات.

لەبری ئەوە داوای لە نوێنەرانکرد کە پرۆپۆزەڵو پێشنیهادەکانیان جەختبکەنەوە سەر دووبارە پێدانەوەی دەسەلآت بە کۆمیتەی ناوەندیو لەسەر نەزمی دیکتاتۆریەتی ئۆجەلان راوەستنو هەڵوێستە بکەن.هەروەها سینەر داوای کرد پێویستە سەرزەنشتی ئۆجەلان بکرێت، وتیشی پێویستە لەبری کوشتنی چالاکوانانو بێسەروشوێنکردنیان، ئەبێت کۆڵینەوە لەبارەی ئەو سیاسەتانە بکرێت کەهانی ئەوکەسانەدەدات کە کاریو باری لەوجۆرە ئەنجام دەدەن.

سینەر و شوێنکەوتووانی چەند مانگێکی کەم پاش کۆنگرە لەنامەیەکی کراوەدا نوسیان: هەروەك چۆن ئۆجەلان روونیکردەوە:" هەمووان کادێریی بنچینەیین، کەواتە ئێمە هەموومان تاوانبارین. هەربۆیە بهێڵن رەخنەکانمان لەسەر چالاکیو کارەکانی یەکتربیبێت. لەلای ئاپۆ ئەوە روون پەنهانکراوە کە هەڵکوتانە سەرئاواییەکانو کوشتنی هاولآتیانی بێتاوان کێ لێی بەرپرسە؟ هەڵکوتانە سەر ماردین پەڵەیەکی رەشە لەمێژووی گروپەکەدا ، هەمو کارەکان شەخسەن لەلایەن ئۆجەلانەوە فەرمان بەکردنیان دراوە.

کاتێك شاهین بالیك وەك بەڕێوەبەری پۆلیس لە ئەکادیمیادا دەستبەکار بوو. بۆخۆی ١٢ کەس لەئەندامە نوێیەکانی ریزی گەریلای کوشت. ئایا ئەوە کێ بوو شاهینی کردە بالآدەستو سەرداری ئەکادیمیا؟"[173]. لەراستیدا وەلآمەکە روونە کە مەبەستیان پێی ئۆجەلان بووە. هەربۆیە سینەر بەتایبەتی داوای کرد کە کۆڵینەوە بکرێت لە رووداوی کوشتنەکانو لەبەینبردنەکانی کەمپی بیقاع کە راستەوخۆ لەژێر

---

[173] PKK-Vejin, "PKK-MK ve tum uye.

کۆنترۆڵی ئۆجەلاندا بوون هەروەها کەمپی سنووریی ئێران کە ئەویش لەژێر کۆنترۆڵی عوسمان ئۆج ئالانی برایدا بوو. هەروەها سینەر پێداگریکرد لەسەر ئەوەی کە تەنها ئەنجومەنی ناوەندی بەرپرس بێت لەدارایی پارتەکە.

تا ئەوکات هەموو داراییەکی پەکەکە بەتەنها لەژێر رکێفی ئۆجەلاندا بوو. بەم جۆرە پێشنیازەکانی سینەر لەلایەن نوێنەرەکانیشەوە پەسەندکرا. باران لەم بارەیەوە گوتی:" ئێمە ئۆجەلانمان وەك ئامانجێك هەڵنەبژارد، ئێمە لەسەر خاڵێك وەستابووین کە دەکرا لەوێوە رێکخراوەکە درزی تێبکەوێت. لەبەر ئەوە پێویستبوو شتێك بکەین تا رێ لە درزو کەلەبەرەکانو دابەشبوونی رێکخراوەکە بگرین".

بەرەچاوکردنی بۆچوونی نوێنەران ئەودەسەلاتەی ئۆجەلان کە دەشکا بەسەر پارتەکەدا ، هەرگیز قابیلی قەبوڵ نەبوو، هەر بۆیە بەئاشکرا تەحەدای دەسەلاتو هەیمەنەی ئۆجەلانیان دەکرد. سینەر پێش ئەوەی پێوەندی بکات بەپەکەکەوە لە حەفتاکاندا دەیخوێند بۆ ئەوەی ببێتە مامۆستان ئەو کەسێکی ژیرو زیرەك بوو، بەوریاییەوەو بە بیروڕاو و سەرنجەکانی ئۆجەلان دەکرد. سینەر هەوڵی دەدا بەم رێگە کاربکاتە سەر نوێنەران، ئەوانەی کە پێشبینیان نەدەکرد رۆژێك لە رۆژان کەسێك هەبێت هێزی ئۆجەلان لەبەین بەرێت، ئەوان وابیریان دەکردەوەو بەوەیش قایلدەکران کە تەواوی پرۆپۆزەڵو پێشنیارەکان هەر لەلایەن خودی ئۆجەلانەوە دەبن.

ئازمان کە فەرماندەیەکی پێشووی پەکەکە بوو، ئەو هەر لەسەرەتاوە گرفتی هەبوو لەگەڵ رامیاریو نەزمی ئۆجەلاندا لەم بارەیەوە دەیپرسی:"چۆن دەبێت رازی بین بەو کارانە، بڕیارەکانی سینەر دروست ئەو شتەیە کەخەڵکی دەیڵێت، هێشتا فرەکەم وتراوە. لەبەر دژواریو سەختی پێوەندیی لەگەڵ ئۆجەلاندا لەسوریاو هاوکات لەبەر ئەوەی تا ئەوکات خەڵکی بەباشی ئاشنا بە رێبازی ئۆجەلان نەبوون بۆیە بارودۆخەکە وامابوو".

هەروەها ئازمان روونکردنەوەی زیاتری داو وتی:" لەنێو پەکەکەدا خەڵکی وا راهاتبوون کە تەنها بەڵێ بکەن، ئەوان دەیانبینی خەڵکی دەستی بەرز دەکاتەوە، ئیتر بەبێ هیچ دوودڵییەك ئەمانیش دەستیان بەرز دەکردەوە. تا ئەوکات هیچ کەس نەیبیستبوو خەریکە لەدەوروبەر چی دەوترێت". لەهەمانکاتدا ئاڵۆزییەکان لە نێوچەکەدا تاویان سەندبوو. سەدام ملی نەدا بۆ خواستی هاوپەیمانانو دەستبەرداری کووەیت نەبوون هێزەکانی هاوپەیمانان بە رێبەرایەتی ئەمەریکا لە جێدابوونو ئامادەی هێرش بوون بۆ سەر ئێراق. پێشبینی کرابوو لە سەریساڵدا جەنگ دەستپێبکات.

کۆنگرەی پەکەکە کە وادانرابوو سێ هەفتە بخایەنێت، ئیتر پێویستبوو بەخێرایی ئەنجامگیریی بکات تا هێزە سەربازییەکان بکشێنەوە بۆ مۆڵگە ئارامو ئامادەکانیان. لەپاش کۆنگرە سینەر هەر لە هەفتانین مایەوەو باران بەرەو هەکاری کشاو وسمان ئۆجەلانیش بەرەو دیمەشق کەوتە رێ تا چاوی بە رێبەری پەکەکە کەوێت.

دەرۆژ پاش کۆتایهاتنی کۆنگرە فەرمانێك دەرکرا بۆ لیچپێچینەوە لەکارو چالاکییەکانی سینەر. ئیتر لەهەفتانین سینەر دەستبەسەرکراو هەر لەوێیش لێپێچینەوەی لەگەڵدا کرا. ئۆجەلانیش ئەوەی خستە روو کە سینەر رەنگە بەکرێگیراوبێتو نێردرا بێت تا پشێویو ئاژاوە بخاتە نێوچەکەوەو پارتەکە دوچاری ئاڵۆزی بکات.

دەستگیرکردنی سینەر دروست لەکاتێکدا بوو کە هێرشەکانی هاوپەیمانان بۆ سەر ئێراق دەستیانپێکرد. ئێراق توانی سەربەخۆیی خۆی بپارێزێتن تەنها ناچارکرا هێزەکانی لە کووەیت پاشەکشە پێبکات. لەئاکامی ئەو رووداوەدا کوردەکانی ئێراقو شیعەکانی باشوور دەستیان دایە سەرهەڵدانو یاخی بوون رووداوەکان لە مانگی ئازاردا بوون.

ئەوان قایلکرابوون کە ئەمەریکا پشتیوانییان دەکات، وەلێ وەختێك بینیان هیچ کۆمەکێك لەلایەن هێزی هاوپەیمانانەوە دیارنییە، ئیدی رژێم دەستی کرد بەسەرکوتی راپەرینەکان‌و دامرکانەوەیان. ئیدی دەنگۆی دەستگیرکردنەکەی سینەر لەم بگرەو بەردەو هەرایەدا کرایە ژێر لێوانەوە. لە بەهاری ئەوساڵەیشدا باران لە بەرپرسێکی تری پەکەکەی بیست (خەلیل ئاتاج ) کە ئۆجەلان دەیهەوێت باران لەبارەی رەخنەگرتن لەخۆی‌و ئەو هەڵانەی لەکۆنگرەدا پێوەی گلاوە شتێکی بۆ بنوسێت.

باران لەپاش نیوەڕۆیەکی ستۆکۆڵمدا لەم بارەیەوە پێی وتم:" وەڵامی ئۆجەلانم بەوە دایەوە کە من ئەوەی هەمبووەو ئەوەی نەمبووە لە کۆنگرەدا وتوومەو ئیتر شتێکم پێنییە تا پێی بڵێم". هەروەها وتی:"تێمابووم نەمدەزانی چی روویداوە، هەربۆیە هەکاریم جێهێشت‌و روومکردە هەفتانین، لەوێ زانیم سینەر دەستبەسەرە، وەلێ نەمتوانی چاوم پێی بکەوێت، ئاخر ئەو جیا کرابوویەوە". عەبدورەحمان قایقچی سەرۆکی نوێی یەکەی ئەمنیی تایبەت، کە ئۆجەلان پاش کۆنگرە پێکیهانی بوون وتی بەباران ئۆجەلان پلانی دانابوو تا بەئاشکراو بەڕۆی رۆشن سینەر ئیدانەبکات‌و پاشان بیکوژێت، دەکرێت لەدووای ویش نۆبەی باران بێت. هەر بۆیە باران‌و سینەر بڕیاندابوو هەڵبێن.

قایقچیش بەئاشکرا بیرکردنەوەی دووەمی هەبوو دەربارەی پلانەکانی ئۆجەلان، هەربۆیە ئەویش پێوەندی کرد بەوانەوە. بەمجۆرە سێ پیاو لەچیاکانی باکوری ئێراقدا گروپێکی نوێیان بەنێوی بوژانەوە وە راگەیاند، ئەوان داوایانکرد هەرچی زووترە گەریلا ریزەکانی پەکەکە جێبهێڵن‌و پێوەندیان لەگەڵ ئۆجەلان بپچڕێنن‌و بێنە ریزی بوژانەوەی پەکەکەوە، ئەوان پەکەکەی راستەقینەن.

بەم کارە بۆ یەکەمجار ئۆجەلان رووبەڕووی هەرەشەیەکی جدی‌و واقعی بوویەوە. لەرابردوودا ئەوانەی لەپەکەکە هەڵدەهاتن، فەرامۆشدەکران‌و بەناپاك لەقەڵەم

دەدران. وەلێ جیابوونەوەی سینەرو باران، هەروا ئاسان نەبوو، ئەوان ئەندامی ئەنجومەنی جێبەجێکردنی کۆمیتەی ناوەندی بوون‌و لێپرسراوی باڵای کۆنگرەی چوارەم بوون.

هاوکات پێچەوانەی ناکۆکی‌و دابەشبوونەکانی دی ئەوان لە کوردستاندا بوون‌و لە ئەورووپا نەبوون. ئیتر کەس نەیدەتوانی ئەوان بەوە تاوانبارکات کە لە خەباتی چەکداری هەڵهاتوون. هەروەکو بۆ خۆشیان ئاشکرایان کردبوون ئەوان نایانەوێ رەخنە لەپەکەکەو خەباتە چەکدارییەکەی بگرن، بەڵکو ئەوان تەنها روویدەمیان لە رێبەری پەکەکە عەبدوللا ئۆجەلانە. باران دەیووت:" بیرکردنەوەمان بەو ئاراستەیە نەبوو لەپەکەکە داماڵرێین، بەڵکو دەمانەویست خەڵکی رابهێنین‌و رازییان بکەین بەوەی کە بیرکردنەوەمان لەپێناو گۆرینی رێکخستنەکەیە لەبەردەم مەترسی تاک جەمسەری".

ئەوان تۆرێکی بەرینی پەیوەندییان هەبوو، باران ئاشناگەلێکی فرەی هەبوو، سینەریش پێوەندیکردبوو بەو زیندانیانەی کە تازە بەتازە ئازادکرابوون‌و بەدووی مەئوایەکەوەبوون‌و ئاتاجیان بە کۆمەك بوو. لەیەکەم بەیاننامەیاندا پێداگرییان کردەوە لەسەر پێویستی خۆ رێکخستنەوەی پەکەکەو دوواتر رەخنەی توندیان لەسەر بڕیارگەلێکی دیاریکراو گرت کە لەلایەن ئۆجەلانەوە درابوون. وەلێ ئەم یاخیبووانە رووبەرشووی جەنگێکی دژوار بوونەوە لە دژی ئۆجەلان.

لەم نێوەندەدا، رێبەری پەکەکە رێبەرایەتی نێزیکەی ٢٠٠٠ جەنگاوەری دەکرد کە دارای تۆرێکی بەرفراوان بوون لە چالاکوان‌و پشتیوان لە ئەورووپاو پشتیوانی‌و هاوکارییان لەچەند دەوڵەتێکی هەرێمییەوە بەدەست دەگەیشت. هەربۆیە هەوڵەکانی گروپە جیابووەکە بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی لەناو زیندانییەکاندا، ئەوانەی تازە بەتازە ئازاد بوون، هەر زوو شکستیان هێنا، چونکە بەردەوام خەڵکانێکی دوور لەماجەراکان کاریگەربوون بە رێبازی ئۆجەلان‌و ئاپۆچیبوون.

هەرچەند بەتوانیانپشتیوانی لەچەند شارێکی نێو تورکیاو باکووری ئێراق بەدەست بهێنن، وەلێ ژمارەیان فرە کەم بوو. حسێن تۆپگیدەر ، کە ئەو دەم لە کۆنگرەدا بوو دەیگوت:" سینەر لە بیرکردنەوەکەیدا لەسەر هەق بوو، وەلێ خەڵکی رێگەکەی ئەویان نەدەبینی". هەروەها دەیوت:"راست بێت یان هەڵە، خەڵکی سەیری ئەوەیان دەکرد کە دارای هێز ەو جەنگو نەبەردیی لێدەوەشێتەوە، هەر بەم شێوازە خەڵکی شیکردنەوەیان هەبوو بۆ شتەکان. ئۆجەلان نەزمێکی راهێنابوو، کە ئەستەم بوو جیا لەو گروپێکی تر بتوانرێت دابمەزرێت. سینەر دڵسۆز بوو، وەلێ تێنەدەگەیشت".

حسێن تۆپ تیگەر نەیدەویست لە پەکەکە جیابێتەوە، ئەو دەیوت:" دەکرا شتەکان بگۆرێن، شتانێك هەن لە ئۆجەلان گرنگترن، ناکرێت خەباتی کورد بکرێتە قوربانی ئەوەی ئۆجەلان چی دەکاتو چی ناکات، هەر بۆیە لەنێو پەکەکەدا مابوومەوە".سینەرو بارانو قایقچی لەشاخەکانی باکووری ئێراق بۆماوەی چەند مانگێکی کەم مانەوە لەپایزی ١٩٩١دا سینەرو قایقچی بەشێوەیەکی نهێنی دەربازی نێو خاکی سوریا بوون. لەوێ لە قامیشلۆ، شاری سەرەکی کوردنشین خۆیان حەشاردا. لەراستیدا پەکەکە لە قامیشلۆدا فرە بەتۆکمەیی رێکخرابوون هەر بۆیە ئەوان خەریکبوون کارێکی مەترسیدار ئەنجامدەدەن. رۆیشتنی ئەوان بۆ قامیشلۆ فرە نارۆشنو نالۆژیکی بوو.

یەکێك لە دۆستەکانی خانەوادەی سینەر دەیووت، بۆیە چووبوونە قامیشلۆ تا بتوانن پاسپۆرت بەدەستبهێننو لەوێوە دەربازی ئەوروپا بن. ئەندامێکی دیکەی پێشووی پەکەکە پێی وابوو کە ئەوان بۆیە چوونە ئەوێ تا بتوانن چاویان بەبەرپرسانی سوریا بکەوێتو بەجۆرێك لەجۆرەکان پشتیوانیی ئەوێ دەستەبەر بکەن.

کەسێکی تر سوربوو لەسەر ئەوەی کە ئەوان بۆیە چوونەتە ئەوێ تا پشتیوانی لە کوردانی سوریە بخوازن. جیا لەوانەیش دیارە کە شتەکان بێ پلان نەبوون. قایقچی لەوێ زەنگیدا بۆ شوێنی مانەوەی ئۆجەلان‌و لێی پاڕایەوە تا لێخۆشبێت. هاوکات ئەوەی خستە ڕوو کە لەپێناو ئەوەی ڕێگەی پێبدرێت جارێکی تر بژی، بەڵێن دەدا ئیدی توخنی سینەر نەکەوێت.

هاوکات لە یەکی مانگی یازدەی هەمان ساڵدا سینەرو خانمێك لە ئاپارتمانەکەیاندا بە کوژراوی دۆزرانەوە. باران لەم بارەیەوە ئاماژە بەوەدەکات کە کاتێك سینەر کوژراوە ئەو لە شاری دهۆکدا بووە. باران دەیووت:" هەمان ڕۆژ هەواڵەکەم بیستن کەسێك نێردرا تا بەمن بڵێتن هێشتا سینەر نەمردبوون ئەو بەبرینداری برابوو بۆ خەستەخانە. کاتێکیش بیستم سینەر مردووەن وا بیرمنەدەکردەوە ئیتر هەموو شتێك تەواو". لەم کاتەدا باران‌و نێزیکەی پەنجا لەشوێنکەوتوانی لەتورکیاو سوریا گردبوونەوە تا گفتوگۆ لەبارەی ئەگەرە نوێیەکان بکەن. دوواجار ئەوان پابەندبوون بەوەی درێژە بەخەبات‌و کارەکانیان بدەن. باران دەیگوت:" ئێمە هەوڵماندا، وەلێ چەندین گرفتمان هەبوو".

گرفتەکان تەنها خۆیان لە نەیاریەتی دەوڵەتی تورك نەدەبینییەوە کە دژی چێبوونی هەر گروپێکی کوردی بوو، وەلێ خودی پەکەکە گرفتی بەردەم گروپەکەی باران بوو. هاوکات زۆرێك لەوانەی کە لەهەوڵی ئەوەدابوون لە ڕیزەکانیاندا خۆیان ڕێکبخەن کوژران‌و لەنێوبران. ئیتر باران پێش ئەوەی واز لە هەوڵە بەرهەڵستکارییەکانی بهێنێت‌و بەرەو ئەوروپا ملبنێت، بۆ چەند ساڵێك پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێراق لەلای خۆی هێشتیەوەو داڵدەیان دا.

لەراستیدا جودا بوونەوەی باران‌و سینەر جددیترین هەڕەشە بوو کە تا ئەوکات ڕووبەڕووی ڕێبەرایەتییەکەی ئۆجەلان بێتەوە، هەروەها لەپاش ئەو جودابوونەوە هیچ ڕەوشێکی هێند مەترسیدار ڕووبەڕووی ئۆجەلان نەبووەتەوە.

پاش کوشتنی سینەر، ئیدی هێزو دەسەلاتی ئۆجەلان بەتەواوی لەمپەری لەبەردەمدا نەما. ئیدی لە شوناسی ئۆجەلاندا ئەو رووداوە بوویەبەشێك لەو رووداوانەی کە لەمێژووی پەکەکەدا وەك پلانێگێڕییەکی مەزن تەماشا دەکرێت. هاوکات پاش کوشتنی سینەر ئۆجەلان ئیدی ئەوەی دووپاتکردەوە کە هیچ یاخیبوونو ئاژاوەیەك لێبووردنی بۆنییە، هاوکات بوارێکیش بوو تا ئۆجەلان ئەو هێزانەی تا ئەوکات لەبەردەم ئۆجەلاندا چۆك دانادەن بەتەواوی وابەستەیان بکاتەوە بە پەکەکەوەو هەمووان بهێنێتە ژێر رکێفی دەسەلاتی خۆیەوە.

لە راستیدا هەرچەند تەنها چەند کەسێکی کەم باوەرشی وابوو کە سینەر بەکرێگیراوە، وەلێ هیچ کەسێك نەیدەوێرا راستیو دروستی سینەر بلێتو بەرگری لەبۆچوونەکەی بکات. باران دەیوت کاتێك سینەر دەستگیرکرا لەلایەن جەمیل بایك، وەك هەموو ئەوانی تر پێم راگەیاند کە بڕواناکەین سینەر ناپاك بێت، جەمیل لەوەلامدا گووتی، ئەوە فەرمانی سەرۆکەو ئەم مشتومڕە هەر لەوێ بڕاوەتەوە، لەبەر ئەوە کەسێك بیرینەدەکردەوە کە سینەر بەکرێگیراو بێت، بەلام هەمووان کۆیلەی ئۆجەلان بوون".

ئۆجەلان هیچ رکابەری نەماو زاڵ بوو بەسەر هەمووانداو تەحەداکانی بێدەنگ کرد، ئیدی خۆی بۆ هەنگاوی ئایندە ئامادەکرد، کە بەهەرچۆنێك بووە تورکیا ناچاربکات بێتە نێو دانوستانی سیاسییەوە. ئۆجەلان نەخشەی بۆ ئەوە دارشت، ئەو لەرێگەی فراوانکردنی دەسەلاتی پەکەکەو خزانی بۆ نێو تۆڕو کۆمەڵە یاساییەکان هاتە ناو، هاوکات بڕیاریاندا هەر پرۆتستۆیەکی مەدەنیو جەماوەریی بقۆزنەوەو دەسەلاتیان شۆڕکەنەوە بۆنێو نارەزاییە جەماوەرییەکان . هەروەها بڕیاریاندا جەنگی چەکداریی بەجارێك لە هەرێمەکەدا درێژە پێبدەن، بەجۆرێك ئیتر تورکیا نەتوانێت بانگەشەی ئەوە بکات کە دارای دەسەلاتی تەواوە لە هەرێمەکەدا.

Aliza Marcus

# PKK History

Thr PKKand the Kurdish
fight for independence

translated by majid khalil



لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

نرخ ( 6000) دینار